چەندوانەیەک دەربارەی

# ئیسلام و موسڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی

نوزاد

لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا

علی باپیر




بڵاوکردنەوەی [illegible]



چەندوانەیەک دەربارەی

# ئیسلام و
# مسوڵمانەتی و
# کاری ئیسلامی

لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

چەندوانەیەک دەربارەی

# ئیسلام و موسوڵمانێتی و کاری ئیسلامی

لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا

علی باپیر




بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن.

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | چەند وانەیەک دەربارەی ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی |
| نوسەر: | عەلی باپیر |
| بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر |
| خەت: | نەوزاد کۆیی |
| بەرگ : | أمین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چاپ: | یەکەم ١٤٢٧ك - ٢٠٠٦ز |
| تیراژ: | ٣٠٠٠ دانە |

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (.......) ی ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا
كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٦١) قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ
الْعَالَمِينَ (١٦٢) لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ (١٦٣)﴾
(الأنعام )

# پێشكەش بێ

**بەو كەسانەی :**

- **باش لە ئیسلام تێ گەیشتوون و مسوڵمانەتی یەكی چاك دەكەن .**
- **یان دەیانەوێ چاك لە ئیسلام تێ بگەن بۆ ئەوەی مسـوڵمانەتییەكی باش بكەن.**

# پێشەكی

الحمد لله رب العالمين ، و صلى الله تعالى و سلم وبارك على خاتم الأنبياء و سيد المرسلين محمد وآله أجمعين من الصحب و الأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين .

خوێنەری سەنگین و شیرین !

ئەم كتێبەی بەردەستت (چەند وانەیەك دەربارەی: ئیسلام و مسوڵمانەتی و كاری ئیسلامیی) لە شەش دەرس و دوو وتاری جومعەو وتارێكی نووسراوو وتارێكی تایبەت كە لە كۆڕێك دا پێشكەشی ژمارەیەك لە ئەندام و كادیرانی ڕێكخستن كراوە، پێكهاتوە، شەش دەرسەكان لە خولێكدا لە هەولێر پێشكەش كراون لە ژێر ناوونیشانی: ﴿ ئیسلام ومسوڵمانەتیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا[1] ﴾ دوایی (محمد)ی كوڕم لە كاسێتەوە هێناونیە سەر كاغەز و خۆیشم پێیاندا چومەتەوە ، دوو وتارەكەش كاتی خۆی لە مزگەتی (جیهاد)لە سلێمانی دراون لەژێر ناوونیشانی: (كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان)داو گەنجێكی هەولێری ـ كە حەزی نەكرد ناوی بهێنرێ[2] ـ لە كاسێتەوە

(١) شەش دەرسەكان لە كۆتایی ساڵی (٢٠٠٥) و، دوو وتارەكەش هی ساڵی (٢٠٠١)ن وەك لە یادمە.

(٢) دوایش كاك (ملا بلال قەڵادزەیی) سەرلەنوێ و بەخەتێكی خۆش و داڕشتنێكی باش نووسینیەوە.

هێناونیە سەر كاغەز، خودا پاداشتیان بداتەوە و سەلامەت و سەرفرازیان بكات، وتارە نووسراوەكەش تازە نووسیومەو ئامادەم كردوە و وتارە تایبەتی یەكەش لە شوێنی خۆی باسی دەكەین چی یە و چۆنە؟! بۆیەش بە پێویستم زانی ئەو دەرس و وتارانە لە كتێبێكدا كۆبكەینەوە، چونكە لەم قۆناغە هەستیارەی مێژووی گەلەكەمان دا لەلایەن خەلكێكی زۆرەوە بێ ئاگاییەكی زۆر لە بارەی چەمك و واتاو نێوەڕۆكی ئیسلام و مسوڵمانەتی یەوە هەیەو، هەندێك لەو خەلكەش لە ئاستی بالای بڕیاری سیاسی و ئاڕاستەكردنی فیكریی خەلكی كوردستانیش دان و دیارە كەسانی واش كەم و زۆر خەڵك و جەماوەر دەكەوێتە ژێر كاریگەری قسەو باس و بۆچوونەكانیانەوە چ ڕاست بن چ هەڵە !

جا وەك جێبەجێكردنی بەشێك لە ئەركی سەر شان بەرامبەر بە خەڵك و جەماوەری كوردستانمان و بۆ ئەوەی لەبەر ڕۆشنایی كتێبی خوا (جلّ وعلا) و سوننەتی پێغەمبەری پێشەوامان دا ﷺ لە پێناسەی ئیسلام و مسوڵمان و ئیسلامەتیی و مسوڵمانێتی شارەزابن و لە چەواشە بوون و سەر گەردانی پارێزراوبن و بەر چاو ڕوون و دڵنیاش بن لەوە كە هەموو ئەو كەسانەی بێ ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەرك و زەحمەتی لێكۆڵینەوەو توێژینەوەیان لە بارەی قورئان و سوننەتەوە كێشابێ، ئەو قسەو باسانەی كە لە بارەی ئیسلام و مسوڵمانەتی یەوە دەیانكەن، جا چ مەبەستیان مەدح بێ چ زەم، ناگونجێ ئعتیباریان بۆ دابنرێ ، چونكە كەسێك لە شتێك شارەزا نەبێ و پێ ی ئاشنا نەبێ هەرشتێكی لە بارەوە بڵێ بە قسەی نێو هەگبەو گیرفانی خۆی دادەنرێ و ڕەفتارەكەیش تفەنگ بە تاریكیەوە نان نەبێ چی دیكە نی یە.

پێشم وایە ئەو جۆرە كەسانەی كە بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە پسپۆڕیی (تخصّص)ێكیان لە قورئان وسوننەت دا هەبێ، بێ پەروا قسە لە بارەی ئیسلامەتیی و مسوڵمانەتیی یەوە دەكەن لە دوو حاڵان بە دەر نین :

یان دووچاری نەزانینی تاوێتە (الجهل المركّب)بوونە لە بەرانبەر ئیسلام دا ، واتە ئیسلام ناناسن و ناشزانن كە نایناسن!

یان تەنها نەزانینی سادە (الجهل البسیط)یان لە بارەی ئیسلامەوە هەیە ، واتە خۆیان دڵنیان كە لە ئیسلام شارەزانین، بەڵام ئەوەی وای لێكردوون كە ئاوا بێباكانە باس لە ئیسلام بكەن و بكەونە پێناسە كردنی دینداریی و مسوڵمانەتیی وبە پێخواسی وە نێو بكەون ئەوەیە كە دەزانن ـ یان وا دەزانن ـ كە خەڵك و جەماوەر سادەو نەشارەزایە و ناتوانن ڕاست و چەوت و ڕەش و سپی لە یەك جیا بكەنەوە ! ئینجا بەڕاستیش شتێكی سەیرە كە ئێستا لەم ڕۆژگارەدا لە ئەنجامی بەرەوپێشچوونی زانیاری و گەشە كردنی زانست و قووڵبوونەوەو لق وپۆپ لێبوونەوەی دا. خەڵكی زۆر ڕێز بۆ پسپۆڕیی پسپۆڕان(مَتخصصین)دادەنێت و لە بواری شارەزایی خۆیان پرسیان پێ دەكەن و بە قسەشیان دەكەن، بۆ نموونە ، كاتێك دەچنەلای پزیشك (طبیب) بە تایبەت ئەگەر پسپۆڕ بێت لەو بوارەدا كە ئەوان كاریان تێی كەوتوە ـــ زۆرباش گوێی بۆ دەگرن و بە پێی ڕەچەتەكەی ویش دەرمانان وەردەگرن و بە گوێرەی ڕێنمایی یەكانیشی بەكاریان دێنن و. زۆریشیان سەر لە كەسێك سووڕدەمێنێ كە قسە لە قسەی پزیشكەكەی دا دەكات و دم بەدمەو شەڕەقسەی لەگەڵدا دەكات !

كەچی لە مەسەلەی ئیسلامناسی و شارەزایی لە بارەی ئیسلامەوە. زۆر جاران ئەو بنچینە(قاعدة)یە هەڵدەوەشێننەوە، كە لە ڕاستیی دا وێڕای عەقڵ و

ئەزموون وەحی خوای زاناش (تبارك وتعالى) فەرمانی پێکـــــردوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ ﴾ (النمل-٤٣)، واتە: جا ئەگەر نازانن لە شارەزایان بپرسن.

بەڵێ لە بواری ئیسلامەتی و مسوڵمانەتی دا زۆر جار هەرچی ڕاست بۆوە خۆی بە شارەزاو پسپۆڕو دەم ڕاست دەزانێ و بێ ئـەوەی دیراسـەی قورئـان و سوننەتی کردبێ و تەمەنێکی لەو مەیدانە دا بەڕێ کردبێ بە کەیفی خـۆی پێناسەی ئیسلام ومسوڵمانەتیی دەکات و فەتوای زل زل لەو بارەوە دەردەکات!

جادیارە من لێرەدا نامەوێ هیچ کەس بەهەڵە وا لەم قسانەم حاڵی بێت کە ئەوە من دەمەوێ باس کردنی ئیسلام لە غەیری مەلاو شێخان یـان غـەیری ئیسلامی یان قەدەغە بکەم! نـەخێر چـونکە لەئیسـلامدا بـە پێچـەوانەی نەصرانییەت و جووایەتی یـەوە تێگەیشـتنی کتێـب وئـایینی خـوا و قسـە لێکردنیان لە سەر هیچ چـین و تاقمێـك تـاپۆ نـەکراوە، وەك لـە کتێبـی: (زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟!) دا ڕوونمان کردۆتەوە. بەڵکو لە ئیسلام دا سەرجەم مسوڵمانان بە نێرو مێ و وردو درشـتەوە لـە تێگەیشـتن و بـەڕێوە بردنـی ئـایینی خـوا (جـلّ وعـلا) بـەر پرسـیارن چـونکە هـەموو دوانـدن (خطاب)ەکانی قورئان کە ڕوو لە مسوڵمانان دەکەن بە دەسـتەواژەی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! دەست پێدەکەن کە بێگومان هەموو ئەهلی ئیمان بە وردو درشت و نێر و مێ وە دەگرێتەوە بە بێ جیاوازی!

بەڵام ئەوە کە مسوڵمانان هەموویان لە بەرانبەر ئایین و بەرنامەی خـوادا بەر پرسیارن نابێ ئەوەی لێ بفامرێتەوە کە هەر کەسێك لە مسوڵمانان ـ یان لە خۆ بە مسوڵمان زانان ـ ڕاست بۆوە بۆی هەیە بـە کـەیفی خـۆی باسـی ئیسلام و مسوڵمانەتیی بکات بێ ئەوەی هیچ پسپۆڕی و شارەزایی یەکی لە

بارەی قورئان و سوننەتەوە هەبێ کە دوو سەر چاوەی ڕوون و بێ چەندو چوونی ئیسلامن و لە ڕاستی دا ئیسلام جگە لەوان هیچی دیکە نیە !

هیواداریشم میللەتە مسوڵمانەکەمان ڕۆژ بۆ ڕۆژێ زیاتر و چاکتر لە قورئان و سوننەت شارەزابێ وبە شەریعەتی خوا ئاشنابێ، هەتا وای لێ دێ نە هیچ نەزانێکی بە نەزانیی خۆ زان و خەڵك بە سادەو گێل زان و، نەهیچ خۆ بەزانا زانێکی لەڕاستیدا نەزان، جورئەتی ئەوە ناکات کە باسی ئیسلامی بۆ بکات و مسوڵمانەتیی بۆ پێناسە بکات وە هەر کاتێك واشیان کرد لە جیاتی گوێ بۆ شلکردن و سەر بۆ لە قاندن قسە کانیان تورِ بدات!

شایانی باسیشە کە بەندە لەسۆنگەی ئەوەوە زۆر خەم بەوەوە هەڵدەگرم کە خەڵك بە هەڵەو کرچ و کاڵیی ـ یان هەندێك جار بە بە راوەژووەوەش ـ لە ئیسلام و مسوڵمانەتی تێبگات . چونکە :

بێگومان ناگونجێ لە سەر بناغەی بە هەڵە تێگەیشتن لە ئیسلام جگە لە دیواری مسوڵمانەتیی کرچ و کاڵ و هەڵە و ناتەواو هیچ دیوارێکی دیکە هەڵبچنرێ و لە مێژیشە پێشینان گوتوویانە : (گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ) !

بۆ نموونە: کاتێك مسوڵمانێك یان کۆمەڵە مسوڵمانێك یان میللەتێکی مسوڵمان، وای لێ حاڵی دەبێ کە ئیسلام بێجگە لە جۆبەجێ کردنی ئەرکە شەخسی یەکان و بە جێهێنانی پێنج دروشمەکان هیچی دیکە نی یە !

یان وادەزانێ کە ئیسلام تەنها تەزکیەی نەفس و پارێزکاریی (تقوی)ی ئاکییە!

یان واحاڵی دەبێ و وا حاڵی دەکرێ کە ئیسلام جگە لە کۆمەڵە ڕەوشت و خووێکی شەخسی بەرزو جوان چی دی نیە!

یان.. یان.. هتد، ئەوە بێگومان تەنها لە بەرانبەر ئەو شتە یان ئەو شتانەدا كە ئەو بە هەموو ئیسلامیان لێ حاڵی بووە و پێی وا بووە ئیسلامەتیی و مسوڵمانەتیی یان تێدا كورت هەڵاتوە خۆی بە بەرپرسیار دەزانێ و نەك هەر لەسەر خۆی بە پێویست نازانێ كە بەلای ئەرك و كارەكانی دیكەی ئیسلام دا بچێ ، بگرە هەر كەسێكیش ببینێ مشووری ئەو شتانەی دیكەی ئیسلامەتیی دەخوات وا دەزانێ ئەو بابایە شتێكی زیادەی لە(ئیسلام و مسوڵمانەتیی)ی پەیدا كردوە و ڕەنگە زۆریشی پێناخۆش بێ و ڕخنەشی لێ بگرێ[1] !

خواش بە بەزەیی خۆی سەرەنجامی ئەم ژیانە پێنج و دووڕۆژە دنیایی یەمان خێر بكات.

سبحانك اللهم و بحمدك أشهد أن لا اله إلاّ أنت أستغفرك وأتوبُ اليك

٢٤ صفر ١٤٢٧    ٢٠٠٦/٠٣/٢٤ هەولێر

---

(١) وەك هەڵوێستی هەندێك مسوڵمانی ناحاڵی بەرانبەر بە لایەنە ئیسلامییەكان و تەوژمی ئیسلامی كە دەیەوێ ئاڵای دینی خوا بەرز بكاتەوە و شەریعەتی خوا بگێڕێتەوە نێو واقیعی هەمە لایەنەی ژیانی كۆمەڵگا !.

## پێناسـەیەكی كورتی ئەم زنجیـرە وانەیە :

خوێنەری سەنگین!

ئەم زنجیرە وانەیەی كەئـەم كتێبـەیان لـێ پێكهـاتوە نـۆ وانـەن و ئەمـەش ناونیشانەكانیانە:

وانەی یەكەم : ئیسلام چی یە ؟!

وانەی دووەم : مسولّمان كێ یە ؟!

وانەی سـێ یەم : كۆمەڵگای ئیسلامیی چۆنە ؟!

وانەی چوارەم: حوكمی كارو چالاكی ئیسلامیی .

وانەی پێنچەم : كۆمەڵ بوونی مسولّمانان : یانی چـی و بۆچـی پێویسـتەو بەرهەمی چی یە و دەبێ چۆن بێ؟!

وانەی شەشەم : ئیسلام بێ كیان و دەوڵەت بەرێوەناچێ.

وانەی حەوتەم : چۆنیەتی سەرهەڵدان و بنیات نـانی كۆمـەڵگا و دەوڵـەتی ئیسلامی .

وانەی هەشتەم : كۆمەڵبوونی مسولّمانان پێویستەو پرژو بلاّویی و بێ سەرەو بەرەیی یان بیدعەتە.

وانەی نۆیەم: گرنگیی و پێویستی ڕێكخستن بۆ كاری ئیسلامیی.

دیارە لە وانەی یەكەم دا هەوڵمانداوە بە كورتی پێناسەی ئیسلام بكەین لە سێ خاڵی بنەرەتی دا:

١ـ ئیسلام تاكە ئاین و بەرنامەی پەسەند كراوی خوایە

٢ـ ئیسلام جیهانبینی و تێڕوانینی ڕاست و تەواوە.
٣ـ ئیسلام شەریعەتێكی گشتگیری ژیان و گوزەرانی تاك و كۆمەڵە.
لەوانەی دووەمیش دا لە نۆ (٩)خاڵان دا پێناسەی مرۆڤی مسـوڵمانمان كردوە.

ئینجا لەوانـەی سـێیەم دا لـە دوازدە (١٢) خـاڵان دا نیشـانەو سـیما بنەرەتیەكانی كۆمەڵ و كۆمەڵگای ئیسلامیی خراونە ڕوو.

لە وانەی چوارەمیش دا باسی هەڵوێستی شەرع كـراوە لـە بـارەی كـارو چالاكی ئیسلامییەوە واتە لە بارەی هەوڵدان و تێكۆشـان بـۆ بووژاندنـەوەی مسوڵمانان و هێنانەوەی حوكم و بەرنامەی خوا(جلّ وعلا) بۆ نێو مـەیـدانی ژیان و گوزەرانیان .

هەروەها لە وانەی پێنجەمیش ـ كەلە ئەسڵدا دوو وتاری جومعـە بـووەو لێكدراون ـ دیسان باسی حوكم و چۆنیەتی و بەڵگـە و پاسـاو و بەرهـەمی كاروچالاكی ئیسلامیی مان كردوە كە بێگومان بەبێ كۆمـەڵبوون نـاگونجێ ئەنجام بدرێ.

وە لەوانەی شەشەمیش دا حەوت بەڵگەمان هێناونەوە بۆئیسپاتی ئەوە كە نـاكرێ و نـاگونجێ ئیسـلام وەك بەرنامـەی ژیـان وگـوزەران بـەڕێوەببرێ و بەوشێوەیەی كەخواو پێغەمبەر ﷺ فەرمانیان پێكردوە پیادە بكـرێ بـەبێ هەبوونی قەوارەو دەستەلاتی سیاسی.

وە لە وانەی حەوتەم دا لە چەند هەنگاوێك دا باسی چۆنیەتی سەرهەڵدان و بنیـاتنانی دەوڵەت و كۆمەڵگای ئیسلامی مـان كردوە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ.

لە وانـەی هەشـتەمیش دا ڕوونمان كردۆتـەوە كە كۆمەڵبوونی مسـوڵمانان شتێكی شەرعی و پێویستەو پرژوبڵاویی و بێ سـەرو سـێبەریی یان شتێكی قەدەغەو ناشەرعیی وبیدعەتە.

لە وانەی نۆیەم و كۆتاییش دا باسی گرنگیی و پێویستی ڕێكخسـتن بـۆ كاری ئیسلامی دەكەین.

هەڵبەتە نابێ هیچ كەسیش چاوەڕوانی لەم وانانـە ئـەوەبێ كـە هەرچـی پێویسـتە لـە بـارەی ئیسـلام و مسـڵمانان و مسـوڵمانەتیی و كۆمـەڵگای ئیسلامیی و.. هتد ەوە تێیان دا هەبێ! بەڵكو تەنها هەوڵـدراوە كـە ئـەوەی گـرنگ و پێویسـتە لـەم قۆناغـەدا مسـوڵمانان بیـزانن و بەبنـەرەتی و جەوهەرییش دادەنرێ بخرێتە ڕوو.

شایانی باسیشە كە ئێمە لە زنجیرە وانەی : (ئیمان و عقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا )بـە وردی و ڕوونـی پێناسـەی ئینسـانی مسوڵمان و ئیماندارمان كردوەو دەتوانم بڵێم: بۆ پێناسـە كردنـی ئیسـلام و ئیمان و مسوڵمان لەو زنجیرە وانەیەدا قسەی كۆتایی خۆمم كردوە[1].

هیواداریشم ئەم زنجیرە وانەیە مایەی زیاتر بەر چاو ڕوون كردنەوەی میللەتە مسوڵمانەكەمان بێت بە تایبەت چینی گەنج و تازە پێگەیشتوومان. كە لـە خوا بە زیاد بێت ڕۆژ بەڕۆژێ گەرموگوڕتر بەرەو باوەشـی پـڕ سـۆزی دیـن و شەریعەتی خوای بە بەزەیی و دادگەر هەنگاو دەنێ و لەسەر چاكتر تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت سوورتر دەبێ.

---

(١) بەرگی یەكەمی ئەو زنجیرە دەرسە ئێستا لە ژێر چاپ دایە - بەم زووانە بڵاودەكرێتەو- و بەرگی دووەمیش لە ژێر چاپە.

الحمدلله رب العالمين و الصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله وصحبه والمهتدين بِهُدى الله المبين .

بەڕێزان!

لەم دەرســەی یەكەمی ئەم زنجیرە دەرســـــەدا ئەوەی دەیكەینـــە دەستپێك بریتی‌یە لە: پێناسە كردنی ئیسلام و مسوڵمانیەتیی بەو شێوەیەی كەخوا (تبارك وتعالى)و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویانە، واتە بەو شێوەیەی كە لە قورئان وسوننەت دا هاتوە، چونكە هەر شتێك وەكو خۆی وبەڕاست و دروستی لــێی حاڵی نەبی ناتوانی هەڵوێستی پڕ بەپێستی لێ وەربگری و مامەڵەی ڕاست و دروستی لەگەڵدا بكەی .

بە كورتی و پوختی مەبەست لە (ئیســــــلام): دینی خوای پەروەردگارە، (سبحانە وتعالى) كە لە قورئان و سوننەت دا بەر جەستەیە .

وە مەبەست لە (مسوڵمانەتیی):

بەڕێوەبردنی ئیسلامە بە شێوەیەكی ڕاست ودروست، واتە بەو جۆرەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەڕێوەیان بردوە لە ژیانی تاكی وخێزانــی و كۆمەڵی یان دا .

زۆر كەس دەیەوێت پێناسەی ئیسلام بكات بە پێناسەیەك كە هەڵقوڵاوی بیرو زەینی خۆیەتی، یان هەڵقوڵاوی واقیعی ئـەو كۆمەڵگایەیـە كـە تێیـدا دەژیی، یان هەڵقوڵاوی بیرو زەینی كەسانێكە كـە نـەیارن بـە ئیســلام. جـا بێگومـان هەموو ئەو جۆرە پێناسانە ناڕەواو نادروستن، بۆچـی؟! چـونكە لـە

ڕاستی دا تەنها کەسانێك كە لە ئیسلام دا پسپۆڕو شارەزان بۆیان هەیە كـە پێناسەی ئیسلام وە مسوڵمانەتیی بکـەن، چـونكە قسـە كـردن لـە بـارەی شتێكەوە كە زانیاریت لە بارەیەوە نیە ونایناسی شـتێكی ناڕەوایـە و بگـرە تاوانێكە لێپرسینەوەی لەسەر دەكرێ!

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾ (الأسراء ـ ٣٦)

واتە: (بەدوای شتێك مەكەوە كە زانیارییت دەربارەی نیە، چـونكە بیسـتن و دیتن وعەقڵی ئینسان ئەوانە هەموویان لێ پرسینەوەیان لەسەر دەكرێ)

جا زۆر بە داخەوە كە كەسانی نەشارەزا بە ئیسلام لە هەموو شتێك دا ڕێز بۆ پسپۆڕی(تخصّص) دادەنێن،كامەیان خۆی زۆر بە شارەزا ، یان بە خاوەن پایە دەزانێ كاتێك دەچێت بۆ لای پزیشك زۆر باش گوێی بۆ دەگرێت، وە مشت و مڕ لەگەڵ پزیشكەكە دا ناكات. بۆ نموونە ئەگەر بڵێ دەردەكەت فلاًن شتە وە چارە سەرەكەی ئەوەیە ، زۆر باش گوێ ی بۆ شل دەكات. هەروەها ئەگەر بچێت بۆ لای ئەندازیارێك یان هەر كەسێكی دیكە كـە پسـپۆڕە لـە بوارێـك لـە بوارەكان دا. بەڵام لە بواری ئیسلام و مسـوڵمانەتیی دا هـەر كـەس ڕاسـت دەبێتەوە بـە هـەقی خـۆی دەزانێـت كـە قسـە بكـات دەربـارەی ئیسـلام و مسوڵمانەتیی وەپێناسە یان بكات بە پێی بیروبۆچوونی خۆی بە بێ ئەوەی كە هیچ شارەزاییەكی قووڵی دەربارەی ئیسلام هـەبێت. جـا بـە تەئكیـد ئـەوە شتێكی زۆر نازانستییانەیە و دەبـێ پێناسـەی ئیسـلام ومسـوڵمانیەتیی و دینداریی تەنها لە لایەن كەسانێكەوە بكرێ كـە شـارەزاو پسـپۆڕن لـە ئیسلام دا.

جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئیسلام بریتیە لە کتێبی خواو ڕێوشوێنی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ هەر کەسێك کە شارەزای قووڵ و فراوانی دەربارەی قورئان وسوننەت نەبێ، بۆی نیە قسە دەربارەی پێناسەی ئیسلام و مسوڵمانەتیی بکات، ئەگەر بیەوێ پێچەوانەی عەقڵ وزانست نەجووڵێتەوە .

وە ئەگەر تەماشای دەوروبەر و کۆمەڵگای خۆمان بکەین دەبینین کەلە ئەنجامی پێناسەکردنی ئیسلام بە شێوەیەکی نیوە چڵ و کرچ وکاڵ وناتەواوەوە، زۆر چین وتوێژو پێڕو دەستەی مسوڵمانان هەن تووشی هەڵەی زۆر بوونە:

بۆ نموونە هەندێك لە مسوڵمانان ئیسلام تەنها لەبواری مەعنەوییدا دەبینن و ئەو ئیسلامە پان و پۆڕ و مەزن (عظیم)ە لە جوغزی زیکرو فیکردا حەبس دەکەن وکورتی هەڵدێنن. یەکێکی دیکە ئیسلام تەنها لە لایەنی بیروباوەڕ (عقیدة)دا کورت هەڵدێنێ، یەکێکی دیکە تەنها لە عیبادەتدا کورتی هەڵێناوە واتە (عیبادەتی شەخصیی) یەکێکی دیکە تەنها لە ئەخلاقدا و یەکێکی دیکە تەنها لە جەنگ و جیهاددا کورتی هەڵێناوە، کە لە ڕاستیدا هەموو ئەو پێناسە و بیروبۆچوونانە ناتەواوو هەڵەن .

چونکە : ئیسلام هەموو ئەو شتانەیەو زۆر شتی دیکەشە، شایانی باسیشە کە گچکە کردنەوەی (دین) بەهۆی گرتنی لایەنێکی و فەرامۆشکردنی لایەنەکانی دیکە بناغە و ماك ومیکرۆبی پەرتەوازەیی یە، چونکە خوای پەروەردگار کە باسی هۆی پەرتەوازەیی نەصرانییەکانمان بۆ دەکات دەفەرموێ:

﴿ وَمِنَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّا نَصَارَى أَخَذْنَا مِيثَاقَهُمْ فَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ اللّهُ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ ﴾ (المائدة ـ ١٤)

باسی هۆی پەرتەوازە بوونی نەصرانییەكانمان بۆ دەكات، دەفەرموێ: (وە ئەوانەی گوتیان ئێمە نەصرانین پەیمانمان لێ وەرگرتن(پەیمانی دینداریيەكی ڕاست و ساغ بەپێی ئەو شەریعەتەی كە مەسیح سەلاّت و سەلامی خوای لەسەر بێ لەخواوە هێنابووی) بەلاّم ئەوان بەشێكیان لە بیر چوو، فەرامۆشیان كرد(جا لە ئەنجامی ئەوەدا كە بەشێكیان لێ لەبیر چوو وە بەشێك لە دینیان فەرامۆش كرد)دوژمنایەتی و ڕق و كینە و دووبەرەكێمان لە نێودا پەیداكردن هەتا ڕۆژی دوایی وەدواییش خوا هەواڵیان پێ دەدا بەوەی كە وەستایانە دەیانكرد.

وە لە واقیع دا ئێستا نەصرانییەكان چەند دەستەو تاقم و بەشێكن هەركامێكیان ئەوی دیكەیانی پێ كافرو لارێیە،چونكە: (كاثۆلیك) و (ئەرثذۆكس) و (پرۆتستانت) تەنها سێ تاقمە سەرەكییەكانن و لە نێو هەر كامێكیشیان دا دەستەو تاقمی زۆر هەن .

كەواتە: ئێمەی مسوڵمانیش ئەگەر زۆر وریانەبین وە لەبەر ڕۆشنایی قورئان بەپلەی یەكەم و پاشان سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ - كە ئەویش هەر شەرح و تەفسیری قورئانە – لە ئیسلام تێ نەگەین و پێناسەی ئیسلام نەكەین، بێگومان بەمەرەدی نەسرانییەكان و ئەهلی كیتاب بە گشتی، دەچین.

كەواتە: با لەبەر ڕۆشنایی ئایەتەكانی قورئان و دەقەكانی سوننەت دا بزانین:

(ئیسلام چی یە؟)

لە وەلاّمی ئەم پرسیارەدا دەگونجێ زۆر شت بگوترێ بەلاّم من بەكورتی لەم سێ خاڵەدا وەلاّمی ئەم پرسیارە دەدەمەوە .

## یەك: ئیسلام دینی هەق و پەسندكراوی خوایە بۆ مرۆڤایەتی:

چا ئێستا با بەر لەوەی بەڵگەی قورئانی لەسەر ئەو ڕاستییە بێنینەوە، سەرنجێكی زمانەوانی یانە لە وشەی (إسلام) بدەین:

لە ڕووی زمانەوانییەوە وشەی ئیسلام چاوگ (مصدر)ە، دەگوترێ (أَسْلَمَ، يُسْلِمُ، إِسْلاماً فهو مُسْلِمٌ) (أسْلَم) واتە: گەردن كەچ بوو، گەردن كەچ دەبێ، گەردن كەچ كردن، ئەو گەردن كەچە.

كەواتە ئیسلام لەڕووی زمانەوانییەوە واتە: گەردن كەچی، لەزاراوی شەرعیشدا (إسلام) ناوی بەرنامەو دینی ڕاست و پەسندی خوایە و بەمانای گەردن كەچییە بۆ خوای پەروەردگار، خوا (سبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ (٨٣)﴾.

لێرەدا خوای پەروەردگار بەشێوەی ئینكاری كردن دەپرسێ و دەفەرموێ: ﴿ أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ﴾ واتە: (ئایا خەڵكی بەرنامەیەكی دیكە جگە لە بەرنامەی خوا داوا دەكەن و دەخوازن؟!).

پاشان دەفەرموێ ـ وەك بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوە كە ڕەوا نیە خەڵكی جگە لە بەرنامەی خوا بەرنامەیەكی دیكە بخوازن :﴿ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾ واتە: (لە حاڵێكدا كە هەموو ئەوانەی كە لە ئاسمانەكان و زەوی دان چارو ناچار بۆ خوا گەردن كەچن دوایی سەرەنجامیشیان دیاری دەكات و دەفەرموێ: ﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ واتە: وە بۆ لای ئەویش دەگێڕرێنەوە؟!

واتە لەبەر ئەوەی هەرچی خاوەن هەست و(ذي روح)ە لە فریشتە وجنۆکە و ئادەمیزاد و هەر دروست کراوێکی دیکە کە هەر خوا ژمارەیان دەزانـێ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾ (المدثر-١٣)

بەڵێ لە سۆنگەی ئەوەوە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە بۆ خـوا گەردن کەچە کەواتە : شتێکی ناشایستەیە بۆ ئینسان بە دوای دینی غەیری خوا بکەوێت، مادام هەموو کائینات وبونەوەر و بـوون (الوجـود) بـۆ خـوا گەردن کەچە ئینسانەکانیش کەبەشێکی کەمن لە ڕێژی دروست کراوەکـانی خوادا لەسەریان پێویستە کـە گـەردن کەچـی دیـنی خـوا بـن لـەو بەشـە ئیختیاریەی کەتێیدا سەر پشك کراون.

چونکە کەسایەتی ( شخصية)ی ئینسان دووبەشە: بەشێکی گەردن کەچە بۆ خوا بەبێ‌ئەوەی هیچ ئیختیاری تێدا هەبێت، بۆ نمونە ئینسان بەدەست خۆی نیە کە لە دایك دەبێ، وەبەدەست خۆی نیە لە کوێ لـەدایك دەبـێ وە لـە چ ڕەگەز و میللەتێکە، وە بەدەست خۆی نیە کە نێرە یان مێیە، قەد و قیافە و باڵای و زۆر شتی دیکە بەدەست خۆی نیە، کەواتە: لەو ڕووە وە ئینسان بیەوێ یان نا، چارو ناچار گەردن کەچی خوای باڵا دەستە . بەڵام بێگومان بەدەست خۆیەتی ئیمان بهێنێ یان کافر بێت، چاکە بکات یـان خراپـە ، ڕوو لـەخوا بکات یان پشتی تێ بکـات، جـا خـوای پـەروەردگار (جـلّ شـأنه) لێـرەدا دەفەرموێ: لە کاتێك دا کە هەموو مەخلوقەکان گەردن کەچی خوان جێ ی خۆیەتی کە ئینسانیش لەو بوارەدا کە تێیدا سەر پشکەو ئیختیاری پێدراوە گەردن کەچی خوا بێت. ئێستاش دوای ئەوەی لەڕووی زمانەوانییەوە زانیمان (إسلام) چی یە، با سەرنج بدەینە ئەم چەند ئایەتانە بۆئەوەی بۆمان دەرکەوێ کە: ئیسلام دینی ڕاست و پەسند کراوی خوایە بۆ مرۆڤایەتی:

خوای پەروەردگار لە سوڕەتی (آل عمران) دا دەفەرمویَ:
﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ (١٩)﴾
واتە: (بێگومان بەرنامەو(دین) لە لای خوا تەنها ئیسلامە)
لێرە دا خوای زانا (تبارك و تعالى) ڕوونی دەكاتەوە و ڕای دەگەیەنێت كە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە ئیعتیڕاف بە هیچ دینێك ناكریَ وەك بەرنامـــە و (دین) بۆ ژیان و گوزەرانی ئینسان، جگە لە ئیسلام.
ئینجا هەر لە سوڕەتی (آل عمران)دا خوای كاربەجیَ فەرموویەتی:﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٨٥)﴾
واتە: (وە هەر كەسێك جگە لە ئیسلام دینێكی دیكە بخوازیَ، لـێی قبووڵ ناكریَ و لە دوارۆژیشدا لە زەرەرمەندانە)
وە لە هەر كام لە سوڕەتەكانی (الفتح ـ٢ـ، التوبة ـ٣٣ـ ، الصف ـ٩ـ) دا ئەم ڕستە قورئانیی یە دووبارە بۆتەوە :ـ
﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ ﴾ .
خوای پەروەردگار باسی خۆی دەكات و دەفەرمویَ خوا(سبحانه وتعالى )) ئەو كەسەیە كە پێغەمبەری خۆی محمد ﷺ ی ڕەوانە كردوە بە هیدایەتەوەو بە دینی حەقەوە تاكو بەسەر هەموو دینەكان دا زاڵی بكات.
هەروەها لە سووڕەتی (المائدة) خـوای پـەروەردگار دەفـەرمویَ : ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا (٣)﴾
واتە: (ئەمڕۆ دینەكەتانم بۆ تەواو كردن وە چاكەی خۆم لە سەر ئێـوە تـەواو كرد وە ئیسلامم بە دین بۆ هەڵبژاردن)، كەواتە دینی (هەق) تـەنها دیـنی ئیسلامە، وە لە بەرانبەر دینی هەق دا، دینی ناهەق (باطـل) هەیـە ، كـە جگـە لـە ئیسـلام بەرنامـەكانی دیكـە هـەموویان بـە بەرنامـە و دیـنی

(باطل)دادەنرێن وە خوای پەروەردگار ئیسلامی بە دین بۆ مسوڵمانان پەسەند کردوە، وە ئەو دینەش دینێکی تێرو تەواوە، ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ کەواتە: لەو ئایەتانەوە کە ڕابردن زۆر بە ڕوونی دیارە کە ئیسلام دینی هەق وپەسند کراوی خوایە بۆمرۆڤایەتی. ئێستاش باسەرنجێکی وشەی(دین) بدەین و بزانین چەمك و واتایەکەی چی یە؟!

## (دیــن) یـانی چی ؟

وشەی (دین) لە بەکارهێنانی قورئان دا ، وە لە ئەسڵی زمانی عەرەبیداچوار واتای هەن :

١- بە مانای سزاو پاداشت، دێت وەك: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ (الفاتحة -٤) .
هەروەها لە گەلێك ئایەتی دیکەش دا بەم واتایە هاتوە.

٢- بە مانای گەردن کەچی (الخضوع) دێت وەك :
﴿ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ﴾ (الزمر -٣)
واتە: (ئاگاداربن! گەردنکەچی ساغ و بێخلتە تەنها شایستەی خوایە)، هەروەها وەك:
﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ﴾ (البقرة -١٩٣)
واتە: (وە لەگەڵ کافرەکاندا بجەنگن تاکو مەجالی ئازاردانی مسوڵمانانیان نامێنێ وە ملکەچی (دین)یش تەنها بۆ خوا دەبێ).

٣- دین بە مانای بەرنامەی ژیان دێ چ هی خوا بێ، چ هی غەیری خوا، واتە: چ خوای پەروەردگار دایبنابێ و دینی هەق بێ وە چ جگە لە خوا دایبنابێ و دینێکی (باطل) بێ، یاخود خوای پەروەردگار لە ئەسڵ دا

داینابێ و دوایی گۆڕابێ و دەستكاری كرابێ و بووبێ بە دینێكی (باطل) وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الكافرون)دا دەفەرمویٚ:
﴿ بسم الله الرحمن الرحيم. قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ (١) لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ (٢) وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ (٣) وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ (٤) وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ (٥) لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ (٦)﴾ .

وشەی(دین)دووجار بەكار هاتوە : جارێك بۆ پێغەمبەر ﷺ و جارێكیش بۆ كافرەكان ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾ ئینجا لەسەرەتای سوورەتەكەدا فەرموویەتی: ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ (١) لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ (٢)﴾، كەواتە: (دین) لێرەدا یانی بەرنامەی ژین چ خوایی و هەق بێت، وەچ هی ئەهلی كوفربێ و ناهەق بێ! مانای سوورەتەكەش لە سەرەتاوە تا كۆتایی بەم شێوەیە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. ئەی محمد ﷺ ! بڵێ: ئەی كافرەكان! ناپەرستم ئەوەی ئێوە دەی پەرستن، وە ئەوەی منیش دەی پەرستم ئێوە نای پەرستن. وە لە داهاتووشدا ئەوەی ئێوە دەیپەرستن من نای پەرستم ئێوەش لە داهاتوودا ئەوەی كە من دەیپەرستم نایپەرستن. دینی خۆتان بۆ خۆتان وە دینی خۆم بۆخۆم . دیارە لێرەدا دین واتە بەرنامە، واتە ئەی كافرەكان! بەرنامەی خۆتان كە لە سەری دەڕۆن لە ژیانتاندا بۆ خۆتان و بەرنامەی خۆشم بۆ خۆم.

وشەی (كافرون) لێرەدا (أل)ی لەسەرە كە (أل)ی (جنسە)ە كەواتە: هەموو كافرەكان دەگرێتەوە، بە هەڵگەڕاوە (مرتد) و دەغەڵ (مونافق) و ئەهلی كیتاب و بت پەرست و موڵحید و ـ هتد وەو(الكافرون) هەموو جۆرەكانی ئەهلی كوفر دەگرێتەوە، كەواتە هەموو جۆرەكانی ئەهلی كوفر دینیان هەیە و پەرستراو (معبود)یشیان هەیە!

جا زۆر لە خەڵكی بە پێچەوانە لەوە حاڵی بوون و وا دەزانن كە تەنها سێ دین هەن، ئەوانیش:

دینی یەهودیی و دینی نەصرانیی و دینی ئیسلام!! بەڵام نەخێر! بەڵكو هەرچی كافر هەیە لەسەر ئەم زەوییە جۆرە دینێكی هەیە. هەرچی جوولەكە (یهود)و دیان(نصاری)ن دینێكی ئاسمانییان هەیە كە لە ئەسڵ دا هەق و ڕاست بووە بەڵام دوایی تێكیان داوە، بەڵام خەڵكی دیكە جگە لە ئەهلی كتاب، ئەوە سەرجەمیان دینێكی زەمنییان هەیە كە هەر لە ئەسڵ دا ناهەق (باطل)ە. بەڵام دینی ئەهلی كیتاب دینێكی هەق بووە، چونكە بێ گومان خوای پەروەردگار هەر دینی هەقی ناردەوە بۆ هەموو پێغەمبەران (علیهم أفضل الصلوات وأتم التسلیمات). بەڵام هەر كام لە پێغەمبەران (علیهم السلام) بەرنامە و شەریعەتی تایبەتی خۆی هەبووە كە گونجا وبووە لەگەڵ ئەو هەل ومەرج و قۆناغەی ئەو گەل و میللەتە كە تێیدا نێردراوە ولەگەڵی پڕ بە پێست بووە.

بەڵام ئەوەی كە لەلایەن خواوە سەرچاوەی نەگرتێ هەر لەبنەڕتەوە بەدینێكی پووچ و(باطل) دادەنرێت. كەواتە: لێرەدا وشەی (دین) بە مانای بەرنامەی ژین بەكارهاتوە بەڕەهایی چ ڕاست چ چەوت.

٤- وشەی (دین) لە قورئاندا بە كارهاتوە بۆ(ئیسلام) واتە : تاكە بەرنامەی ڕاستی ژین كە خوای پەروەردگار دایناوە ، وەك لەو بارەیەوە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ ﴾ (آل عمران-١٩) .

جا ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین كە خوای پەروەردگار لەم ئایەتە دا هەر كام لە (دین)و (إسلام)ی بەیەك شت داناوە، چ بڵێی ئیسلام، چ بڵێی دین. شایانی باسیشە هەر كاتێك كە خوای پەروەردگار وشەی (دین)ی بۆ ئیسلام

بەكار هێنابێت (قید)ێكی خستۆتە سەر جا یان (ال)ی (عهد)ی خستۆتە سەر وەك: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا.. ﴾ (الروم ـ٣٠)، یان وشەی (دین) بە وەسفێك وەسف كراوە وەك ﴿وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ﴾ (التوبة-٢٩)، یان ﴿الدِّينُ الْقَيِّمُ ﴾(الروم ـ٣٠،٤٣). یان ﴿دِينًا قِيَمًا﴾ (الأنعام ـ١٦١)، یان ﴿ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا ﴾ (النصر-٢)، یان ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي شَكٍّ مِّن دِينِي ..﴾ (یونس ـ١٠٤)، یان ﴿وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمْ..﴾ (التوبة ـ١٢) .

كەواتە: دەڵێین: ئیسلام دینی هەق و پەسەندكراوی خوایە و خوای پەروەردگار بێجگە لە ئیسلام هیچ بەرنامەیەكی دیكە بە ڕەوا نازانێت كە مرۆڤایەتی شوێنی بكەوێت .

كەواتە: لە كاتێك دا كە ئیسلام كورت هەڵدەهێنرێ و (حصر)دەكرێ لە بواری تەزكیەی نەفس، یان ڕەوشت، یان فیكر، یان جەنگ و جیهاد، یان عقیدە، یان (قضاء)، یان كۆمەڵایەتی ... هتد.

ئەوە شتێكی هەڵەیە و پێچەوانەی قورئان و سوننەت و سروشتی ئیسلامە. بەڵكو ئیسلام كاڵایەكە پڕ بەباڵای ئینسان وە ئیسلام ڕێبازو بەرنامەیەكی گشتگیرە بۆ ژیانی ئینسان هەم ئیمان وعەقیدەی تێدایە، هەم لایەنی فیكریی و ڕۆشنبیریی و ئەخلاق و ئەدەب و ئابووریی و، كۆمەڵایەتی و، ڕامیاری و، جەنگ وجیهاد و ئاشتی و، حوكم و سیاسەت و دەوڵەت و... هتدی تێدایە.

كەواتە: كە دەڵێین ئیسلام دینی ڕاست و پەسەند كراوی خوای پەروەردگارە بۆ مرۆڤایەتی، واتە ئەو بەرنامەیەیە كە لەسەر مسوڵمانان پێویستە لە هەموو لایەنەكانی ژیانیاندا شوێنی بكەون و جگە لەوی شوێنی هیچ بەرنامەیەكی دیكە نەكەون، بۆچی؟! چونكە لە بەرانبەر ئیسلامدا یان دینی

ئاسمانی وەك دینی شێوێنراوی یەهوودییەت و نەسرانییەت هەیە، یان دینی ئینسان کردو زەمینی کە لە هەر ڕۆژگارێکدا چەندان جۆرە دین و بەرنامە هەبوون و لەم ڕۆژگارەی ئێمەشدا زۆر هەن. وەك: سیکۆلاریزم (العلمانیة) واتە بێ دینایەتی، جیهانگیریی (العولمة) کە لە ڕاستی دا ئەمرەکەیە و بریتیە لەو سیاسەتەی کە ئەمریکا دەیەوێ بەسەر دونیادا فەرزی بکات، هەروەها (لیبرالیزم، سۆسیالیزم، کاپیتالیزم، کۆمۆنیزم) چەندان ڕێچکەو بیدۆزەی دیکەی لەو بابەتانە. وەلە ڕاستی دا ئەوانە هەموویان بە(دین) لە قەڵەم دەدرێن. جا هەیانە دینێکی گشتگیر (شامل)ە ولە هەموو لایەنەکانی ژیان دەکۆڵێتەوەو دەیەوێ سەرجەم لایەنەکانی ژیان بخاتە ژێر ڕکێف و قەڵەمڕەوی خۆیەوەو هیچ لایەنێکیان لێ هەڵنەبوێرێ، وە هەشیانە دینێکی جوزئی یە وتەنها لە لایەنێکی ژیان دەکۆڵێتەوەو دەیەوێ ڕێکی بخات .

**دوو: دەڵێین: ئیسلام بریتیە لە (جیهانبینی و تێڕوانینێكی ڕاست و دروست دەربارەی خوا (تبارك وتعالى) و بوون (وجود)و ژیان و ئینسان):**

بەداخەوە زۆر لە مسوڵمانان لە و ڕاستی یە باش حاڵی نەبوون[1].

چونكە ئەگەر تەماشای قورئـــانی بە هێزو پێز بكەین كە فەرمایشتی خوای پەروەردگارە، دەبینن كە نزیكەی (٢/٣) دوو لەسـەر سێی لە قۆناغی مەككە هاتۆتە خوارەوە كە هەموی یان زۆربەی دەربارەی جیهانبینی و تێڕوانینە لە بارەی بوون (وجود)ە بەگشتی و خوای پەروەردگار بەتایبەت. ئەم بوون(وجود)ە چی یە؟ چۆنە؟ كێ دروستی كردوەو بۆچی؟ سەرەنجامی چی لـێ دێ ؟! خوا كێیە؟! سیفاتەكانی چین ...؟ ناوە پیرۆزەكانی چەندن وچی وچین ؟! ئایا خوای بەرزو مەزن (تبارك وتعالى) ئەم بونەوەرەی بۆ خوڵقـــاندوە؟، ئادەمیزادی بۆ خوڵقاندوەو مەرگ و ژیانی بۆچی رەخساندوون؟ ئایا حیكمەتی خـــوای پەروەردگـــار چیە لە هێنـــانە دی و بەرێوەبردنی ئەم كـــەون و كائیناتەدا ...؟!

پاشان، كە ئادەمیزاد خوڵقاوە ، ئایا ژیانی لە چەند قۆناغ پێك دێت و، لە كوێ وە هاتوەو بۆ كوێ دەچێت ؟! هەروەهاپێكهێنەرەكانی ئەم بوون (وجود) چی و چین ...؟! شەیطان كـێ یـە ؟! جنۆكـە كـێن ؟! فریشـتەكان كـێن ..؟ ئەركیان چی یە ..؟!

---

(١) واتە نازانن كە ئیسلام بەر لە هەر شتێك بریتیە لە جیهان بینینی و تێروانینی ڕاست و دروست .

بەڵێ قورئانی مەككی كە نزیكەی(٢/٣)ی كۆی هەموو قورئان پێك دەهێنێت هەمووی دەربارەی ئەم بابەت و مەسەلانەیە.

جا ئەمە شتێكی زۆر گرنگە كە بزانین، هەر كاتێك بمانەوێ خەڵك و كۆمەڵگایەكی مسوڵمان بە چاكی و دروستی لەسەر دینی ڕاستی خوای پەروەردگار پەروەردە بكەین دەبێ لێرەوە دەست پێبكەین و تێگەیاندنی خەڵك لەم ڕووەوە و بەر چاو ڕوون كردنەوەیان بكەینە بناغەی كارمان .

دیارە بە خۆڕاییش نەبووە كە پێغەمبەر ﷺ سێزدە ساڵ لە مەككە ئەو قورئانەی كە بۆی دابەزیوە زۆربەی هەرە زۆری دەربارەی جیهانبینی و تێڕوانینی ڕاست و دروست لە بەرانبەر (بوون) و خوای پەروەردگار و ژیان و ئینسان و جۆری پەیوەندیی خوا (جل وعلا) بەدرووستكراوەكانییەوە و .. هتد، بووە. چونكە كاتێك كە مرۆڤ ئەو ڕاستییانە دەزانێ و لە دڵ و مێشكی دا جێگیر دەبن. هەر ئەو ڕاستییانە دەبنە ڕێنیشاندەری و شتەكانی دیكەی هەموو تێدەگەیەنن : ئەو كاتە ئینسان زۆر چاك حاڵی دەبێت كە ئەوخوایەی ناسیویەتی كێیە و دەبێ چۆن ئیمانی پێ بێنێ و چۆن بەندایەتی بۆ بكات و پارێزكاریی لێبكات و خۆشی بوێت و چۆن لێی بترسێ و بەدوای شەریعەتەكەی بكەوێت، وە ئەو پێغەمبەرەی ﷺ كە ڕەوانەكراوو نوێنەری خوای پەروەردگارەو پەیامی خوای هێناوە دەبێ چۆن هەڵسوكەوتی لەگەڵدا بكرێ!! وە چۆن شوێن پێی هەڵبگیرێت، هەروەها ئەو دوارۆژەی كە سەرئەنجامی ئینسانە چۆن خۆی بۆ ئامادە بكات!!

بەڵێ دوای ئەوەی كە ئینسان ئەو بابەت و مەسەلانەی فام كردو تەفاعولی لەگەڵیان كرد، بەر چاوی ڕۆشن دەبێتەوە، وەڵامی پرسیارەكانی هەموو بۆ ڕۆشن دەبێ و زۆر باش دەزانێ كەخوای پەروەردگار كێیە! وە چۆن

لەگەڵ خواو دینی خوادا هەڵسوکەوت بکات. بۆیە کاتێك کە مسوڵمانێك دەبینین خۆی پێ مسوڵمانێکی تەواو عەیارە ..! بەڵام: ئەوەندەی کە پارەو بەرژەوەندیی یان حزبێکی کافری خۆش دەوێ، نیو ئەوەندەش خوای خۆش ناوێت، یان ئەوەندەی کە لە ڕژێمێکی (طاغووتی) دەترسێ، نیو ئەوەندە لە خواناترسێت، یان ئەوەندەی کە بەدوای هەواو ئارەزووی خۆی دەکەوێت، نیو ئەوەندەش بەدوای بەرنامەی خوا ناکەوێت و خەمی پێوە هەڵناگرێ. دەبێ بزانین کە: گرفتەکەی ئەوەیە کە خوای پەروەردگاری نەناسیوە و ئیمانی بە خوا نیە و لەژێر بینای ئیسلام حاڵی نەبووە، کە بناغەو بنەڕەتەکەی بریتیە لەو جیهانبینی و شارەزایی و تێڕوانینە ڕاست و دروستە کە ئینسان حاڵی دەکات خوا (تبارك و تعالی) کێیە؟ وە بوون (وجود) چی یەو چۆنە و؟ ژیانی ئینسان چی یەو؟ ئینسان بۆ دروست بووە لە کوێ هاتوە و بۆ کوێ دەچێت ؟!

جا ئێستا بە مەبەستی تیشك خستنەسەر تێڕوانین و جیهانبینی ئیسلام و بناغە فیکرییەکەی باتەماشای ئەم چەند ئایەتانە بکەین:

## یەکەم: خواناسی:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ (الرعد -١٦)

واتە: (خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە).

کەواتە: هیچ شتێك نیە کە دروستکراوی خوا نەبێت. پاشان خوای بالاَ

دەست (تبارك و تعالی) دەربارە پەروەدگارێتی خۆی دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ قُلِ اللَّهُ﴾ (الرعد-١٦). بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ لێیان بپرسە کە کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە – دوایی هەر بۆ خۆی

دەفەرموێ – وەڵامیان بدەوە: بلێ: خوا (الله)، (چونكە جگە لەم وەڵامە وەڵامێكی دیكەی ڕاست نیە) هەروەها دەربارەی خاوەنێتی خۆی بۆ هەموو شتێك لە سورەتی (آل عمران) دا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء (٢٦)﴾

واتە: (بلێ: ئەی خوایە خاوەنی موڵك ! هەر كەسێك بتەوێ موڵكی دەدەیتێ وە هەر كەسێكیش كە بتەوێ موڵكی لێ دەستێنی).

لێرەدا موڵك واتە (دەسەلآت). كەواتە خوا (جل شأنه) خاوەنی هەموو شتێكەو هەموو دەستەلآتێكە.

پاشان: خوای پەروەردگار لە سورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاء وَالْأَرْضِ (٣)﴾.

واتە: (ئەی خەڵكینە چاكەی خوا بە سەر خۆتانەوە ببینن و یادی بكەن، ئایا جگە لە خوا بەدی هێنەرێكی دیكە لە ئاسمان و زەویدا هەیە كە ڕۆزیتان بداتێ؟ بێگومان بێجگە لەو پەرستراوی دیكەتان نیە ، كەواتە بۆ كوێ دەبرێن و بۆ كوێ ڕووتان پێوەردەگێڕدرێ و بۆچی غەیری وی دەپەرستن! (واتە مادام هەر خوا ڕۆزی دەر و بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەن نیعمەتە بەسەر تانەوە هەر ئەویش بپەرستن و بەندایەتی بەس بۆ ئەو بكەن) ، هەروەها خوای پەروەردگار لە سورەتی(طه)دا فەرمویەتی:

﴿ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْأَسْمَاء الْحُسْنَى (٨)﴾ .

واتە (خوا جگە لەو پەرستراوی دیکە نین و هەموو ناوە چاکەکانی هەن).
ئەوە دەربارەی ناسینی خوای پەروەردگار (سبحانە وتعالی) بەڵام بێ گومان زۆر بەکورتی وگوشراوی[1] .

دووەم: بوون ناسیی (معرفە الوجود):

ئەمەش چەند ئایەتێکی بە پێزی کتێبی خوا کە پێناسەی بوون (وجود)مان بۆ دەکەن و ڕوونیشی دەکەنەوە کە پەیوەندی نێوان خوای بەدیهێنەر وبەدیهێنراوەکانی چۆنە خوای بەرز فەرموویەتی:
﴿ تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ (الأسراء ـ ٤٤)
واتە: (هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی تێیاندا هەیە خوا بەپاك دەگرن وە هیچ شتێك نیە کە خوا بەپاك نەگرێ و ستایشی نەکات بەڵام ئێوە لە خوا بە پاك گرتن و ستایش کردنەکەیان تێناگەن، بێ گومان خوا هێمنە و لێ بوردەیە) .
کەواتە ئەم (بوون)ە، (بوون، نەك بوونەوەر، چونکە بوون تەرجەمەی(وجود)ە و بونەوەر مانای (كَوْن) ە، وە بوونەوەر ئەوەیە کە هەتا ئێستا بە تەلەسکۆپەکان (المناظیر) بینراوە و کەشف کراوە، کە بێگومان بەشێکی بچووکە لە (بوون) و لەوانەیە تەنها بەشێکیش بێت لە ئاسمانی یەکەم کە ئەو ئاسمانە جارێ هەر سنوورەکەیشی دیاری نەکراوە، وە لە

(١) لە زنجیرە وانەی ( ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی )دا بە تێرو تەسەلی لە بارەی بەدیهێنەرایی و پەروەردگاریتی و پەرستراویتی خوا (جلّ شأنە) وە دواوین .

سەروویەوە شەش ئاسمانی دیکە هەن، پاشان عەرش هەیە و درەختی کۆتایی (سدرة المُنتهی) و پاشان بەدیهێنراوەکانی دیکە کە خوای پەروەردگار هەر بۆ خۆی دەیانزانێ، کەواتە: موڵکی خوا زۆر گەورەیەو یەکجار پان و پۆڕە﴾، جا خوای پەروەردگار (جل جلالـه) دەفـەرموێ: هـەموو (بـوون) یـان حـەوت ئاسمانەکان و هەرچی تێیاندایە خوا بە پاك دەگرن و ستایشی دەکەن.

هەروەها خوای پەروەردگار بەسەر هەموو بوونەوەر و(بوون) ڕادەگات، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾ (هود-٧) .

واتە: (وە خوای پەروەردگار ئەوکەسەیە کە لە شەش ڕۆژاندا (واتە بەشەش قۆناغان) ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوون، وەئەو کاتـەش عەرشـی خـوا لەسەر ئاوێ بوو (ئێمە نازانین ئەوە چۆنە؟ بەڵام خوای پەروەردگار دەفەرموێ پێش ئەوەی ئەم (بوون) ، بەدیبهێنم و ئـەو شـێوەیەی ئێسـتای پێببەخشـم بارەگاکەم لە سەر ئاو بوو) پاشان خوای پەروەردگار حیکمەتی وەدیهێنرانـی ئاسمانەکان و زەوی دەخاتە ڕوو و دەفەرموێ: تـاکو تاقیتـان بکاتـەوە داخـۆ کامەتان کردەوەی باشترە) . کەواتە: ئەم (بوون)ە بۆیـە بنیـات نـراوە تـاکو ئینسانی تێدا تاقی بکرێتەوە.

## سـێیەم : ئینسان و ئەرکی سـەرشانی و حیکمەتی دروسـتکرانی:

دەربارەی ئینسـان و ئەرکی سـەر شـانی لە ژیانی سـەر زەوی دا خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ (البقرة-٣٠)

واتە: (كاتێك خوا بە فریشتەكانی فەرموو من دەمەوێ جێنشینێك لەسەر زەوی دابنێم). كەواتە ئینسان جێنشینێكە كە خوای پەروەردگار لەسەر زەوی دایناوە، وە خوای كاربەجێ لە سورەتی (الأحزاب)دا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا (٧٢)﴾.

واتە: (ئێمە ئەمانەتمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەكان و زەوی و شاخاكان، بەڵام نەیان توانی هەڵی بگرن و لێی ترسان. كەچی ئینسان هەڵی گرت بێ گومان ئینسان زۆر ستەمكارەو زۆر نەفامە).

كەواتە: ئادەمیزاد جێنشینی خوایە لەسەر زەوی بۆ ئەوەی شەریعەتی خوا پیادە بكات، بەهەمان شێوەش هەڵگری ئەمانەتی خوایە، ئەو ئەمانەتەی كە بەهەموو (بوون) هەڵنەگیرا، ئاسمانەكان بەو هەموو پانیی و بەرینیە، زەوی بەو هەموو شتە سەر سووڕهێنەرانەی كە تێیدان، شاخەكان بەو هەموو بەرزی و سەختی و پتەوییە، نەیان توانی هەڵی بگرن، بەڵام ئادەمیزاد هەڵی گرت!

كەواتە: ئینسان دروستكراو (مخلوق)ێكی ناوازەو تاكە هەر بۆیەش ئەركەكەشی ئەركێكی ناوازەو تاك و تایبەتەو لەگەڵ كەسایەتیی تایبەت و ناوازەی دا پڕ بە پێستە. وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (التین)دا دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (٤)﴾.

واتە: (بێگومان ئینسانمان لە باشترین شێوەدا خولقاندوە). بەڵێ لە (بوون) دا بەدیهێنراوێكی دیكەی وەك ئینسان نیە و لە هەموو دروستكراوەكان دەگمەنترو ناوازەترە و خوای پەروەردگار لە هەمووان زیاتر بایەخی پێداوە.

## چوارەم: ژیـــانی دنیـا:

خوای پەروەردگار دەربارەی ژیانی دنیای ئینسان دەفەرموێ:
﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاریات ـ٥٦) .
واتە: (وە ئینسان و جنۆكەم تەنها بۆ ئەوە دروست كردون كە بەندایەتیم بۆ بكەن) .

كەواتە ژیانی دنیا بۆ ئەوەیە كە ئینسان بەندایەتی خوای تێدا بكات.
وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ (الملك ـ٢).
واتە: (خوا ئەو كەسەیە كە ژیان و مردنــی گێـڕاون لەســەر زەوی تــاكو تاقیتان بكاتەوە داخۆ كامەتان كردەوەی باشترە).

كەواتە ئینسان بۆ تاقی كرانەوە بەدیهێنراوە و تاقی كردنەوەكەشی لەوەدا بەرجەستە دەبـێ كـە بەندایـەتی بـۆ خـوا بكـات، وە بەندایـەتی بـۆ خـوا كردنەكەشی لەوە دا خۆی دەنوێنێ كەكردەوەی باش ئـەنجام بـدات، كـردوەی باشیش لەوە دایە كە پابەندیی ئاینی خوا بێ و دوای بەرنامەو شەریعەتی خوا بكەوێت، چونكە هەر كاتێك كە ئینسان دوای شەریعەتی خوا كەوت دیارە لە خراپەو لاریی دوور دەبـێ و كـردەوەی بـاش ئـەنجام دەدات. وشـەی (العمـل الصـالح)یش لەزاراوی قورئاندا، هەم نیەتی نێو دڵ و هەم دەربـڕینی زمـان و هەم كردەوەو چالاكی ئەندامەكانیش دەگرێتەوە.

**پێنجـــەم: ژیانی ڕۆژی دوایـــی :**

خوای پەروەردگار دەربارەی ژیانی ڕۆژی دوایی ـ واتە: ژیانی نێو بەهەشت ـ فەرمویەتی: ﴿ وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ (العنكبوت ـ٦٤)

واتە: (ئەم ژیانە دنیاییە جگە لـەكات بەسـەربردن و گەمـە و یـاری شـتێكی دیكـە نیـە، بـەلام بێ‌گومـان مـەنزڵگای دواڕۆژ ئـەوێ ژیـانی ڕاستەقینەیە ئەگەر بزانن! )، بەڵێ ئینسانێك بەو هەموو پلەو پایەو گرنگی پێدران و بایەخەوە تەنها (پەنجا ـ شەست) ساڵێك تەمـەنی لێناوەشـێتەوە و ناگونجێ و ماقووڵ نیە بگوترێ: تەنها ئەوەندە ژیانەی پێ ڕەوابینراوە، بەڵكو ئەوەندە ژیان و تەمەنە تەنها بۆ تاقی كردنەوەیەتی، ئەگـەر نـا مـەنزڵگای كۆتایی و جێگای نیشتەجێ بوونی دواڕۆژە، جا ـ دۆزەخ بـێ بەهەمیشـەیی، یان بەهەشت بێ بە هەمیشەیی، ئەویش لەسەر ئەو كردەوانەی كەلە ژیـانی دنیادا دەیانكات و، بەرجەستە بوونی ئەو ئەنجامەیە كەوەری دەگرێتەوە پاش تەواو بوونی تاقی كردنەوەی ژیانی دنیای !

كەواتە: جیهانبینی و تێڕوانینێكی ئاواو ئەو جۆرە مەعریفەتە بەرانبەر بە خوا (تبارك و تعالـی)و بەرانبەر بە(بوون)و ئینسان و ژیان... بناغە و ژێـر بینای دینداریی و مسوڵمانیەتی‌یە .

**سێ : دەڵێین: (ئیسلام بریتیە لە پابەندیی بە بەرنامەی خواوە لەسەر ئاستی تاك و كۆمەڵ).**

ئەوەش یەكێكە لەو بابەتانەی كە مسوڵمانان زۆربەیان لێی دوور كەوتوونەتەوەو یەكێكە لەو ڕاستیانەی كە لەمێشكی زۆربەی مسوڵمانان دا كاڵ بوونەتەوە، چونكە ئیسلام لە مێشكی زۆربەی مسوڵمانانداوا وێنا (تصویر) دەكرێت كە مسوڵمانەتیی ئەركێكی كەسیی (شخصي)یە و ئینسان بە تەنیاو وەك تاك ئەنجامی دەدات بەڵام پەیوەندی بە كۆمەڵگاو میللەت و ژیانی خەڵكییەوە نیە!! هەرچەندە خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونی ڕایگەیاندوە كە پابەندیی بە ئیسلامەوە هەم ئەركێكی تاكی یەو هەم كۆمەڵی یە، وە ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم ڕستە قورئانی یە- كە وەك پێشتر ئاماژەم پێ كرد لە هەرسێك سوورەتی (الفتح،الصف،التوبة)دا دووبارە بۆتەوە –ئەو ڕاستییە دیارەو هیچ جۆرە تەم و مژێكی لە سەر نیە:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ ﴾(١).

واتە: (خوا(سبحانە وتعالى)پێغەمبەری خۆی ڕەوانەكردوە بە هیدایەتەوە ویە دینی هەقەوە تاكو بە سەر هەموو دینەكاندا زاڵی بكات).

كەواتە: پێغەمبەر ﷺ لە خوای پەروەردگارەوە ئیسلامی هێناوە، كە خوای پەروەردگار ئەو ئیسلامە دەكاتە دوو بەش(هدی) و (دین الحق).

(١) الفتح -٢٨-، الصف -٩- التوبة -٣٣-

بەشی یەكەم: هیدایەتێكە كە لەتاك(شخص) دا بەرجەستە دەبێ، هەر بۆیەش دەگوترێ: فلاَن كەس هیدایەتی خوای وەرگرتووە، یان فلاَن كەس هیدایەتدراو(مُهْتَدي)یە، واتە:چۆتە سەر دینی خوا و دینی خوای لە خۆیدا بەرجەستە كردوە و ئەو شتانەی (ئیسلام) كە بە ئینسان جێبەجێ دەكرێن وەك تاك دەتوانێ لەخودی خۆی دا بیانهێنێتە دی. هێناونیە دی.

بەشی دووەم : بەرنامەی هەق بۆ كۆمەڵ. واتە سیستەم (نظام)ێكە خەڵك و كۆمەڵگا لە خۆیدا بەرجەستەی دەكات و بەڕێوەی دەبات.

كە لە ڕاستیدا دینی هەق و ڕاست هەر ئیسلامەو هیدایەتیش دەگرێتە خۆی، بەلاَم لێرەدا خوای پەروەردگار لە بەر حیكمەتێك یان زیاتر بە جیا باسی كردون، ئەگەر نا هیدایەت بەشێكە لەو دینە هەقەی كە خوا ناردوویەتی كە ئیسلامە ، حیكمەتی بە جیا باسكردنەكەش ئەوەیە كە ئێمە بزانین دینداریی تەنها ئەركێكی كەسیی (شخصي)نیە، ئینسان وەك تاك پێی هەڵبستێ، بەڵكو ئەركێكی كەسی(شخصي)و كۆمەڵیشە.

جا ئێستا زۆربەی مسوڵمانان چەمك و واتای دینی خوای پەروەردگار هەر وەك هیدایەتە كەسیی (شخصي)یەكە حاڵی بوون، بەلاَم بێگومان ئەوە بە هەڵەدا چوونێكی زەق و سەیرە لە تێگەیشتنی ئاین و بەرنامەی خوادا، چونكە ئەگەر هیدایەتە كەسی (شخصي)ی یەكە لەوەدا بەرجەستە دەبێ، كەتاكی مسوڵمان جیهانبینی و تێڕوانینێكی ڕاست و دروستی هەبێ دەربارەی خوای پەروەردگار و بوون و ئینسان و حیكمەتی دروستكرانی و ژیانی دنیاو دواڕۆژ، هەروەها لە ئیمان و پارێزكاریی (تقوى)و خوا پەرستیی (عبادة)و تەزكیەی نەفس و ڕەوشتی بەرزو جوان دا بەرجەستە دەبێ. كە بێ گومان ئەو

شتانە هەر چەندە یەكجار گرنگ و گەورەن، بەڵام دیسان هەموو ئیسلام نین و تەنها ئەو بەش و لایەنانەینی كە بە تاك (فرد) جێ بەجێ دەكرێن.

بەڵێ ئەگەر لایەنە تایبەتی و كەسییەكەی ئیسلام لەو شـــــتانەدا بەرجەستە دەبێ، ئەوە بێگومان لایەنە بەرنامەكەییەكەی و سـیســـــتەمە گشتگیریی و [redacted] لایەنی یەكەی لە: پاراســـتنی ژیان و هێمنی و ئاسایشی خەڵك و ماڵ و ناموس و وەچەو كەرامەتیان و، لەچەسپاندنی دادگەریی و لابردنــی زوڵم و ستەم و جێ بەجێكردنی سـنووره شەرعیەكان و فەرمان بە چاكەو ڕێگری لە خراپەو بانگەوازكردن وخەڵك فێری دینداریی كردن وجەنگ و جیهادو بەرگـری كردن لە بانگەوازو دەوڵەتی ئیسلامیو ... هتد دا بەرجەستە دەبێ، دیارە شـــتێكی بەڵگە نەویســـتیشـــە ئەو ئەركانە پێویستیان بەكاری هەرەوەزی و دەستبار بۆ یەكتر گرتنی كۆمەڵگاو خەڵك هەیەو هیچ كامیان بەشێوەی تاكی و بە بابای مسوڵمان وەك كەس(شخص) جێ بەجێ ناكرێن.

وەك وتمان مسوڵمانەتیی و دینداریی و بەڕێوە بردنی ئیسـلام ئـەركێكی تاكی (فردي)و كۆمەڵیشە . زانایانی ئیسلام ئەركە تایبەتی و كەسییەكانیان نـــاو نـــاوە (الفـــروض أو الواجبـــات العينيـــة) و ئەركـــە هـــەرەوەزیی و كۆمەڵییەكانیشیان ناوە ناوە: (الفروض أو الواجبات الكفائيـة) بـۆ وێنـە: ئیمانی كەس لە جیاتی كەس نیە و هەر كەسە دەبێ بۆ خوی ئیمان بێنێـت، كەواتە ئیمان هێنان واجبێكی شەرعی تاكی (شخصي)یە . بەواتایەكی دیكە ئەرك و واجبێكی عەینی یە ، چونكە پەیوەستە بەخودی ئینسانەوە. هەروەها نوێژە فەڕزەكان واجبێكی عەینین، وە هەر كام لە ڕۆژووی مانگی ڕەمـــەزان و زەكات دان و حەج كردن و خۆ دوورگرتن لە گوناحە گەورەكان و بچووكەكان و

خۆ بژاركردن لە خوو خـــدە و خەســـڵەتە نزم و پەستەكان و خۆ چاككردن و خۆرازاندنەوە بەرەوشتە بەرزەكان و سیفەتە پەســندەكان پێویســتی تایبــەتی (واجبات عينية)ن و ئینسان دەبێ وەك تاك (شخص) ئەنجامیان بدات.

بەڵام: فەرمان بە چاكە و ڕێگرتن لە خراپە ، جیهاد كردن، بەرگری كردن لە كیانی ئیسلامی، لە وڵاتی خـۆت ولـە میللـەتی خـۆت لـە ژێـر ئـاڵای ئیسلامدا و هەوڵدان بۆ چەسپاندنی شەریعەتی خوای پەروەردگار لە هەموو لایەنەكانی ژیاندا و.... هتد. ئەوانە هەموویان واجباتی كیفائین، واتە لە سەر هەموو مسوڵمانان پێویستن بەڵام ئەگەر هەندێكیان پێیان هەڵسان لە سەر هەموویان لادەچن، وە ئەگەر كەسانێك لـە نێـو مســـوڵماناندا نـەبوون بـەو ئەركانە هەڵسن ئەوە هەموویان گوناهبار دەبن. وەك خـوای پـەروەردگار لـە سوورەتی (آل عمران)دا فەرمویەتی: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٠٤)﴾ .

واتە : ئەی بڕواداریینە! با كۆمەڵێكتان تێدا هەبن بانگـەواز بكـەن بـۆ چاكە (واتە ئیسلام چونكە خێرو چاكەی دنیـا و دواڕۆژی گرتۆتـە خـۆی)وە فەرمان بە چاكە بكەن و ڕێگریی لە خراپە بكەن، وە هەر ئەوانن سەرفراز .

شایەنی باسیشــە مەبەست لە هەر كام لە(المعروف) و (المنكر) هــەموو جۆرەكانــی چاكەو خراپەیە كە چ لە بواری ئیمــان وعەقیدەدا و چ لە بواری فیكرو كلتووردا و چ سیاسیی و چ ئابووریی و چ كۆمەڵایەتیی و چ ئاداب و ڕەوشت و .. هتد، چونكە (أل)ی سەر(معروف)و (منكر)(أل)ی (تعریف)ە و جینسی چاكە و خراپە دەگرێتـــە نێو خۆی.

دیاره دەگونجێ (من)ی سەر (منكم) بۆ هەندێك (بعض) بێت، وەك ئێمە تەفسیری ئایەتەكەمان پێ كردوە، كە ئەو كاتە بانگەواز بۆ ئیسلام و فەرمان بە چاكە و ڕێگریی لە خراپە دەبنە فەرزی كیفایە و هەر كات هەندێك لە مسوڵمانان پێیان هەڵسان گوناهو لێپرسینەوە لەسەر هەموویان لادەچێت. چونكە زانایان لە پێناسەی فەرزی كیفایە دا گوتوویانە: (فرض الكفاية هو ما اذا قام به البعض سقط عن الباقين) واتە: فەرزی كیفایە ئەوەیە كە ئەگەر هەندێك پێی هەڵسان لەسەر ئەوانی دیكە لادەچێ .

وە دەشگونجێ (من) بۆ ڕوونكردنەوە بێت كە زانایان پێی دەڵێن: (من البيانية) كە ئەوكاتە مانای ئایەتەكە دەگۆڕێ و ئاوای لێ دێ:

ئەی بڕوادارینە! ئێوە كۆمەڵێك بن بانگەواز بۆ ئیسلام و فەرمان بە چاكە و ڕێگریی لە خراپە بكەن ...

واتە: بە پێی ئەم تەفسیرە پێویستە سەرجەم مسوڵمانان بە ئەركی بانگەواز و فەرمان بە چاكە و ڕێگریی لە خراپە هەڵسن نەك تەنها بڕێكیان .

پێشم وایە كە هەندێك جۆری بانگەواز و فەرمان بە چاكە وڕێگریی لە خراپە بە هەموو كەس دەكرێ و پێویستە هەموو مسوڵمانێك ـ هەر كەسە بە قەدەر خۆی ـ پێیان هەڵسێ، بەڵام هەندێك جۆریشیان هەیە، بە هەموو كەس ناكرێن و پێویستی یان بە خەڵكێكی تایبەتی و دانستە هەیە.

لێرەش دا كۆتایی بە وانەی یەكەمان دێنین.

سبحانك اللهم و بحمدك أشهد أن لاإله إلاّ أنت أستغفرك وأتوب إليك.

# وانەی دووەم:

# مســـوڵمان كـێ یـــە... ؟






الحمدلله رب العالمين و الصلاة والسلام على محمد المبعوث رحمة للعـالمين و آله المهتدين بهديه المبين.

بەڕێزان!

خوا یاربێ لەم دەرسەمان دا هەوڵدەدەین پێناسەی ئینسانی مسوڵمان بكەین كە سەرەتا بە كورتی دەڵێین:

(مسوڵمان ئەو كەسەیە كە ئیسلام لە خۆیدا بەرجەستە دەكات و لەگەڵی كارلێك (تفاعل) دەكات و بەو شێوەیە كە ئیسلام ـ واتە هەردووك سەرچاوەی ڕوون و بێچەندو چوونی كە قورئان و سوننەتن ـ دەڵێت كەسایەتی خۆی دادەڕژێت لە بواری جیهانبینی (ڕوانین) و لە بواری ئیمان و عەقیدە و خوا پەرستیی و ئەدەب و ڕەوشت و هەڵوێست و هەڵس وكەوت كردنی لەگەڵ خەڵك و دەورووبەردا)

جارێ لە ڕووی زمانەوانییەوە وشەی (مسوڵمان)ی كوردی هەر هەمان وشەی (مسلم)ی عەرەبی یە و هەر لە و وشەیەوە وەرگیراوە.

وشەی(مسلم)یش واتاكەی لە زمانی كوردی دا دەبێتە: (گەردن كەچ).

بەڵام لە زاراوەی شەرع دا واتە: كەسێك كە بۆ خوا گەردن كەچ دەكات.

مەبەستیش لە گەردن كەچ كردن تەسلیم بوون بۆ شەریعەتی خواو پابەند بوونە بە یاساكانی و ئەمرو نەهی یەكانییەوە و ئیسلامەتیی و مسوڵمانەتیی واتە ڕوو تێ كردن و خۆ پێسپاردن و خۆ تەسلیم كردنی مرۆڤ بە خوای كار بەجێ و دادگەرو بەرنامەكەی .

وەك پێشتریش باسم كرد كە عەرەب دەڵێن:

(أَسْلَمَ، يُسْلِمُ، إسْلاماً فهو مُسْلِمٌ ).

(مُسْلِمْ) واتە كەسێك كە ئیسلام بوون و تەسلیم بوونی لە خۆیدا هێناێتە دی، چونكە (مُسْلِم) لەسەر وەزنی (مُفْعِل)ە، واتە كەسێك كە گەردن كەچ و تەسلیم بووە .

بە کێ ..؟ بە خوای پەروەردگار (تبارك وتعالی).

بەڵام جاری واش هەیە کە وشەی (مسلم)لە قورئاندا بۆ غـەیری خـواش بەکارهاتوە، بۆ وێنە، لە کاتێکدا کە سولەیمان (علیه الصلاة والسلام) نامە دەنووسێ بۆ مەلیکەی سەبەء بەم شێوەیە: ﴿ إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ (٣٠) أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ (٣١)﴾ النمل

کە مەبەست لێرەدا لە هێنانەوەی ئەم دەقە موبارەکە وشەی (مسلمین)ە. کە لەم سیاقە دا مەبەست پێی مسوڵمانەتیی نیە، مسوڵمانەتیی بە مانـا عورفـی و باوەکەی بەڵکو مەبەست لە ڕستەی ﴿ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ ﴾ واتە : (بە گەردن کەچیی وەرن بۆ لام)

چونکە ناگونجێ مەلیکەی سەبەء مسوڵمان بووبێ پێش ئەوەی لە ئیسلام تێ بگات و سولەیمان تێی بگەیەنێ کە چۆن مسوڵمان ببـێ!!

کەواتە لێرەدا ڕستەی ﴿واتوني مسلمين﴾ واتـە (واتـوني خاضـعين) بـە گەردن کەچی وەرن بۆلام بۆ گفتوگۆ ــ تاکو سولەیمان دینی حەقی بـۆ ڕوون بکاتـەوە ــ چـونکە دوایـی خـوای پـەروەردگار لـە سـیاقی ئایەتـەکان دا فەرموویەتی:﴿ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ اللَّـهِ إِنَّهَـا كَانَـتْ مِـن قَـوْمٍ كَافِرِينَ ﴾ (النمل-٤٣) .

واتە: وە ئەوەی کە لە جیاتی خوا دەیپەرست بوویە پەرچ لە ڕێی دا ـ کە خوا بپەرستێ ـ چونکە ئەو ئافرەتە لە کۆمەڵی کافران بوو، کەواتە: تەنانەت لەو کاتەدا کە لە لای سولەیمانیش بووە و سەفەری لای سولەیمانیشی کـردوە هەر خواپەرست نەبووەو خوای پەروەردگار هەر بەکافر ناوی دەبات، بەڵام لـە لە کۆتاییدا کە ئافرەتەکە بەڵگەو موعجیزەکانی سولەیمانی بۆ ڕوون دەبنەوە لەسەر یەکتایی خواو پێغەمبەرایەتیی خـۆی ئەوکاتـە مسـوڵمان دەبـێ و

دەڵــێ: ﴿ وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (النمل-٤٤)، جا ئەم ئیسلام بوونەی ئەو ئافرەتە بەمانای ئەو مسـوڵمانەتی یـە یـە کـە ئێمـە لێـرە دا مەبەستمانە. كەواتە: كە لە زمانی كوردەواری خۆماندا لـە جیـاتی وشـەی (مسلم) دەگوترێ مسوڵمان واتە كەسێك كە بۆ خوا گەردن كەچ بێـت و بـە بەرنامەكەیەوە پابەند بێ. خوای پـەروەردگار دەربـارەی (ئیـبڕاهیم) (علیـه الصلاة والسلام) دەفەرموێ:

﴿ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ (البقرة-١٣١)

واتە: (كاتێك پەروەردگاری پێی فەرموو تەسلیم بە ـ گەردن كـەچ بـە ـ فەرمووی گەردن كەچم بۆ پەروەردگاری جیهانیان).

بەڵام پێویستە باش بزانرێ كە مـل كـەچ بـوون بـۆ خـوای پـەروەردگار (سبحانە و تعالی) هەر بەشتێك و دوو شتان تەواو نابێ. بەڵكو دەبێ سەرەتا جیهانبینی و تێڕوانینی دەربارەی خوای بەدیهێنەر (جلّ و عـلا) و دەربـارەی بوون (الوجود) بەو شێوەیە بێ كە خوای پەروەردگار لە كتێبی خۆیدا ڕوونی كردۆتەوە و پێغەمبەرەكەی ﷺ لە سوننەتی خۆی دا نیشانی داوین، هەروەها دەبێ بـەو شـێوەیە پێناسـەی خـۆت(مرۆڤ) بكـەی كـە خـوای پـەروەردگار فەرموویەتی، وە بەو شێوەیە بڕوانیە ژیان كە خوای پەروەردگار خسـتوویەتە ڕوو، وە بەو شێوەیە تەماشای دۆست و دوژمن وحەڵاڵ وحەرام و چاك وخراپ و ڕاست و هەڵە بكەی كە كتێبـی خوا فەرموویەتی و... هتد. ئـەوە لـە ڕووی جیهانبینی و تێڕوانینەوە.

پاشان: مسوڵمان لە ڕووی ئیمانـــەوە ـ كە بریتیە لە هەڵوێست وەرگرتنی ئیجابییـــانە بەرانبەر بە خوای پەروەردگار و سەرجەم ئەو شتانەی كە خوا (سبحانە وتعالی) فەرمانی پێكردووین ئیمانیان پێ بێنین وبە ڕاستیان بزانین.

ئینجا ئاشكراشە كە ئیمان هێنان بە خواو بە سەرجەم ئەو شتانەی دیكە كە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ تەنها لەسەر بناغەی زانیاریی و شارەزایی پێیان دێتەدی هەربۆیەش دەتوانین بەدڵنیاییی یەوە بڵێین: كەسێك خواناسینەكەی ڕاست وتەواو نەبێت بێگومان ئیمان بەخوابوونەكەشی ڕاست و تەواو نابێت. هەروەها ئیمان بە فریشتەكانی خواو بە كتێبەكانی و بە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام)و بە ڕۆژی دواییش بە هەمان شێوە.. ئەوەش لە ڕووی ئیمانەوە. پاشان لە ڕووی عیبادەتەوە، دەبێ مسوڵمان هەوڵبدات خواپەرستی یەكەی بێ كەم وزیاد بەو جۆرە بێ كە خواو پێغەمبەر فەرموویانەو دیاری یان كردوە، هەروەها لەڕووی ئەخلاق و ڕەوشت و لە ڕووی هەڵسوكەوت ژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتی و... هتدەوە، دەبێ هەوڵبدات لە هەموو ئەو بوارو لایەنانەی ژیانی تاكی و خێزانی وكۆمەڵی دا بە مانای وشە گەردن كەچی و تەسلیم بوون بۆ خوای تێدا بێتەدی و بەرجەستەببێ.

بە كورتی: ئەگەر بتەوێ ئەو مسوڵمانە بی كە خوا دەیەوێ دەبێ:

لە هەموو ژیانتدا بەدەروون و ڕواڵەتت و لە ژیانی تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتیتدا بەوشێوەیە بیریكەیەوە و بژی و بەڕێوەبچی كە خوا و پێغەمبەرەكەی فەرموویانەو دیاری یان كردوە، ئینجا دیارە هەر لێرەشەوە ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەكەوێ كە ئیمان و مسوڵمانەتیی پلە پلەیە و تەنها یەك پلەو حاڵەت نیە، هەر بۆیەش خوای بەرز و مەزن بە پێغەمبەری خۆمان محمد ﷺ دەفەرموێت:

﴿ قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ١٦٣ ﴾ (الأنعام)

واتە: بێگومان نوێژم و قوربانی سەربرینم و ژیانم و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەكانە. هیچ هاوبەشی نین، وە من بەوە فەرمانم پێكراوەو

من یەكەمینی مسوڵمانانم. جا لێرەدا ڕستەی: (وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ) – من یەكەمینی مسوڵمانانم – دوو واتای هەیە:

أ ـ یان مەبەست یەكەمینی مسوڵمانە لە ڕووی زەمەنییەوە واتە پێغەمبەری خوا ﷺ یەكەمین مسوڵمانی ئۆممەتی خۆیەتی.

ب ـ یان لەڕووی پلەو پایەوە، كە دیارە پێغەمبەری خوا (محمد المصطفى) ﷺ یەكەمین مسوڵمانە لەسەر ئاستی هەموو مرۆڤایەتی واتە لـە هـەموو كەس مسوڵمانترو مل كەچ تر بووە بۆ خوای پەروەردگار(تبارك وتعالى).

دیارە هەردوو ماناكەشی هەر ڕاستن، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕووی زەمەنی یەوە پێش هەموو ئوممەتی خۆی كەو تۆتەوە، بەڵام بێگومان پێش هەموو مرۆڤایەتی نەكەوتۆتەوە و لە پێش محمد ﷺ دا هەركام لە((نوح، إبراهيم، موسى، عيسى))و پێغەمبەرانی دیكەش (علهيم الصلاة والسلام) هەبوون و مسوڵمان بوون، وە خوای پەروەردگار (جلّ وعلا) لە قورئانیدا لەســەر زاری هەر كام لەو چوارانەی ناومان هێنان وشـــەی (مسلم)ی بەكارهێناوە[1] . چونكە هەموویان گەردن كەچ (مسلم) بوون بۆ خوا، بەڵكو ئەو دین و بەرنامەی كە خوای پەروەردگار بۆ هەموو پێغەمبەرانی (عليهم الصلاة و السلام) ناردوە بریتی بووە لە ئیسلام. وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ﴾ (آل عمران –١٩). كە بێگومان لێرەدا مەبەست لە

---

(١) (نوح) فەرموویەتی: ﴿... وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ (يونس ـ٧٢) . وە (إبراهيم) فەرموویەتی: ﴿ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ...﴾ (البقرة ـ١٢٨) ، وە (موسى) فەرموویەتی: ﴿ ... يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ﴾ ( يونس ـ٨٤)ـ (عسى) ش (عليه السلام) حەوارییەكانی پێیان فەرمووە: ﴿.. قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللّهِ آمَنَّا بِاللّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ (آل عمران ـ٥٢) .

وشەی (إســـــلام) تەنها دینی (محمــد) ﷺ نیە بەڵكو (دین) لەلای خوای پەروەردگار (جلَّ وعلا) بە رەهایی (مطلق)ی بریتیە لە(مل كەچیی بۆ خوا). بەڵێ ئیســـــلام دینی هەموو پێغەمبەران بووە بەلاّم هەركام لە پێغەمبەران (علیهم أفضل الصلوات واتم التسلیمات) بەرنامە و پەیڕەوێكی تایبەتی بۆ هاتوە كە پڕ بەپێستی ئەو واقیع و كۆمەڵگایە بووە كە تێیدا بووە، بەلاّم لە بنەما سەرەكیەكان وهێڵە گشتیەكان دا دینی هەموو پێغەمبەران یەكێكە كە بریتیە لە ئیسلام (مل كەچیی بۆ خوا). هەر بۆیەش دروست نیە بگوترێ: (دینە ئاسمانیەكان)و زاراوەی (الأدیان السماویة) هەڵەیەو لە قورئانیشدا وانەهاتوە، وە خوای پەروەردگار نەی فەرمووە بۆ هەر كامێكتان دینێكمان داناوە بەڵكو فەرموویەتی : ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ (المائدة ـ٤٨)، (بۆ هەر كامێكتان شەریعەتێك و بەرنامەیەكمان داناوە). هەروەها بە بەڵگەی ئەو ئایەتەش خوای پەروەردگـــــار دەفەرموێ:

﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ...﴾ (الشورى ـ١٣).
واتە ئەوەی كە لە (دین)دا ـ واتە: دینی حەق- بۆی كردوونە بەرنامە هەمان شتە كە (نوح)مان پێ ڕاسپارد بوو، وە ئەوەی كە بۆ تۆمان ناردوە لەڕێی ی وەحی یەوە، وە ئەوەی كە (إبراهیم)و (موسى)و (عیسى)مان پێ ڕاسپاردبوو، كە (دین) بەرپا بكەن و تێیدا پەرتەوازە و بەش بەش مەبن ـ

كەواتە: ئەو دینەی كە بۆ پێغەمبەری كۆتایی و ئۆممەتەكەی نێرراوە لـە نێوەرۆكی دا هەرهەمان دین و بەرنامەیە كە بۆ هــەركام لـە پێغەمبــەرانی هەرە ناودار و پایەبەرزی خوا{نوح و إبراهیم و موســی و عیســی} (علــیهم الصلاة والسلام) ڕەوانە كراوە و پێــی ڕاسپێرراون كە جێ بەجێــی بكەن، بەلاّم

بێگومان لە وردەكاری دا بەئەندازەی جیاوازیی نێوان ژینگەو هەل و مەرجە جۆراو جۆرەكانی كۆمەڵگاو میللەتەكانیان جیاوازیی یان هەبووە.

ئێستاش ئەوەی كە بە گشتی لەڕابردوودا گوتمان دەربارەی پێناسەی مرۆڤی مسوڵمان هەوڵ دەدەین لە نۆ (٩) خاڵان داو بەشێوەیەكی ڕوونتر بیخەینەڕوو:

**یەكەم: مسوڵمان ئەو كەسەیە كە بۆ خوا ملكەچە و لەسەرجەم بوارو لایەنەكانی ژیان و گوزەرانی دا بەدین وبەرنامەی خواوە پابەندە و گەردن كەچی یاساو ئاڕاستەكانیەتی:**

كەواتە: كەسێك كە لە مزگەوتێ مسوڵمانەتیی و دینداریی دەكات و ڕوو لە خوایە، بەلاَم لە مەیدانی بازاڕ و كار وكاسبی، یان حوكم و سیاسەت، یان نیشتیمان پەروەریی و نەتەوایەتی یان.. یان.. هتد دا لە ئیسلام و دەستوور و یاساكانی لادەدات و ڕوو لەغەیری خوا دەكات. ئەوە بێگومان بە ئەندازەی لە ئیسلام لادان و لە شەریعەت دوور كەوتنەوەكەی نیشانەی پرسیار(؟) لەسەر مسوڵمانەتیی و دینداریی و خواپەرستی یەكەی پەیدادەكات، چونكە ئینسانی مسوڵمان تەنها بەئەندازەی ئەوە مسوڵمان و دیندار و خواپەرستە كە بەشەریعەتی خوای دادگەرو كاربەجێ وە پابەندە و بۆ خوا گەردن كەچە! جا كەسێكی وا كە لە مزگەوتدا سەجدە و ڕكووع بۆ خوا دەبات، بەلاَم لە دائیرەو بازاڕو مەیدانەكانی حوكم و سیاسەت و جم و جۆڵ و چالاكییەكانی دیكەیدا پشت لە خوا و دین و شەریعەتەكەی دەكات، ئەوە مانای وایە بابایەكی وا بۆ خوا گەردن كەچ (مسلم) نیە! جا لێرەوە دەتوانین بڵێین: كە مسوڵمانی تەواو هەیە كە لە هەموو لایەنەكانی ژیانی دا بۆ خوا مل كەچە، هەروەها نیوە مسوڵمان و سێ یەكە مسوڵمان و بگرە دەیەكە مسوڵمانیش

هەیە!! وە بێگومان خوای پەروەردگار وای لە ئێمە خواستوە كە مسـوڵمانی تەواوبین و بەتەواوی مل كەچی خوا بین وەك فەرمووویەتی:
﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾ (البقرة ـ ٢٠٨) .

(واتە ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بە تەواویی گەردن كەچیی خـوا بـن (واتە بە هەموو یاساكانی یەوە پابەند بن) وە مەكەونە شوێن هەنگاوەكانی شەیطان چونكە بێگومان ئەو بۆ ئێوە دوژمنێكی ئاشكرایە)).

جا دیارە بەهۆی شوێنكەوتنی شەیطان و ڕێچكە و بیدۆزەكانی یەوە ئینسـان لە شەرع لادەدات و دووچاری خلیسكان و سـەرگەردانی دەبـێ بۆیـە. پـاش فەرمان كردن بە مسوڵمانەتیی تێرو تەواو فەرموویـەتی: وەمەكەونـە دوای هەنگاوەكانی شەیطان!

دووەم: مسـوڵمان ئەو كەسەیە كە فەرمانبەریی خوا (تبارك و تعالى)و پێغەمبەری خوا ﷺ دەكات .

خوای پەروەردگار لەو بارەوە دەفەرموێت:
﴿ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ (الأحزاب ـ ٧١)

واتە: (هەر كەسێك فەرمانبەری خوا و پێغەمبەری خوا بكات ئـەوە بـە سەركەوتنێكی گەورە سەركەوتوە و بـەمراد گەیشـتنێكی گـەورە بـە مـراد گەیشتوە و سەرفیراز بوە) هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ (النساء ـ ٥٩) .

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە گوێڕایەڵیی خوا و گوێڕایەڵیی پێغەمبەر ﷺ بکەن و وەهی کار بە دەستانێك کە لە خۆتانن ﴿ وشەی (أَطِيعُواْ)ی بۆ (اولي الامر) دوبارە نەکردۆتەوە چونکە فەرمانبەریی مسوڵمانان بۆ کاربەدەستان و مشور خۆرانیان بەمەرجی پابەندیی کاربەدەستان و مشورخۆرانیانە بە دینی خواو پێغەمبەری خواوە ﷺ﴾ وە ئەگەر لەگەڵ کاربەدەستان و مشور خۆرانتان کەوتنە کێشەو مشت ومڕێکەوە ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خوا وە پێغەمبەری خوا ئەگەر ئیمانتان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، بێگومان ئەوە چاکترەو سەرەنجامیشی باشترە. کەواتە: کەسێك فەرمان بەریی خواو پێغەمبەری خوا نەکات مانای وایە ئیمانی نیە بە خواوە بە ڕۆژی دوایی. وە لەڕاستییدا ئێمە بە ئەندازەی فەرمان بەریی کردنمان بۆ خواو پێغەمبەری خوا، مسوڵمانین وە بە ئەندازەی سەرپێچیی کردنمان لە خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ نامسوڵمانین و لە ئیسلام دوورین.

دیارە فەرمانبەرییش بۆ خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ لە پابەندییمان بە قورئان و سوننەت دا دەردەکەوێ جا لێرەدا جێگەی سەرنج و لێ وردبوونەوە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار وشەی (إطاعة)ی بۆ خۆی و پێغەمبەر بەکارهێناوە بەڵام وشەی (إسلام) گەردن کەچی و تەسلیم بوونی تەنها بۆ خۆی بەکارهێناوە هەروەها هەرکام لە وشەکانی (عبادة) و(تقوى)ش.

وەك فەرموویەتی:﴿ بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ﴾ (الزمر-٦٦)، ﴿... وإِيَّايَ فاتقون﴾ (البقرة-٤١) چونکە ئێمە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەین بەڵام نایپەرستین، بۆیەش گوێڕایەڵی دەکەین چونکە فەرمانی خوامان پێ ڕادەگەیەنێ، هەروەها گوێ ڕایەڵی کاربەدەستانێك دەکەین کەلە سەر ڕێبازی پێغەمبەرن ﷺ بەڵام نایانپەرستین، چونکە پەرستن تەنها بۆ خوای پەروەردگارە و تەنها شایستەو لایەقی ئەوە، ئینجا

دیارە پێغەمبەریش ﷺ خەڵكی هەر بۆ ئەوە بانگ كردوە كە خوا بپەرستن، وەك چۆن هەركام لە {نوح و هود و صالح ولوط و شعیب} (علیهم الصلاة والسلام) هەموویان بەیەك دەنگ فەرموویانە:﴿ فَاتَّقُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ (الشعراء -١٠٨،١٢٦،١٤٤،١٦٣،١٧٩) ، واتە: (پارێز لە خوا بكەن و گوێڕایەڵی من بكەن) كەواتە پەرستن و پارێز لێكردن و بۆ تەسلیم بوون بەس بۆ خوایە، بەلام گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی وێڕای خوا (عزَّوجلَّ)بۆ پێغەمبەریشە ﷺ و بۆ هەر كەسێكی دیكەشە كە لە سەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا دەڕوات.

## سێیەم: مسوڵمان ئەو كەسەیە كە خاوەن ئیمان بێت:

خوای پەروەردگار دەفەرمویّ:

﴿أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ آمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ ﴾ (النساء -١٣٦).

واتە (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ئیمان بێنن بە خوای پەروەردگار و بە پێغەمبەری خوا).

دیارە حیكمەت و هۆی ئەو جۆرە تەعبیرەش -كە بەڕواڵەت (تحصیل الحاصل)ە- ئەوەیە كە ئیمان تەنها پلەیەكی نیە، بەڵكو چەندان پلەی هەیە.

بۆ پێناسەی ئیمانیش بە كورتی دەڵێین: ئیمان بریتیە لەو حەقیقەتە شەرعییەی كە دەبێ لە هەموو كیان و بوونی ئینساندا سەقامگیر ببێ. كە ئەویش لە چوارشتان پێك دێ، چونكە ئینسان چوار جۆرە هێزی هەیە:

١- هێزێكی مەعریفی و(إدراكي) هەیە كە بریتیە لە عەقڵ.

٢- هێزێكی بڕیاردان و ئیرادەیی هەیە بریتیە لە دڵ.

٣- هێزێكی دەربڕین و(بَياني) هەیە كە بریتیە لە زمان یان نووسین.

٤- هێزێكی كرداری و(تَنفيذي) هەیە كە بریتیە لە ئەندامەكان.

جا ئیمانیش دەبێ بە هەركام لەو چوار هێزانە بهێنرێتە دی و ئاشكرا و بەرجەستە بكرێ:

دەبێ ئینسان سەرەتا بە عەقڵ خوای پەروەردگار بناسێ و بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگارێتی خوای پەروەردگار و ناو و سیفەتەكانی (الأسماء والصفات)ی بزانێ لەسەر بناغەی مەعریفەتێكی ڕاست و دروست ئیمان بە خوا و بە پێغەمبەری خواو بەو شەریعەتەكە لە خواوە هێناویەتی بێنێ وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەكەوێ، كە پێغەمبەر ﷺ تێیدا دەفەرموێ (ذاقَ طعم الأيمان مَنْ رضي بالله رباً وبالإسلام ديناً وبمحمد ﷺ رسولاً) رواه مسلم عن عباس بن عبدالمطلب.

واتە: (تامی ئیمانی چێشتوە هەر كەسێك كە بە پەروەردگارێتی خوا ڕازی بووبێ، وە بەبەرنامەیێتی ئیسلام ڕازی بووبێ, وە بەڕەوانەكراوێتی (محمد) ﷺ ڕازی بووبێ).

جا بەڕێزان!

زۆر جار هەندێك شت لە لایەن كەسانێكی خۆ بەزانا زانەوە دەگوترێ كە پێچەوانەی ئەلف و بێ و سەرەتاكانی ئیسلامە، بۆ نموونە دەگوترێ: مسوڵمان ئەو كەسەیە كە بڵێ من مسوڵمانم جا هەر كەسێك بێ! نەخێر... بێگومان خوای پەروەردگار نەی فەرمووە هەر كەسێك ئیددیعای مسوڵمانەتی بكات ئەوە مسوڵمانە!! بەڵكو فەرموویەتی:

﴿ لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ

الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَـئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾

(البقرة ـ١٧٧).

وشەی (البـرّ) واتە چاكەكاریی و مسـوڵمانەتیی و دینـداریی، كەواتـە مانای ئەم ئایەتە كەبە ئایەتی (البـرّ) ناسراوە و دەتوانین بڵێین گشتگیرترین ئایەتە بۆ مەبەستەكانی قورئان لە قورئانیێ دا ئاوایە: چاكەكاریی ودینداریی بریتی نیە لـە ڕوو كردنـە لای ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا، بـەڵكو چـاكەكاری و مسوڵمانەتیی ـ هەڵوێستی كەسێكە و ـ ئەوەیە كـە ئیمـان بـەخوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەكان و كتێب و پێغەمبەران بـێنێ و مـاڵ و سـامان لەگـەڵ خۆشـویستنیشی دا ببەخشـێ بـەخزمان و هـەتیوان و نـەداران و ڕێبـوار و سواڵكەران و كۆیلان، وە نوێژێ بەرپابكات و زەكاتێ بدات وە وەفـادارن بـە بەڵێنیان كاتێك بەڵێن دەدەن. وە خۆڕاگران لە كاتی نەداریی و نەخۆشی و لە كاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا. ئائەوانەن ئەوانەی كە ڕاستیان كردوە ـ لە مسوڵمانەتیی یان دا ـ وەهەر ئەوانەشن پارێزكاران.

وەك دەبینین خوای زاناو شارەزا (عزَّوجلَّ) لەم ئایەتە بەپیزەدا:

١- پێنج پایە بنەڕەتییەكانی ئیمان.

٢- شەش جۆرە ماڵ بەخشین، یان ماڵ بەخشین بەشەش جۆرە كەس.

٣- بەرپا كردنی نوێژ.

٤- زەكات دان.

٥- بەڵێن بردنە سەر.

٦- خۆڕاگریی لە هەر سێك حاڵەتی نەداریی و نەخۆشـیی و جـەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە، دەخاتە ڕوو كە سەرجەم حەڤـدە (١٧) سـیفەتن و

بوارەكانی: ١- ئیمان و عەقیدە. ٢- ئابووریی . ٣- ڕووحیی .
٤- كۆمەڵایەتیی . ٥- خوو و ڕەوشت . دەگرنەوە .

كەواتە: تەنها كەسێك بەچاكەكار ودیندارو مسوڵمانی چاك لەقەڵەم دەدرێ كەهەموو ئەو حەڤدە سیفەتەی تێدا بن و لە تێكڕای ئەو پێنج بوارە سەرەكییەدا پابەندی شەریعەت و بەرنامەی خوای پەروەردگار بێت!

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە كەتەنها كەسێك بە مسوڵمان و دینداری ڕاستەقینە دادەنرێ كە خاوەنی ئەو حەڤدە سیفەتە بێت جگە لە ڕواڵەتیی مانای ئایەتەكە. ئەوەیە كە خوای پەروەردگار لە كۆتایی ئایەتەكە و پاش سەر ژمێری ئەو سیفەتانە فەرموویەتی:

﴿أُولَـئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾ واتە: (ئائەوانە ڕاست دەكەن (لەچاكە كاریی و مسوڵمانەتیی یان دا) وە ئەوانەن پارێزكاران) كەواتە كەسێك وانەكات بە ڕاستگۆ و پارێزكار لە قەڵەم نادرێ و ناش پارێزرێ لە سزاو تۆڵەی خوای پەروەردگار.

كەواتە: مەبەست لە ئینسانی مسوڵمان ئەو كەسەیە كە ئیمانی هەبێ، واتە: بەعەقڵ دەركی ڕاستییەكانی ئیسلامی كردبێ وە بەدڵ بڕوای پێیان هەبێ و قبووڵی كردبن و بۆیان تەسلیم بووبێ و بەزمان دانی پێدا هێنابن و بە ئەندامەكانیشی ئەنجامیان بدات. هەر بۆیەش زانایانی ئیسلام ئیمانیان هەر بەو جۆرە پێناسەكردوە و گوتوویانە: (الأيمان قولٌ وعملٌ، قَولُ القَلْبِ واللِّسان وعَمَلُ القَلْب والجوارح) (بُخاري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ گوتوویەتی: ئەو جۆرە پێناسەیەی ئیمانم لە زیاتر لە هەزار زانا بیستوە، (ئیمان بریتیە لە قسەو كردەوە، قسەی دڵ و زمان و، كردەوەی دڵ و ئەندامەكان).

دیاره مەبەست لە (قسەی دڵ و زمان) زانین (معرفة) و بەڕاست زانین (تصدیق)ی دڵ و دان پێداهێنان (إقرار)ی زمانە، وە مەبەست لە كردەوەی دڵ (عمل القلب) خۆشویستن و پێڕازی بوون و تەسلیم بوونی بە دڵ، مەبەستیش لە كردەوەی ئەندامەكان (عمل الجوارح) بریتیە لە جێ بەجێ كردنی ئەندامەكان.

**چوارەم: مسوڵمان كەسێكە كە بەندە (عابد) بێ بۆ خوا، واتە خوا پەرست بێ :**

وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿إياك نعبد وإياك نستعين﴾ (الفاتحة ـ٥)

لێرەدا خوا (عزَّوجلَّ) لە سەر زمانی بەندەكانی خۆی دەفەرموێ: (تەنها تۆ دەپەرستن وە داوای یارمەتیش تەنها لە تۆ دەكەین) ئەوە فەرموودەی خوایە لەسەر زمانی بەندەكانی بۆ گەورەترین ڕوكنی دینەكەیان كە نوێژە! كەواتە: مسوڵمان دەبێ تەنها خوا بپەرستێ: كە بەداخەوە وشەی پەرستن (عبادة) واتا و مفهومەكەی لە مێشك و زەینی خەڵكیدا یەكجار بچووك كراوەتەوە و زۆربەی خەڵكی چەمكی وشەی پەرستن تەنها لە هەندێك دروشمی مسوڵمانەتیی دا دەبینن وەك: نوێژو ڕۆژوو و ركووع و سەجدەو دوعا و پاڕانەوە و قوربانی سەربڕین و نەزرو هاوار تێ بەستن[1] !.

كە لە قورئاندا وانیە، وە لەزمانی عەرەبیشدا ئەوە ماناكەی نیە.

---

(١) ئەو شتانە هەندێكن لە دروشمەكانی خواپەرستیی (شعائر العبادة) كە هەندێك لە زانایان زاراوەی خوا پەرستییە پووتەكان (العبادات المحضة) یان بۆ بە كارهێناون.

ئەسڵی مانای وشەی عیبادەت لە (عَبَدَ) ەوە هاتوە واتە: گـەردنی کـەچ کردن، چونکە دەگوترێ: (طريقٌ مُعَبَّدٌ) واتە: (ڕێگەیەکی هەموار و تـەخت کراو) چونکە ڕێگە ئەگەر خەڵكی زۆر بەسەری دا هات و چوو گرێی تێـدا نامێنی و تەخت دەبێ، یـان دەگـوترێ: (بعيـرٌ مُعَبَّـدٌ) واتـە: حوشـترێکی ڕامكراو کە بە حوشـترێکی قەتران تێهەڵسووەراو دەگوترێ، چونکە: حوشتر کاتێك نەخۆشی خوروو دەگرێ ئەگەر قەترانی تێ بدەی خورووەکەی دەشکێ و دادەمرکێ، کەواتە بەندە (عبد) لەزمانی عەرەبی دا کەسێکە کە گرێی تێدا نەمابێت و تەخت و هەموار بووبێ لە بەرانبەر خوادا یان لەبەرانبەر غەیری خوادا، ئنجا ئەگەر تەماشای بەکارهێنانی قورئانیش بکەین بۆ وشەی (عبد) دەبینین هەروایە، بۆ نموونە (فرعون) کەمنەت لەسەر (موسى) دەکات دەڵێ:

﴿ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ (١٨) وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ (١٩) ﴾ الشعراء .

واتە (ئەدی ئێمان ـ ئەی مووسا! لە ماڵی خۆمان دا بەمنداڵی پەروەر نەکرد؟! وەبۆماوەی چەندان ساڵ لە نێومان دا مایەوە؟! کەچی دوایی چـووی ئەو کەتنەشت کرد – واتە نەفەرێکت کوشت- وە تۆ لـە کەسـانی سـپڵە و ناسپاس بووی.

مووساش (عليه السلام) ئاوا وەڵامی فیرعەون دەداتەوە:

﴿ قَالَ فَعَلْتُهَا إِذًا وَأَنَا مِنَ الضَّالِّينَ (٢٠) فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْمًا وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُرْسَلِينَ (٢١) وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ (٢٢)﴾ الشعراء .

واتە: گوتی: کاتێك من ئەو کەتنەم کرد کەمن لەگومڕاو سەر گەردانان بووم، جا کاتێـك لێتـان ترسـام لەچـەنگتان ڕام کـرد. ئیـدی پـەروەردگارم

حیکمەتی پێ بەخشیم و گێڕامی لەڕەوانەکراوان. ئنجا ئەو چاکەیەش کەمنەتی پێ لەسەرمن دەکەی لە سۆنگەی ئەوەوە بوو کە بەنی ئیسرائیلت کردبووە بەندە و ژێر دەستی خۆت.

دیارە مووسا (علیه‌السلام) لێرەدا وەڵامی قسەی دووەمی فیرعەون کە باسی کوشتنی کابرای قیبطی‌یە پێش دەخات و لێرەدا هیچ بەرگری یەکیش لە خۆی ناکات بەڵکو یەکسەر دان بەهەڵەی خۆی دا دێنێ، بەڵام هەڵەکەی بەوە پاساو دەداتەوە کە ئەو کاتە کە ئەو کابرایەی لەدەست کوژراوە نەك هەر پێغەمبەر نەبووە بەڵکو هەر لەڕیزی ئیمانداریش دا نەبووە و سەرگەردان و گومڕا بووە، وەك لەشوێنێکی دیکەش دا لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿قَالَ هَذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ (١٥) قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي ... (١٦)﴾ القصص.

واتە: گوتی: ئەمە ـ کوشتنی کابرای قیبطی ـ لەکردەوەی شەیطانە بێگومان ئەو دوژمنێکی گومڕاکەری ئاشکرایە. گوتی : پەروەردگارم ستەمم لە خۆم کرد جا لێم ببورە ..

پاشان دێتە سەر وەڵامدانەوەی قسەی یەکەمی فیرعەون و دەڵێ :

ئەو چاکەیەش کە لە سەرمی دەکەیە منەت و بەچاوم دا دەدەیەوە ـــ کە بریتیە لە بەخێوکرانم لە ماڵی ئێوە دا ـــ لە سۆنگەی ئەوەوە بوو کەتۆ گەلی بەنی ئیسرائیلت کردبوو بە ژێر دەستەی خۆت. واتە ئەگەر گەلەکەمت ژێردەستە نەکردبایە و نەتکردبایە بەندە و کۆیلەی خۆت و نێرەوەزەکانیانت سەر نەبڕیبایە ئەوە دایکم ناچار نەدەبوو کە من بخاتە تابووتێکەوە لە ترس و بیمی سەر بڕان بە ئاوێم دابدات!

كەواتە : ئەوەی كە تۆ ئەی فیرعەون! بە نیعمەت و چاكەی دەزانی لە ڕاستی دا بریتیە لە نیقمەت و خراپە و لە جیاتی منەت لە سەر كردن دەبوایە داوای لێبوردنم لێ بكەی!

ئنجا لێرەدا پێویستە ئەوەش بگوترێ كە مووسا (علیە السلام) لە كوشتنی كابرای قیبطی دا تاڕادەیەك هەقی بە دەستەوە بووە چونكە :

١- كابرای قیبطی ستەمكار بووە و دەست درێژی كردۆتە سەر كابرای بەنی ئیسرائیلی و ئەویش هاواری تێ بەستوەو داوای هاوكاری لێكردوە :

﴿ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ ..﴾ (القصص-١٥) .

٢- ئنجا نەبۆتە عادەتیش ئینسان بە مستێك بمرێ و تەخت بێ!

جا لێرەدا شاهید ئەوەیە كە مووسا (علیەالسلام) دەفەرموێ : ﴿أَنْ عَبَّدْت بَنِي إسرائيل﴾ چونكە خۆ بێگومان (بنی إسرائیل) سەجدە و ڕكووعیان بۆ فیرعەون نەبردوەو نوێژیان بۆ نەكردوە و ڕۆژوویان بۆ نەگرتوە! بەڵكو تەنها بۆی مل كەچ بوون و سۆغرەو بێگارو كاری قوڕسی پێكردون، هەتا هەندێك لە مێژوو نووسان دەڵێن : ئەو هەڕەمانەی میسر هەر بەو خەڵكە چەوساوانە دروست كراون!

كەچی وشەی (عَبَّد)بۆ پێناسە كردنی ئەو ملكەچی و ژێر دەستەیی یە بە كارهێنراوە ، كەواتە هەر كەسێك كەسێكی دیكەی خستە ژێر ڕكێفی خۆیەوە ئەوە (تعبید)ی كردوە، وە هەر كەسێك ملی بۆ كەسێك یان لایەنێك كەچ كرد ئەوە جۆرێك لە بەندایەتی بۆ تەنجام داوە .

هەروەها لە سوورەتی (المؤمنون)دا خوای پەروەردگار لەسەر زمانی فیرعەون وداورودەستەكەی فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَى وَأَخَاهُ هَارُونَ

بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ (٤٥) إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا عَالِينَ (٤٦) فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ (٤٧)﴾

واتە: پاشان موسا و هاڕوونی براێمان بە نیشـــــانەكانمان و بەڵگەیەكی ئاشكراوە نارد بۆ لای فیرعەون و داروودەستەكەی، بەڵام ئەوان خۆیان بەزلگرت وكەسانێكی لووت بەرزبوون. جا گوتیان: ئایا بۆ دوو بەشەران ئیمان بە خوا بێنین لەحاڵێكدا كە گەلەكەشیان پەرستار(عابد)ی ئێمەن؟! ئاشكراشە كە مەبەستی فیرعەون و داروودەستەكەی بەوشەی (عابدون) ئەوەیە كە بۆمان مل كەچـن. شایانی باسیشـــــە كە بەهەڵە لێتێگەیشتنی چەمك و واتای وشەی (عبادة) ئاكامی زۆر خراپی بووە، چونكە كەسی واهەیە كە لەلایەكەوە دوو ڕكات نوێژی بێ ڕووح بۆ خوا دەكات بەڵام لەولاشەوە هەموو ژیانی لە پێناو طاغووت و فیرعەونێكدا بەپێی ڕێبازێكی كافرانە دەگوزەرێنێ، كەچی پێشی وایە كە (عابِد)ە بۆ خوا...!! نەخێر بەڵكو (عابد)ە بۆ ئەو طاغووت و فیرعەونە كە هەموو ژیانی خۆی بۆی تەرخان كـــردوە و بە بەرنامەكەیەوە پابەندبووە، ئنجا خوای پەروەردگار نەی فەرمووە نەخێر (بنی إسرائیل) عابید نەبوون بۆ فیرعەون، چونكە لە واقیع دا بۆی مل كەچ بوون. بەڵام ئەوەندە هەیە (بەنی ئیسرائیل) لەسەر ئەو مل كەچیی و ژێر دەستەیی یە یان گوناهبار نەبوون، چونكە ناچار كراون و بە ئیختیاری خۆیان نەبووە، بەڵام بێگومان كەسێك بە ویستی خۆی بۆ غەیری خوا مل كەچ بێت ئەوا لەسەری گوناهبارەو ماناى وایە خوای نەپەرستوە بەڵكو ئەو لایەنە یان ئەو كەسەی پەرستوە كە بۆی مل كەچ بووە كورتەی قســـــان: وشەی (عبادة) لە تەسڵی زمان و بەكارهێنانـــی قورئان دا بە مانای ملكەچییـــە جا مل كەچی ئێمەی مسوڵمان بۆ خوا دەبێ مل كەچییەكی تێرو تەواو بێ و دەبێ بەدڵ و عەقڵ و

زمان و ئەندامەكان بیو لە گشت بوارەكانی تاكیی و خێزانیی ، كۆمەڵایەتیی و سیاسیی و... هتد دابێ و، هەموو سەرتاپای ژیانمان دابگرێ، ئەوجار ڕاست دەكەین كە دەڵێین بەس تۆ دەپەرستین﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ ﴾ چونكە لێرەدا بەركار (مفعول بە) پێش بكەر (فاعل) كەوتوە بەپێچەوانەی حاڵەتی ئاسایی لە جیاتی بگوترێ دەتپەرستین (نعبدك) گوتراوە، ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ ﴾ (بەس تۆ دەپەرستین) ئنجا ئایا كەی خوا بەتەنهاو بێ هاوبەش دەپەرسترێ... ؟! كاتێك كە ئینسان دەروون ودەری و هەموو ژیانی بەپێی شەریعەت و بەرنامەی خوا بەڕێوەبچێو لە سەرتاپای هەڵسوكەوت و قسەو گوتار و هەست ونەستەكانی دا بۆی مل كەچ و تەسلیم بێت، كەواتە: مسوڵمان ئەو كەسەیە كە عابید و ملكەچ بێ بۆ خوا وە مل كەچییەكەشی لەوەدا دەردەكەوێت كە پابەند بێ بەشەریعەتی خواوە و پەیڕەوی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكات.

**پێنجەم: مسوڵمان ئەو كەسەیە كە پارێزكار بێ بۆ خوا.**

خوای پەروەردگار لە سەرەتای سوورەتی (البقرة)وە هیدایەتی خۆی تایبەت دەكات بە پارێزكارانەوە و دەفەرموێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم ، الم (١) ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ... (٢)﴾ .

واتە: ئەلیف لام میم . ئەو كتێبە گومانی تێدا نیە كە ڕێنماییكەر و ڕێ پیشاندەرە بۆ پارێزكاران پارێزكاریی (تقوی) یانی چی....؟؟.

پارێزكار (مُتَّقِي) كەسێكە كە پارێز بكات لە خـوا (عزَّوجـلَّ) ، چـونكە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وإِيَّايَ فاتقون﴾ (البقرة ـ ٤١)

واتە: وە تەنها پارێز لە من بكەن.

دیارە پارێز لە خوا كردنیش داخوازی ئەوە دەكات كە لە هەموو كەس و هەموو شتێك زیاتر لێی بترسی و لە هەموو كەس و شتێكت پتر خۆش بوێ و ڕێزی لێ بگری و بەگەورەو مەزنی بگری.

ئاشكراشە هەر كەسێك بەڕاستی خوای خۆش بوێت و لێی بترسێ و سامی لێ بكات و بە گەورەو مەزنی بگرێ، سەرپێچی لێناكات و ئەو قەدەغانە ناشكێنێ كە خوا دیاری كردوون و ئەو ئەرك و فەرزانەش ناچوێنێ كە خوا فەرزی كردون. وەك یەكێك لە زانایان دەڵێ: (التقوى هو أن لايجدك الله حيث منعك وأن لا يفتقدك حيث أمرك) .

واتە: (پارێزكاریی ئەوەیە كە خوای پەروەردگار لەو شتانەدا نەتبینێ كە لێی قەدەغەكردووی و، لەوشتانەشدا كە فەرمانی پێكردووی دوانەكەوی و غاییت نەدات!

كەواتە: پارێزكاریی (تقوی) هەموو ئەركەكانی ئیسلام كۆ دەكاتەوەو هەموو یاساكانی شەریعەت دەگرێتەخۆی.چونكە بابای پارێزكار(متّقي):

١- لە ڕووی (بیروباوەڕ)ە وە دەبێ لە كوفرو هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)و لە دەغەڵیی (نفاق) و ڕیابازیی دووربێ.

٢- وە لە ڕووی عیبادەتەوە دەبێ لە داهێنان (بدعة) و لادان (إنحراف) و پەرستنی غەیری خوا دوور بێت .

٣- وە لە ڕووی ئەخلاقییەوە پێویستە لە ئاكارەپەستەكان (رذائل) دوور بێ و وە خۆی بە خەسڵەتە بەرزەكان (فضائل) برازێنێتەوە .

٤- وە لە ڕووی مامەڵەو بازرگانییەوە پێویستە لە غەش و خیانەت و مامەڵەی ناشەرعی خۆی بە دوور بگرێ.

٥- لە ڕووی (سیاسی)یەوە، لەوە دور بێ کە بەدوای غەیری سیستەمی ئیسلام بکەوێ .

هەروەها لە ڕووی ئابووری، کۆمەلآیەتی،...هتدوەش بە هەمان شێوە .

کەواتە پارێزکاریی (تقوی) ئەوەیە کەتۆ بە هەموو شێوەیەك پابەند بی بە ئایین و بەرنامەی خواوە و هەموو ئەرك و واجبەکان بەپێ ی توانا جێبەجێ بکەی و سەرجەم ئەو شتانەش کە خوای پەروەردگار قەدەغەی کردوون لێیان دوور بی و توخنیان نەکەوی.

جا ئەوەش هەموو پلەیەکە لە پارێزکاریی(تقوی)و، پلەی بەرزتر و باشتر لەوەش ئەوەیە کە سەرجەم ئەو شتانەش کە خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی ﷺ بە سوننەت و پەسندیان داناون(١) ، جێ بەجێیان بکەی وە هەموو ئەو شتانەش کە بە ناپەسەند (مکروه) یان داناوە خۆیان لێ بەدوور بگرێ .

**شەشەم: مسوڵمان ئەو کەسەیە کە چاکەکار بێ:**

وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوا وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾ (النمل-١٢٨) .

واتە: (بێ گومان خوا لەگەڵ ئەوانە دایە کە پارێز دەکەن و لەگەڵ ئەوانە دایە کەچاکە کارن).

هەروەها فەرموویەتی : ﴿وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ (البقرة-١٩٥)

واتە: وە چاکە بکەن بێگومان خوا چاکە کارانی خۆش دەوێن.

---

(١) کە ( المندوبات ) یان ( المستحبّات ) یان پێ دەگوترێ

یان دەفەرمویٚ: ﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً﴾ (البقرة ـ٨٣) .

واتە : وە قسەی چاك بە خەڵكی بڵێن.

ئەوەی كە گرنگە ئەوەیە كە ئێمە بزانین مسوڵمان لەبەر ئەوەی كە چاكە، هەم دڵی پاك و چاكەو هەم زمانی هەر بە چاكە دەگەڕێ و هەم ئەندامەكانیشی هەر بۆ چاكە دەگەڕێن!

بەڵێ ئینسانی مسوڵمان و خواپەرست بێجگە لە خێر و چاكە هیچی دیكەی لە دڵدا نیە بەرانبەر بە هیچ كەس، تەنانەت بەرانبەر بە دوژمنانیشی، وە مسوڵمان جگە لە چاكە لە سەر زمانی جاری نابێ و نە بە ئەندامەكانیشی جگە لە چاكە جێ بەجێ دەكات و نە لە دڵیشیدا جگە لە چاكە جێدەكاتەوە .

بە كورتی: مسوڵمان چاكەكار(محسن)ە و چاكەكاریش بە پێی تەرازووی خوا ئەو كەسەیە كە بە دوای شەرعی خوا دەكەوێت.

وەكو لە وەلاَمی پرسیارێكدا كە لێیان پرسیم:.

ئایا ئێوە توند ڕەون یان نەرم ڕەو؟!

گوتم ئێمە هیچ كامیان نین! گوترا: چۆن ؟!

گوتم : چونكە ئێمە بە دوای شەرع دەكەوین و شەرع ڕەوین و بەگوێرەی فەرمانی شەرع نەرم یان توند دەبین، هەرحاڵەتە لە كاتی خۆی دا.

كەواتە: ئێمە چاكەكارییەكەشمان هەر لەوەدا دەبینینەوە كە بە پێی شەرع مامەڵە لەگەڵ خواو خەڵك و دەورو بەرمان دا بكەین.

١- لەگەڵ خوای خۆماندا (عزَّ وجلَّ) چاكە كارین و چاك دەی پەرستین ـ چونكە پێغەمبەرﷺ لە یەكێك لە پێناسەكانیدا بۆ (إحسان)

دەفەرموێ: ((أن تعبد الله كأنك تراه فأن لم تكن تراه فأنه يراك)) (رواه مسلم) عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه.

واتە: چاكەكاریی ئەوەیە كە بە جۆرێك خوا بپەرستی كە دەیبینی، ئنجا بێگومان ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەوە ئەو تۆ دەبینی.

كەواتە: لەم فەرمایشتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ چاكەكاریی (إحسان) بە بەشێكی هەرە گرنگی چەمك و واتایەكەی تەفسیر كردوە كە بریتیە لە چاك خوا پەرستن و باش بەندایەتی بۆ كردن، ئەویش بریتیە لەوە كە ئینسان بە یەقینەوە خواپەرستیٚ و لە حاڵەتی(شهود)و خوا بەدڵ بینین دا بیٚ!

٢- چاكەكاریی(إحسان) لەگەڵ دین و بەرنامەی خودا، ئەویش ئەوەیە كە ئینسان هیچ لە دین و شەریعەتی خوا نەبوێریٚ و بە هەموویەوە پابەند بێت و بەگوێرەی توانا خەم لە هەمووی بخوات، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِنٌ..﴾ (النساء ـ١٢٥) .

واتە: وە دینداریی كیٚ لە هی ئەو كەسە چاكترە كە رووی خۆی بۆ خوا مل كەچ كردوە و یەكلاكردۆتەوە و چاكە كاریشە..

٣- چاكەكاریی لە بواری مامەڵە لەگەڵ خەڵكی دا، كە دەتوانین بە كورتی بڵێین : چاكەكاریی لەگەڵ خەڵكی بریتیە لەوە كە سەرجەم حەقە شەرعیەكانیان بۆ جێبەجێ بكات و بە گوێرەی پێوەرو تەرازووی شەریعەت مامەڵەیان لەگەڵ بكات نزیك و دۆست بن یان دوور و دوژمن... وەك خوا (جلّ و علا) فەرموویەتی:

١) ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً﴾ (البقرة ـ٨٣) .

٢) ﴿وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ (البقرة ـ١٩٥) .

٤- چاكەكاریی لە بواری چۆنیەتی و شێوازی دینداریی دا وەك ئایەتەكانی قورئان بەگشتی دەیگەیەنن، بۆ نموونە ئایەتی:

﴿إِنَّ اللّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾(النمل ـ١٢٨)

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (ان الله تعالی کتب الأحسان علی کل شيء ، فأذا قتلتم فأحْسنوا القتْلة و إذا ذَبَحْتُمْ فأحْسِنوا الذّبحة ولیُحِدّ أحدكم شفْرَتَهُ وَلْیُرِحْ ذبیحته) رواه مسلم.

واتە: بێگومان خوا چاكەكاریی لەسەر هەموو شتێك نووسیوە و پێویست كردوە. جا هەر كات نێچیرێكتان ڕاوكرد بە چاكیی و جوانیی بیكوژن، وە هەر كات شتێكتان سەر بڕی چاكی سەر ببڕن وە با یەكێكتان ـ كە شتێك سەر دەبڕێ ـ تیغەكەی باش تیژ بكات، و با زوو سەربڕاوەكەی ئاسوودە بكات.

ئینجا وێڕای هەموو ئەو شتانەش بێگومان مسوڵمان ڕەوشت جوان و بەرزە، وەك خوای پەروەردگار لە وەڵامی ئەو تۆمەتانەدا كە موشریك و كافرەكان پێغەمبەر ﷺ یان پێ تۆمەت بار دەكرد، كە جارێك دەیانگوت شێتەو جارێكی دی دەیانگوت جادووگەرە و... هتد!!، فەرموویەتی:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم، ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (١) مَا أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ (٢) وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ (٣) وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ (٤)﴾ القلم .

توێژەرەوان (مفسِّرون) دەڵێن، خوای پەروەردگار لێرەدا لە وەڵامی ئەو كافرو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەدا ڕەوشت بەرزیی پێغەمبەر ﷺ بە بەڵگە دێنێتەوە، كە نەخێر موحەممەد شاعیرو جادووگەرو فاڵچی (كاهن)نیە، بە بەڵگەی ئەوەی كە ڕەوشتی بەرزەو لەسەر ڕەوشتێكی مەزن (عظیم) وپەسندو

جوانە. دیارە ئێمەش کە خۆمان بە شوێن کەوتووی ئەو پێغەمبەرە دەزانین پێویستە ئاوابین.

هەر بۆیەش: خوای کاربەجێ (تبارك وتعالى) لە چەند شوێنێکی کتێبی مەزن و موبارەکی خۆیدا کاتێك کە ویستوویەتی پێناسەی مسوڵمانان و ئەهلی ئیمان بکات بە چەندان ڕەوشت و خەسڵەتی بەرزو پەسندیان وەسفی کردوون، کە دەتوانین لێرەدا ئاماژە بە چەند کۆمەڵە ئایەتێك بکەین لەو بارەوە:

یەکەم: لە سوورەتی(الرّعد)دا لە ئایەتی(١٩) تا ئایەتی (٢٢)خوای زاناو توانا وەسفی مسوڵمانانی ژیرو تێگەیشتوو دەکات بە نۆ (٩)سیفەتو ڕەوشتی بەرزو جوان.

دووەم: وە لە سوورەتی (الأسراء)دا لە ئایەتی (٢٢)تا ئایەتی(٣٩)خوای پەنهان بین بەندە یەکتاپەرستەکانی خۆی بە (٢٢) خەسڵەت و ڕەوشتی ڕەندو پەسند پێناسەو وەسف دەکات.

سێیەم: وە لە سوورەتی(الفرقان)دا لە ئایەتی (٦٣)تا ئایەتی (٧٤) خوای بە بەزەیی بەندە هەڵبژاردووەکانی خۆی بە نزیکەی (١٧)سیفەتی بەرزو دڵگیر پێناسە دەکات. کە دوایین سیفەتیان بریتییە لە پاڕانەوەیان لە خوای بەخشەر (سبحانه وتعالى) کە بییان گێڕێ بە پێشەواو چاوساغی پارێزکاران: ﴿ربَّنا ... واجعلنا للمتقين اماماً..﴾ تاکو ئاگاداربین کە تەنها کاتێك شایستەیی پێشەوایەتیمان دەبێ کە ڕازابینەوە بەو سیفەتە بەرزو پەسندانە!!

چوارەم: وە لە سوورەتی (الشورى)دا لە ئایەتی (٣٦)تا ئایەتی (٤٣)بە دەوری سێزدە (١٣) سیفەت و خەسڵەتی بەرزو پەسند خوای بێ وێنەو

تاك (سبحانه وتعالی) پێناسەو وەسفی كۆمەڵی مسوڵمانان و خاوەن ئیمان كردوە.

شایانی باسیشە كە لە هەموو ئەو كۆمەڵە ئایەتانەدا كە خوای تاك و پاك پێناسەی ئەهلی ئیمانی تێدا كردوون، گشتگیریی و هەمەلایەنەیی لە سیفەت و خەسڵەت و ڕەوشتەكاندا ڕەچاو كراون و سەرجەم لایەن وبوارەكانی: عەقڵ ودڵ وجەستەیی لە ئینسان داو فیكریی وعەقیدەیی و عیبادیی و ئەخلاقی وئابووری وكۆمەڵایەتی وسیاسی لە (كۆمەڵ)دا حیسابیان بۆ كراوە!.

كەواتە: مسوڵمانی تێرو تەواو ئەو كەسەیە كە چاكەكار (محسن)بێت ودیارە بە بێ ڕەوشتی بەرزو جوانیش چاكەكار نابێ. بۆیە وەك ئامۆژگارییەكی دڵسۆزانە لە پێشدا بۆ خۆم وپاشان بۆ ئێوەی خوشك وبراشم دەڵێم:

دەبێ زۆر وریا بین لە هەڵس وكەوت و ڕەفتارمان لەگەڵ خودی خۆمان و لەگەڵماڵ وخێزان و خزمان و دەرو دراوسێ و دۆست و دوژمن و بە كورتی لەگەڵ هەموو ئەو خەڵكە كە لەگەڵیدا دەژین، دەبێ هەڵس وكەوت وڕەفتارمان لەگەڵ هەموو لایەك دا ڕەفتارو مامەڵەیەكی مسوڵمانانە بێت و ڕەوشت وئاكارمان لەگەڵیان بەرزو پەسند بێت، ئاشكراشە كە زۆربەی ئەو خەڵكەی كە خوای پەروەردگار لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ هیدایەتی داون بە هۆی ڕەوشتی بەرزو جوانی پێغەمبەرەوە بووە، وەك لەو بارەوە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴾ (آل عمران ـ ١٥٩) .

ئەگەر سەرنج بدەین لێرەدا خوای پەروەردگار (عزّوجلّ) ئاماژە بەوە دەكات كە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ قسە زبرو ڕەق و دڵ ڕەق بووایە ، نەرم ونیان وڕەوشت بەرزو جوان نەبووایە لەگەڵ ئەوانەدا كە لە دەوروبەری بوون، ئەوە نەك

خەڵكی دیكە بەڵكو تەنانەت ئیماندارەكانی دەورو پشتیشی لە دەوری نەدەمان و دەپرژان، چ جای ئەوە كە كافر بە دەنگیەوە بێن!!

بەڕێزان!

بە ڕاستی زۆر جێ ی سەرنجە!! ئەو پێغەمبەرە مەزن (عظیم)ە كە بەزەیی خوایە بۆ جیهانییان (رحمة للعالمين)!، خوای پەروەدگار پێ ی دەفەرمووێ: ئەگەر قسە ڕەق و دڵ ڕەق بووایەی لە دەورەت دەپرژان و نەدەمان، كێ لە دەوری دەپرژا ..؟!

ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی كە خوا بۆ خۆی چەندان جار مەدحی كردوون! لە دەوری كێ؟!

لە دەوری كەسێك كە (رحمة للعالمين)ە...!!!.

چ جای ئێمە و مانان، كە بێ گومان لە ئەوانەمان كە ئامۆژگاری خەڵكی دەكەین لەگەڵ پێغەمبەری خوا قیاس دەكرێین و نە ئەوانەش كە لە دەورمانن لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەكان خوا لێیان ڕازی بێ قیاس دەكرێن.

بۆیە دەبێ دڵنیابین و لە لامان و سەلمێنراو بێ كە ئەگەر زۆر لەگەڵ یەكدی دا بە تایبەت و پاشان لەگەڵ خەڵكیدا نەرم و نیان و ڕەوشت بەرز و دڵگەورە ئەخلاق گەورە نەبین، ئەوە بەتەئكید ناتوانین لە نێو خۆمان و لەگەڵ خەڵكیش دا مەدار بكەین و ئەركی شەرعی سەرشانی خۆمانیان لەگەڵ جێ بەجێ بكەن.

**حەوتەم: مسوڵمان خاوەنی كەسایەتییەكی ڕاست و هاوسەنگە :**

بەڵێ مسوڵمان ڕاست و دروست (مستقیم)ە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ (٢٧) لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ (٢٨)﴾ (التكوير).

بەڵێ هۆكارێك كە بابای مسوڵمان لە هەموو شتێك زیاتر پێی دەناسرێ ئەوەیە كە ڕاست (مستقیم)ە بەم شێوەیە:.

أ. ڕاستە لەگەڵ خۆیدا ، شتێك ناڵێ كە قەناعەتی پێ نەبێ، كاتێك دەڵێ خوام خۆش دەوێ، بەڕاستی خۆشی دەوێ، كە دەڵێ ئیمانم بەخوا (عزَّوجلَّ) هەیە ، بەڕاستی ئیمانی پێ هەیە ، وەكە دەڵێ مسوڵمانان بە خوشك و برای خۆم دەزانم بە كردەوە وایە.كاتێك كە دەڵێ ئیسلامم دەوێ بە بەرنامەی ژیان و گوزەرانم بەكردەوەو لە واقیع دا ڕاست دەكات،...هتد.

ب. لەگەڵ خواو پێغەمبەری خواشدا ﷺ ڕاست دەكات: كاتێك كە دەڵێ شایەتی دەدەم كە خوا (عزَّوجلَّ) تاكە پەروەدگار و پەرستراوە، واقیعی ژیانیشی هەر ئەوەی تێدا دەبینرێ، وە كاتێك كە دەڵێ شایەتی دەدەم كە (محمد) نێردراوی خوایە، لەگەڵیدا ڕاست دەكات و لەبەر ئەوەی ئیمانی هەیە و دەزانێ ئەو پێغەمبەری خوایە، هەر چی ئەو فەرموویەتی و هێناویەتی بەدڵ و بەگیان وەری دەگرێ و تەسلیمی دەبێ و پێیەوە پابەند دەبێ.

ج. لەگەڵ ئیسلامدا ڕاست دەكات : مادام بە ڕێگای ڕاستی ئیسلامدا بڕوات ناتوانێ ڕاست و دروست نەبێ، هەر بۆیە بەئەندازەی ئەوە كە مسوڵمان لار و خوار دەبێ، دەبێ دڵنیابین بەو ئەندازەیەش لە ڕاستە شەقامی خوا

لایداوە، هەر بۆیە خوای پەروەدگار لەسەر زمانی بەندەكانی لە سووڕەتی (الفاتحة)دا فەرموویەتی:

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهدِنَا الصِّرَاطَ الْمُستَقِيمَ (٦)﴾ .

چونكە كێ یە كە دەتوانێ تەنها خوا بپەرستێ و پشتی پێ ببەستێ؟! بێگومان ئەو كەسەی كە بەڕاستی ڕاستە شەقامی خوای گرتبێ، وە كاتێك مرۆڤ دەتوانێ بەڕاستی خوا بپەرستێ و بەندایەتی بۆ بكات كە ڕاستە شەقامی خوا بگرێ. وە كەسێك كە بەڕێی ڕاستدا بڕوات دەبێ خاوەنی كەسایەتیەكی ڕاست بێ و كردەوەكانی و هەڵوێستەكانیشی ڕاست بن. زۆر كەس وا دەزانێ ڕاستیی (صدق) واتە (ڕاستگۆیی) نەخێر!

بەڵكو ڕاستگۆیی بەشێكە لە ڕاستیی، جا پێیغەمبەری ئیسلام ﷺ زۆر ئامۆژگاری مسوڵمانانی كردوە بە (ڕاستیی) بەتاییەت ڕاستگۆیی. بۆ وێنە: ڕۆژێكیان ئافرەتێكی (صحابیە) بانگی منداڵەكەی دەكات و دەڵێت: وەرە شتێكت بدەمێ! پێغەمبەر ﷺ كە گوێی لە ئافرەتەكە دەبێ دەفەرموێ: ئەی دایكی فلان دەتەویست چی بدەیتێ؟

ئافرەتەكە دەڵێ بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟

دەفەرموێ لەبەر ئەوەی ئەگەر شتێكی نەدەیتێ مانای وایە بەدرۆ لەسەرت دەنووسرێ!

ئافرەتەكە دەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر منداڵی بچووكیش بەدرۆ بانگ بكەی هەر دەبێتە (درۆ)؟!

ئەویش دەفەرمووێ: بەڵێ خوای پەروەدگار درۆی گەورە بەگەورە درۆی بچووكیش بە بچووك دەنووسێ و فەرقی نیە.

بەڵێ بێگومان (ڕاستیی) شتێكی زۆر گرنگ و گەورەیە ، مسوڵمان دەبێ ڕاست بێ لەگەڵ خۆیدا و لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوا ودینەكەی و دۆست و دوژمن و... هتد دا .

وە نابێ لە یادیشمان بچێ كە ڕاستیی (الصدق) باجی هەیەو مرۆڤ زۆر جار باجی ڕاستیی دەدات، بەڵام لە كۆتایش دا سەرەنجامی دنیـاو دواڕۆژیـی خێر دەبێ، وەك چۆن درۆ (كذب)ش گەلێك جاران دەستكەوتی هەیـە. بـەڵام بێگومان سەرەنجامەكەی ئابڕوو چوون و تێچوونە!

هەشتەم: مسـوڵمان یـەكلا بووەوەیـە بـۆ خـوا و بێجگـە لـە خـوا (عزَّوجلَّ) هیچ لایەنێكی دیكە نیە كە خۆی تەسلیم بكات و، جگـە لـە پاداشـت و ڕەزامەنـدیی ویـش هـیچ ئامـانج و مەبەستێكی دیكەی نیە كە هەموو هەوڵ و توانای خۆی بۆ تەرخان بكات!

وەك خوای بەرز و مەزن بە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَغَيْرَ اللّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلاَ يُطْعَمُ قُلْ إِنِّيَ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكَينَ ﴾ (الأنعام ـ ١٤).

واتە: بڵێ، ئایا ـ لایەن و كەسێكی دیكە ـ بێجگە لە خوا بگرم بەدۆسـت و پشتیوان كە بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی یە، وە ئەو خواردن دەدات ـ بـە غەیری خۆی و ـ هیچ كەس خواردنی ناداتێ (ـ چونكە پێویستی پێ نیە و لە توانای كەسیش دا نیە ـ)؟! بڵێ: من فەرمانم پێكراوە كەیەكەمین كەس بم ـ بۆ خوا ـ گەردن كەچ دەبم، وەكەلە هاوبەش پەیدا كەران نەبم.

هەروەها دەربارەی کەسانێك کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دان و پەیڕەویی لێ دەکەن ـ کە هاوەڵان (أصحاب) لە ڕیزی پێشەوەن ـ فەرموویەتی: ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ﴾ (الفتح ـ٢٩).

واتە: موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە و ئەوانەی کە لەگەڵی دان ..... پاداشت وچاکە و ڕەزامەندیی خوا دەخوازن و کردوویانەتە ئامانج و مەبەستیان...

هەروەها خوای بێ وێنە و هاوتا پێغەمبەری کۆتایی خۆی (صلى الله تعالى عليه وآله وسلم) بەم جۆرە دواندوە: ﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٦١) قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ (١٦٣) ﴾ الأنعام .

واتە: ئەی موحەممەد ! تۆ بڵێ : بێ گومان من پەروەردگارم ڕێڕوونی کردووم بەرەو ڕاستە شەقام. بەرنامەیەکی ڕاست و بێ گرێ یە ڕێبازی ئیبراهیمە کە بۆ خوا و ڕاستە ڕێیەکەی ساغ بوو بووەوە و لە هاوبەش دانەران نەبوو. بڵێ: بێگومان نوێژم و قوربانی سەربڕینم و ژیانم و مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە. هیچ هاوبەشی نین، وە بەوە فەرمانم پێ کراوە، وە من یەکەمینی مسوڵمانانم .

وەك دەبینین خوای زاناوتوانا (عزَّ و جلَّ) فەرمان بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی (محمد) ﷺ دەکات کە بفەرموێ و ڕاییگەیەنێ کە نوێژو قوربانی سەر برین و ژیان ومردنی تەنهاوتەنها بۆ خوای پەروەردگارە ولەو ڕووەوە هیچ

هاوبەشێك بۆ خوا دانانێ وهەموو ئەو شتانەی بۆ خوا ساغ كردۆتەوەو خۆی بۆ خوا یەكلاكردۆتەوە!

جا شایانی باسە كە خوای بەرزومەزن پاش ئەوەی فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ كردوە كە شوێنكەوتوویتی خۆی بۆ ڕاستە ڕێی خوا ـ كە ئیسلام و مسوڵمانەتی یە ـ ڕابگەیەنێ، ئنجا پێی فەرمووە كە ڕایبگەیەنێ: نوێژو قوربانی سەر بڕین و ژیان و مردنی تەنها بۆ خوایە! كەواتە:

ڕاستە شەقامی خوا گرتن و دینداریی ومسوڵمانەتی ڕاستەقینە ئەوەیە كە مرۆڤ هەركام لە دروشمەكانی خواپەرستی(شعائر التعبّد) ـ بۆ نموونە نوێژ و قوربانی سەربڕین ـ و سەرجەم هەڵس وكەوتەكانی ژیانی و مردنیشی بۆ خوا و بە پێی ئایین و بەرنامەی خوا بێت. واتە سەرجەم ژیان وگوزەرانی و سەرەنجامەكەشیی كە مەرگ ومردنە تەنها وتەنها لە پێناوی خوادا و بە گوێرەی شەریعەت و بەرنامەی خوا بێت، چونكە ڕستەی: (لاشريك له و بذلك أُمرت) ـ هیچ هاوبەشی نین و هەر بەوەش فەرمانم پێكراوە ـ كە لە دوای ڕستەی : (قل إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين)ەوە هاتوە مانای وایە :

بابای مسوڵمان و خوا پەرست و خوا بەیەكگر(مُوحِّد) كەسێكە كە: بێجگە لە خوا ڕكووع و سەجدە بۆ كەس نابات و بێجگە لەوی قوربانی بۆ كەس سەرنابڕێ و، بێجگە لەویش لە پێناوی هیچ كەس دا ناژیەت و نامرێت! كەواتە :

هەر كەسێك ـ هەرچەندە لافی مسوڵمانێتی و دینداریی لێبدات ـ بێجگە لە خوا ڕكووع وسەجدە بۆ كەس و لایەن و شتێكی دیكە ببات، یان

قوربانی بۆ سەربڕێ، یان بەشێك لە ژیانی لە پێناودا تەرخان بكات، یان لە پێناوی دا بمرێ و خۆی لەڕێدا بەخت بكات، ئەوە بێگومان دووچاری هاوبەشی بۆ خوا دانان(الشرك) بووە، جا چ كەم چ زۆر!

دیارە لەم ئایەتانەشەوە دەفامرێتەوە كە هاوبەش بۆ خوا دانان تەنها لـە بواری نوێژو ڕۆژوو و سەجدە و ڕكووع و قوربانی سەر بڕین دا كـورد هەڵتـە هاتووە، بابای هاوبەش دانەر(مشرك) تەنها كەسێك نیە كە سەجدە و ڕكووع بۆ غەیری خوا دەبات و قوربانی بۆ سەر دەبڕێ! بەڵكو ژیان بەڕێ كردنیش بە پێی بەرنامەی غەیری خواو خۆبەخت كردن لە پێناوی غەیری خـوادا و، بـە مەبەست و ئامانج [1] دانانی شتێك جگە لە ڕەزامەندیی خـواش هـەر بـە هاوبەش بۆ خوادانان دادەنرێ! بەڵام بە داخەوە زۆربەی خەڵكی ئەو ڕاسـتییە نازانن و پێیان وایە كە ئازادن چۆن چۆنی دەژین و دەمرن و ژیان و گوزەرانی دنیایان ڕێك دەخەن و بەڕێوە دەچن!

كە لە ڕاستی دا وانیە و كەسێك بیەوێ لە تاقیكردنەوەی ژیـانی دنیـای دەربچێ و بە خوا بەیەكگر(مُوحِّد)و خوا پەرست دابنرێ و شایستەی پاداشت و ڕەزامەندی خوای بێ هاوتا بێت، دەبێ بە تەواویی تەسلیم و گەردن كەچی خوا بێت و مافی سەرپشك بوون و هەڵبژاردن بە خۆی نـەدات، ئەگـەر نـا خـۆی گیرۆدەی شیرك دەكات، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاء وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ (القصص-٦٨) .

(١) واتە مەبەست و ئامانجی هەرە گەورەو كۆتایی.

واتە: وە پەروەردگارت هەر شتێكی بیەوێ دروستی دەكات و هەرچی یەكی بیەوێ هەڵی دەبژێرێ. بەڵام ئەوان مافی هەڵبژاردنیان نیە، پاكی و بەرزیی بۆ خوا لەوەی كە دەیكەنە هاوبەش بۆ خوا!

دیارە بە پێی سیاقی ئایەتەكانیش دەزانین كە مەبەست لە ڕستەی: (مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ) ئەوەیە كە مرۆڤەكان مافی ئەوەیان نیە و سەرپشك نەكراون كە ئایا خوا بپەرستن و یان غەیری خوا، وە شوێن بەرنامەی خوا بكەون یان بكەونە دوای دین و بەرنامەیەكی دیكە!

واتە وەك چۆن هیچ كەسێك ئازاد و سەرپشك كراو (مختار) نەبووە لەوەدا كە دروستكراوە بەڵكو خوا دروستی كردوە بێ ئەوەی پرسی پێ بكات و ڕاوێژی پێ بكات داخۆ ڕازی یان نا؟! وەك ڕستەی: (وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاء وَيَخْتَارُ) ئاماژەی پێ دەكات، هەروەها ئایەتی: ﴿ مَا أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ ...﴾ (الكهف ـ٥١) بە ڕاشكاویی دەیخاتە ڕوو، دەبێ بە هەمان شێوەش ئینسانەكان لەبەرانبەر بەندایەتی كردن بۆ خواو بەڕێوەچوون بەپێی ئایین و شەریعەتی خوادا خۆیان بەئازاد و سەرپشك كراو نەزانن و بزانن كە لەسەریان پێویستە ـ ئەگەر بە تەمابن سەربەرز و سەرفیرازبن ـ تەنها خوا بە پەروەدگار و پەرستراوی خۆیان و تەنها ئایین و بەرنامەكەیشی بە بەرنامەو ڕێبازی خۆیان و گوزەرانی تاكیی و كۆمەڵی یان بزانن.

دیارە كە دەشڵێین: ئینسان ئازاد و سەرپشك كراو نیە لە بەرانبەر ئیمان بە خوا و پابەندیی بە شەریعەتی خوادا مەبەستمان ئەوە نیە كە خوا تۆبزیی لە خەڵك كردوە و ناچار(مجبور)ی كردوون كە ئیمانی پێ بێنن و

بیپەرستن و فەرمانبەری بۆ بكەن! چونكە ئاشكرایە كە مرۆڤ لەو ڕووە وە ئازاد و سەرپشكە. وەك خوای كاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ.. ﴾ (الكهف ـ٢٩).

واتە: جا كێ دەیەوێ بائیمان بێنێ و كێش دەیەوێ با كافر بێ..

كەواتە: خوای كاربەجێ (عزَّوجلَّ) لە ئەسڵ دا مرۆڤی وا خوڵقاندوە و سروشتاندوە كە ئازاد و سەرپشك بێت لە ڕووی هەڵبژاردنی كوفر و ئیمان و فەرمانبەریی و سەرپێچی و چاكەكاریی و خراپەكاریی یەوە، ئەوە لە لایەنی (تكويني)یەوە كە ئینسان كەم وزۆر دەستی تێدا نەبووە و نیە. بەڵام لەلایەنی (تشريعي)یەوە كەئینسان تێیدا دەستی ئاوەڵاو كراوەیە، ئەوا خوا (عزَّوجلَّ) لەسەری پێویست كردوە كە بیپەرستێ و بەندایەتی بۆ بكات و هاوبەشی بۆ دانەنێ. و لەڕێ ی پێغەمبەرانی هەڵبژاردەی خۆشیەوە (عليهم الصلاة والسلام) بەرنامە و ڕێنمایی یەكانی خۆی بۆ ڕەوان كردوە و لەسەر زمانی پێغەمبەرانیش (عليهم السلام) موژدەو هەڕەشەی خستوونەتە ڕوو، موژدە بۆ ئەهلی ئیمان و طاعەت و هەڕەشەش لە ئەهلی كوفر و سەر پێچی، وەك فەرموویەتی:

﴿ رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ (النساء ـ١٦٥).

پوختەی قسان:

خوای پەروەردگار ئینسانی لەئەسڵ دا ئازاد خوڵقاندوە تاكو بەكەڵكی تاقیكرانەوە و دەرچوون و دەرنەچوون (النجاح والرسوب) بێت، بەڵام بۆ ئەوەی دەربچێ و سەرفراز بێت، لەسەر زمانی پێغەمبەرانی دڵخۆشكەر و ترسێنەری خۆیەوە پەیام و بەرنامەو ڕێڕوونیی و ئامۆژگارییەكانی خۆی بۆ ڕەوان كردوە و

ئیمان وعیبادەت و فەرمانبەریی لەسەر پێویست کردوە لە بەرامبەریش دا مژدەی بەهەشت و ڕەزامەندیی خۆی پێداوەو، بەپێچەوانەشەوە کوفرو شیرك و سەرپێچی و خراپەی لێ قەدەغە کردوە و لە بەرانبەریش دا ـ واتە بۆ کەسێك توخنیان بکەوێ ـ هەڕەشەی بەتووڕەیی خۆی و سزا و جەزرەبەی دۆزەخ کردوە.

دیارە بەبێ ئیمانێکی دوور لە کوفر و خوا بەیەکگرتن (توحید)ێکی دوور لە هاوبەش دانان (شرك)و پابەندییەکی دوور لەلادان (انحراف)یش ئەو بەندایەتی بۆ خوا کردن ومسوڵمانەتی یە ڕاست و ڕەسەنە نایەتەدی کە مرۆڤ بکاتە شایستەی مژدەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پارێزراو لە هەڕەشە و ترساندنیان!

**نۆیەم: مسوڵمان ئەو کەسەیە کە سەرو ماڵی لە ڕێی خوادا بەخت دەکات و لە بەرانبەر دین و پەیامی خوادا خۆی بەخاوەنی هیچ نازانێ، نە رووح نە ماڵ، نە خێزان نە منداڵ..هتد بەڵکو هەموو شتێك بەهی خوا دەزانێ و ئامادەشە لە پێناوی ڕەزامەندیی وی دا بیبەخشێ.**

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴾ (البقرة -١٥٥) واتە (بێگومان ـ مسوڵمانینە ـ ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بەشتێك لە ترس و برسیەتی و لە قیس چوونی ماڵ وسامان و لەدەستدانی خزم کەس و دۆستان و لە دەستدانی بەروبووم و بەرژەوەندییەکان، بەڵام مژدە بدە بە خۆڕاگران) ئنجا پێناسەی خۆڕاگران دەکات و دەفەرموێ: ﴿ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا

لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ﴾ (البقرة -١٥٥) . واتە: ئەوانەی كاتێك كـە بەڵایـەكیان بەسەر دێ دەڵێن: ئێمە هی خواین وە بۆ لای ویش دەچینەوە، هەم سەرەتامان لەویەوەیە و هەم سەرەنجامیشمان هەر بۆ لای ویە.

بەڵێ بەڕێزان! بەڕاستی هەر كەسێك بەتـەواویی قەناعـەتی بـەم ڕسـتە قورئانیە هەبێ هیچ كارەساتێك كاری تێناكات بەئەنـدازەی ئـەوە كـە ئـەو قەناعەتـە بەعـەقڵ و دڵـی دا قـووڵ دەبێتـەوە. بـۆ وێنـە: كەسـێك كـە جگەرگۆشەیەكی دەمرێت بێگومان پێی دڵگران (متأثر) دەبێ، بەڵام ئەگەر بیر بكاتەوە و بڵێ: (باشە ئایا خوا (عزَّوجلّ) خاوەن نیە..؟! .... .

وە ئایا ناچینەوە بۆ لای خوا..؟!.... .

وە ئایا خوا پاداشتمان ناداتەوە...؟!.... .

ئەوە بێگومان لەوەڵامی پرسارەكان دا دەڵێ: با. وە سـەرەنجامیش دەڵـێ: كەواتە بۆچی خەمێ دابگرم!!، هەر بۆیەش لە كاتێك دا كە خوای پەروەردگار باسی دۆستەكانی خۆی دەكات دەفەرمووێ:

﴿ أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ (یونس -٦٢).

وە لەو بارەشەوە كەئینسانی مسوڵمان خۆی بە خاوەنی هیچ شتێك نازانێ لە بەرانبەر خوادا، خوای پەروەردگار ئاوای فەرمووە: ﴿ إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِـنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَـاتِلُونَ فِـي سَـبِيلِ اللّـهِ فَيَقْتُلُـونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْـدِهِ مِـنَ اللّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾ (التوبة -١١١)

واتە: (خوا گیان و سامانی لە بڕواداران كڕیـوە و بەهەشـتیان دەداتـێ، لـە پێناوی خوادا دەجەنگن، دەكوژن و دەكوژرێن .... هتد.)

کەواتە: هەر کاتێك مرۆڤی مسوڵمان بڕواو قەناعەتی وانەبوو و ئامادەیی بە کردەوەشی نەبوو لە کاتێکدا کە ئیسلام پێویستیەتی خوێنەکەی بڕژێنێ لە پێناوی خوادا و، ماڵەکەی لە پێناوی ئەودا سەرف بکات، با خۆی بە مسوڵمان نەزانێ. چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ وشەی (الْمُؤْمِنِينَ)، (أل)ی (جنس)ی لەسەرە کەواتە هەموو بڕواداران دەگرێتەوە و مانای وایە خوا لە هەموو بڕواداران سەر و ماڵی کڕیوە، بۆیە هەر کەسێك خۆی بە خاوەنی سەر و ماڵێ بزانێ لە بەرانبەر خوادا با خۆی بە بڕوادار نەزانێ.

واتە: بە ئەندازەی ئەوە کە لە کاتی پێویستی ئیسلام دا خۆت بە خاوەن ماڵ دەزانی و لە پێناوی خوادا خەرجی ناکەی، دەبێ بزانی کە بەو ئەندازەیەش مسوڵمان و ئیماندار نی، چونکە کە ئیسلام پێویستی بە ماڵ و سامانەکەت بوو و تۆش لە پێناوی دا نەتبەخشی دیارە ماڵ و سامانەکەت بەهی خوا نەزانیوە و لەو سەوداو مامەڵەیەدا کەخوا لەگەڵی کردووی و لەو پەیمانەدا کە لەگەڵیدا بەستووتە ڕاستت نەکردوە؟ بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە ئەم وێنەیە دێنمەوە: (ئایا دەگونجێ کەسێك شتێکی بەکەسێکی دی فرۆشتبێ بەڵام جارێ شتەکە هەر لەلای خۆی بێ، جا لەکاتێکدا کە کەسی کڕیار پێ ی بڵێ: بێنە شتەکەم تەسلیم بکە فرۆشیار پێی بڵێ: نەخێر تەسلیمت ناکەم....؟؟!!)، دیارە کە تەسلیمی نەکرد مانای وایە پێی نەفرۆشتوە و بە هی وی نازانێ، دەجا خواش (عزَّوجلّ) فەرموویەتی: گیان و سامانم لە بڕواداران کڕیوە و بەهەشتیان دەدەمێ. کەواتە ئەگەر ئێمە ڕاست بکەین لەوەدا کە، بەڕاستی بڕوادارین و بە تەمای بەهەشتین، نابێ خۆمان بەخاوەنی سەرو ماڵی خۆمان بزانین لە کاتێك دا وە لەشوێنێك دا کە دینی خوا پێویستی پێیان

دەبێ. بەڵكو كاتێك كەدینی خوا پێویستی پێ یە، دەبێ: ماڵی لە پێناودا دابنێی و گیانی خۆت لە پێناودا بەخت بكەی و خەڵكی لەسەر بكوژی و خۆتی لەسەر بە كوشت بدەی و ئەوەی كە [redacted] لە پێناوی خوادا بیبەخشی، جا بە ئەندازەی ئەو ئامادەیی (إستعداد)ەی بەخشینە كە لە ئینسان دا هەیە، ئیمان هەیە. پێغەمبەری خوا دەفەرموێ ((مَنْ مات و لم يَغْزو و لم يُحدِّثْ به نفسه مات ميتةً جاهلية)) رواه مسلم واتە: (هەركەسێك بمرێ و جیهاد نەكات لە ڕێی خوداو بەتەماش نەبێ جیهاد بكات و بە دڵی دانەهاتبێ بیكات، ئەوە مردنێكی نەفامانە مردوە! داواكارم لە خوای بە بەزەیی وامان لێ بكات كە ئەو مسوڵمانە بین كە لە تەرازووی شەرعی ویدا بە مسوڵمان لە قەڵەم بدرێین.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لاإله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك.

# وانەی سـێیــەم :

# کۆمەڵگـای ئیسـلامی چــۆنە ....؟



الحمدلله والصلاة والسلام علی رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه

بەڕێزان!

خوا یار بێ هەوڵ دەدەین لەم دەرسی سێیەمەدا تیشك بخەینە سەر كۆمەڵگای ئیسلامی و پێكهێنەرە بنەڕەتییەكانی بخەینەڕوو .

سەرەتا بە كورتی دەڵێین :

كۆمەڵگای ئیسلامی ئەو كۆمەڵگایەیە كە زۆربەی خەڵكەكەی لەسەر بناغەی ئیمان و ئیسلام كۆبوونەتەوە و بە پێی شەریعەتی خوای پەروەردگار ژیان و گوزەرانی خۆیان بەڕێوە دەبەن.

جا (كۆمەڵگای ئیسلامی) (المجتمع الأسلامي) یان (كۆمەڵگای مسوڵمان) (المجتمع المسلم). لەڕووە كۆمەلاَیەتییەكە یەوە پێی دەگوترێ: كۆمەڵگای مسوڵمان، یان كۆمەڵگای ئیسلامی، وە لە ڕووە سیاسی یەكەیەوە پێ ی دەگوترێ: دەوڵەتی ئیسلامی یان كیان و قەوارەی ئیسلامی بەڵگەشمان لەسەر ئەوە كە كۆمەڵگای ئیسلامی، ئەو كۆمەڵگایە یە كە زۆربەی خەڵكەكەی لەسەر بناغەی ئیمان و ئیسلام پێكەوە كۆدەبنەوە و بەپێی شەریعەتی خوای پەروەردگار ژیان و گوزەرانی خۆیان بەڕێوە دەبەن، ئەوەیە كە ئەگەر تەماشای (قورئانی مەككی) بكەین دەبینین بۆ تەنها جارێكیش خوای پەروەردگار دەستەواژەی ﴿يأيها الذين آمنوا﴾ی بەكارنەهێناوە و لەجیاتی ئەو دەستەواژەیە ، دەستەواژەی ﴿يأأيها الناس﴾ واتە: (ئەی خەڵكینە) یان (يأأيها الأنسان) (ئەی مرۆڤـ) یان (يابني آدم) (ئەی وەچەی ئادەم)ی بەكارهێناوە و

بەو شێوەیە بانگی دوێنراوەکانی خۆی کردوە. ئەوەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو کاتە کۆمەڵگایەکی ئیسلامی، مسوڵمان، دروست نەبووە کە کیان و قەوارەیەکی هەبێ و لەسەر بناغەی بیروباوەڕی ئیسلامی کۆبووبنەوە و سایەو سێبەری شەریعەتی خوای لەسەر بێ و شایستەی ئەوە بێ کە خوای پەروەردگار بیدوێنێ و ئەرك و پێویستی یە شەرعییەکانی پێ بسپێرێ. بەڵام ئەگەر سەرنجی (قورئانی مەدەنی) بدەین، دەبینین وێڕای دووبارە بوونەوەی دەستەواژەی ﴿يأأيها الناس﴾ لە چەند ئایەتێك دا، خوای پەروەردگار بەزۆری دەستەواژەیەکی دیکەشی بەکار هێناوە کە ئەویش ﴿يأيها الذين آمنوا﴾یە. واتە: (ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە).

جا لە دەستەواژەی ﴿يأأيها الذين﴾ ئەوە وەردەگیرێ کە کۆمەڵە خەڵكێك هەن وە لە دەستەواژەی ﴿آمنوا﴾ش وەردەگیرێ کە ئەو کۆمەڵە خەلکە ئیماندارن، پاشان لەو فەرمان پێکردن و لێقەدەغەکردن (الأوامر والنّواهي)انەی کە خوای پەروەردگار دواتر ئاڕاستەی ئەوانەیان دەکات کە بە ﴿يأأيها الذين آمنوا﴾ بانگی کردوون، ئەوە دەفامرێتەوە کە خوای پەروەردگار کۆمەڵە ئەرکێکیان پێدەسپێرێ.

جا هەر چەندە لە شاری مەککەش مسوڵمانان هەبوون، کە بریتی بوون لە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی بە پیاو و ئافرەتەوە، بەڵام بۆیە خوای پەروەدگار بە ﴿يأأيها الذين آمنوا﴾ بانگی نەکردوون و وە ئەرك و فەرمانەکانی پێ نەسپاردوون، چونکە ئەو کاتە کیان و قەوارەیەکیان نەبوو، وە ئامادەیی ئەوەیان تێدا پەیدا نەبوو بوو وە ئەو تواناو بڕستەیان تێدا

نەڕەخسابوو كە فەرمانەكانی خوای پەروەردگار جێبەجێ بكەن و بێ گومان خوای پەروەردگاریش كاربەجێ یەو شتی بێجێ ناكات.

بەڵێ خوای پەروەردگار (عزّوجلّ) لە سووڕەتە مەككییەكانـدا خـەڵكی بـانگ دەكـات بـۆ لای خـۆی و بەندایـەتی بـۆ خـۆی و وە پابەنـدیی بـە شەریعەتەكەیەوە. پاشان دواتر ئەوانەی كە لە قۆناغی مەككەدا بەدەم بانگی خواوە چوون و لەسەر ئیمان و ئیسلام پەروەردەبوون شایستەی ئەوە بوون كـە خوای پەروەردگار لە قۆناغی مەدینەدا بەعینوانی ئیمان بیاندوێنێ و ئەرك و فەرمانەكانیان پێ بسپێرێ، وەك خوای پەروەردگار لەم ئایەتـە مەدەنییـەدا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّـهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ (الأنفال ـ ٢٤).

واتە: (ئـەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە! بەدەم بانگی خوا و پێغەمبەرەوە بچن كە بانگتان دەكەن بۆ شتێك كە پێی زیندوو دەبنەوە).

جا بەڕێزان!

بەرلەوەی بچینە سەرخستنە ڕووی بنەمایەكانی كۆمەڵگای ئیسلامی كە لە دوازدە خاڵاَن دا پوختیان دەكەینەوە. سەرنجتان بـۆ ئامـاژی گشـتی ئـەم بابەتە ڕادەكێشم كە دەتوانم بڵێم دروشتە :

١- ئێمە كە خۆمان بە مسوڵمان دەزانین بابزانین كە چ كاتێك وە چـۆن ئـەو كۆمەڵگاو خەڵكەی كە ئێمە بەشێكینی و لـە نێویـدا دەژیـن، دەبێتـە كۆمەڵگایەكی ئیسلامی و مسوڵمان.

٢- میللەتە مسوڵمانەكەشمان، بزانێ چ كاتێك و چـۆن بـە كۆمەڵگایـەكی ئیسلامی لەقەڵەم دەدرێ بۆ ئەوەی لە ناسینی خۆیدا بە هەڵەدا نەچێت،

چونكە جاری وا هەیە خەڵك و میللەتێك هەموو تاكەكانی مسوڵمانن ئەگەر بە ڕواڵەتیش بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە كۆمەڵگایەكی مسوڵمان و ئیسلامی لە قەڵەم نادرێ...! بۆچی...؟! چونكە شەریعەتی خوا لە ژیانی خۆیدا پیادە ناكات وە لەسەر بناغەی ئیمان و ئیسلام كۆنەبۆتەوەو سایە و سێبەری شەریعەتی خوای بەسەرەوە نیە.

# بنەمـــاو نیشـــانەكانی كۆمەڵگای ئیسـلامی

ئەو شتانەی كە بە بۆچونی من چـەند بنـەما ونیشـانەیەكی سـەرەكی كۆمـەڵگایەكی ئیسلامی پێك دینن ئەمانەی خوارێن:

یەكەم: ئەوانەی كە خۆیان بە مسـوڵمان دەزانن لەو كۆمەڵگـایە دا . بەندەی[1] خوان و پێكەوە بران، وەپێكەوەش خوشك و بران . وەك پیـاو و ئافرەت . .

چونكە لە كۆمەڵگایـەكی ئیسـلامیی دا تـەنها پەرسـتراو (الـه) خـوا (الله)یە (سبحانه و تعالى) وە تەنها بنەمایەكیش كە مسوڵمان لـە سـەری كۆدەبنەوە بریتیە لە ئیمان.

خوای پەروەردگار لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُـمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ (البقرة ـ ٢١) .

واتە: ئەی خەڵكینە! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن كەئێوەشی و ئەوانـەی پێش ئێوەش دروست كردوە بەڵكو پارێز بكەن.

هەروەها فەرموویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُـمْ وَافْعَلُـوا الْخَيْـرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (الحج ـ٧٧) .

---

(١) لێرەدا مەبەست لە بەندایەتی بەشە ئیختیارییەكەیەتی كە پاداشت و سزای لەسەر بنیات دەنرێ ، نەك بەشە ناچارییەكەی كە كافر و مسوڵمان تێیدا بەشدارن.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕكووع بەرن و كڕنووش بەرن و پەروەردگارتان بپەرستن و چاكە ئەنجام بدەن بەڵكو سەرفرازبن .

لەم دوو ئایەتە بە پیزە كە نموونەی چەندان ئایەتی دیكەن دەفامرێتەوە كە بەندایەتی بۆ خواو پەرستنی خوا بناغەی كۆمەڵگای ئیسلامی یە ، چونكە ئەم دوو ئایەتە هەردووكیان مەدەنیین و خوای كار بەجێ كۆمەڵگای ئیسلامیی یەكەمی تێدا دواندوون و لە یەكەمیان دا ڕووكراوەتە سەرجەم خەڵكی و لە دووەمیشیان دا ڕووكراوەتە ئیمانداران بە تایبەت.

ئنجا خوای دادگەر هەر كام لە پارێزكاریی و سەرفرازیی (التقوی والفلاح)ی كردۆتە زادەو بەرهەم و ئەنجامی بەندایەتی بۆ خوا كردن و پەرستنی.

دەربارەی ئەوەش كە ئیمان بناغەی لە سەر خڕبوونەوەو كۆبونەوەی مسوڵمانانە كە خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾ (الحجرات ـ ١٠) .

لە زمانی عارەبیدا (إنَّما) پێی دەگوترێ: (أداة الحصر و الأثبات) ،(حَصْر) واتە كورت هەڵێنان (إثبات)یش واتە چەسپاندن،كەواتە (إنَّما) ئامرازێكە ئەگەر خرایە سەر هەر ڕستەیەك حوكمێك دەچەسپێنێت وە حوكمەكەش كورت هەڵدێنی لەو كەسەدا كە بۆی چەسپاندوە.

بەو شێوەیە كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْـوَةٌ ﴾ واتە: (بە تەنها بڕواداران برای یەكترن) واتە: (برایەتی تەنها لە نێوان ئیمانداراندا هەیە) یان بە واتایەكی دیكە: (ناگونجێ بڕواداران هەبن مەگەر برا بن). جا وشەی (إِخْوَةٌ) جیایە لە وشەی (إخوان) ، لەبەر ئەوەی وشەی

(اخوان) تەنها بۆ پیاوان بەکاردێت. بەلاَم وشەی (إخوة) بۆ پیاوان و ئافرەتانیش بەکاردێت، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی میرات بەش کردن لە سوورەتی (النساء)دا فەرموویەتی:

﴿وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾ (النساء-١٧٦) .

لێرەدا ڕستەی (وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِجَالاً وَنِسَاء) واتە: ئەگەر میرات گرەکان پیاوان و ئافرەتان بوون.

کەواتە لێرەش کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾ واتە: (بێگومان تەنها بڕواداران ـ پیاوانیان برای یەکترو ـ ئافرەتانیان خوشکی یەکترو ـ پیاوان و ئافرەتانیان خوشك و برای یەکترن)

بەڵێ بەڕێزان! یەکەمین بنەما و نیشانە و سیمای کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی ئەوەیە کە ئەندامەکانی هەموویان بەندەی خوان و بەرزو نزم و ئاغا و ژێر دەستیان لە نێو دا نیە و، کەس ئیمتیازێکی زیادە بە خۆیەوە نابینێت و ناڵێ مەعدەنی من جیایە لە هی ئەوانی دی! وە هەموو وەك یەکن لە بەرانبەر خواو لە بەرانبەر شەرعی خواش دا.وەتەنها پێوەرێك هەیە کە لەیەکیان جیادەکاتەوەو بەرزیی ونزمی یان لە نێودا دیاری دەکات ئەویش تەرازووی پارێزکاریی (تقوى)یە وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ﴾ (الحجرات-١٣).

واتە: بێگومان بەڕێزترتان لە لای خوا پارێزکارترتانە.

دیارە هەندێك ئیمتیازی دیکەش هەن کە بەهۆی هەوڵ و کۆشش و وەدەستهێنانی مرۆڤەکانەوە پەیدادەبن. وەك (تقوى) کە بە هۆی وەدەست هێنانەوە پەیدادەبێ، بۆ نموونە: (زانیاری) کە خوای پەروەردگار لە بارەیەوە

فەرموویەتی:

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (الزمر-٩) .

كە بێ گومان زانیاری شتێكە مرۆڤ بۆ خۆی بە دەستی دەهێنێ، بەلاّم هەموو ئەو شتانەی دیكە كە دەستی مرۆڤیان تێدانیە، ئەوە خەڵكی تێیان دا وەك یەكن و بە هۆیانەوە بەرزو نزم نابن وەك: (زمان، قەدو قیافە، ڕەچەڵەك، گەل، ڕەگەز) ئەمانە هیچیان ناكرێن بە هۆكار و پاساوی ئەوە كە بەرزیی و نزمیی لە نێو ئەهلی ئیمان دا پەیدا بكەن.

**دووەم: كۆمەڵگای ئیسلامی كۆمەڵگایەكی مسوڵمانە و بۆ هەموو كاروبارێكی لەبەر ڕۆشنایی شەرع دا هەنگاو دەنێت و ملكەچە بۆ هەموو بڕیارەكانی شەرع:**

وەك خوای پەروەردگار (عزَّوجلَّ) لە سوورەتی (الحجرات)دا دەفەرموێ:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ(١)﴾ .

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هیچ شتێك پێش دەستی خواو پێغەمبەری خواﷺ مەخەن وە پارێز لە خوا بكەن بێگومان خوا بیسەرەو زانایە).لێرەدا مەبەست لەو جۆرە تەعبیرە ئەوەیە كە هیچ بڕیارێك مەدەن و هیچ هەنگاوێك مەنێن هەتا پرسی شەرع نەكەن.

بەڵێ سەرەكی ترین جیاوازی لە نێوان ئینسانی مسوڵمان و بابای نامسوڵمان دا ئەوەیە كە: مسوڵمان بەپێی ڕێڕوونیی(هدی)ی خوا (عزَّوجلَّ) بەڕێوە دەچێ، بەلاّم، نامسوڵمان بە پێی ئارەزوو(هوی)ی خۆی یان خەڵكێكی

دیکە بەڕێوەدەچێ. ئەگەرنا جیاوازی نێوانیان ئەوە نیە کە مسوڵمان بڵێ: من مسوڵمانم و نامسوڵمانیش بڵێ من کافرم! بەڵکو لە کردەوە و ڕفتاریاندا دەردەکەوێت کە داخۆ کامیان مسوڵمانە و کامەشیان نامسوڵمانە. ئنجا هەر لە سوورەتی(الحجرات)دا و لە ئایەتی دووەمدا خوای پەروەردگار ڕوویە مسوڵمانان دەفەرموێ:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە دەنگی خۆتان ڕەسەر دەنگی پێغەمبەر ﷺ مەخەن و دەنگی بە سەردا بەرز مەکەنەوە وەك چۆن بە سەر یەکتردا دەنگ هەڵدێنن، نەوەکا کردەوە کانتان ـ واتە کردەوە چاکەکان ـ هەڵبوەشێنەوە بێ ئەوەی هەست پێ بکەن!

جا دەنگ بەسەر دەنگی پێغەمبەر ﷺ دا هەڵهێنان و دەنگ بەسەر دەنگی دا بەرز کردنەوە ئەوە بەنسبەت هاوەڵان (أصحاب) کە لە خزمەتی دابوون. دیارە مەبەست مانا ڕواڵەتییەکەیەتی وەك لە هۆی هاتنە خوارەوە(سبب نزول)ی ئەم ئایەتەدا دەردەکەوێت وەك (السیوطي) دەگێڕێتەوە[1] :

کە هاوەڵێکی پێغەمبەر ناوی: (ثابت بن قَیسْ بن شماس) بووە دەنگێکی بەرزو گەورەی هەبووە جا کاتێك بیستی ئەم ئایەتە هاتە خوارێ لە ماڵی خۆی دانیشت و دەستی کرد بە گریان، وە کاتێك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پرسی،

---

(١) بڕوانە: (لباب النقول في أسباب النزول) لەسەر پەراوێزی ( مفردات القران تفسیر و بیان) ص٤٤٨

گوتیان. كە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ گوتوویەتی: تازە من ڕەنج بە خەسار بووم چونكە دەنگم بەرز بووە لە كاتێكدا كە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دا قسەم كردوەو دەنگم ڕەسەر دەنگی ئەو كەوتوە دیارە كردەوە چاكەكانم هەموو هەڵوەشاونەوە! پێغەمبەریش لە دوای ناردوو پێ ی فەرموو: (أماترضى أن تعيش حميداً وتقتل شهيداً وتدخل الجنة؟!)).

واتە: ئایا ڕازی نابی كە بە ستایش كراوی بژی و بە شەهیدی بكوژرێ ی و بچیە بەهەشتێ؟!

ئەویش گوتی: (رضيت ولاأرفع صوتي فوق صوت رسول الله أبداً)

واتە: ڕازیم و هەرگیزیش جارێكی دیكە دەنگم بەسەر دەنگی پێغەمبەری خوا هەڵناهێنم.

هەروەها لە (صحيح البخاري)دا هاتوە كە ڕۆژێكیان ئەبووبەكرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ بوو بەدەمە قاڵییان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ وە دەنگیان بەرز بۆوە بە هۆی ڕاجیاییان لە مەسەلەیەكدا، جا دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە كاتێك كە قسەیان دەكرد لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ جاری وا هەبوو دەبوایە یەك دووجار لێی پرسیبان ئەوجار لێیان حاڵی دەبوو ئەوەندە دەنگی خۆیان لە خزمەتی دا نزم دەكردەوە. كەواتە: ئەم ئایەتە مانا ڕواڵەتییەكەی مەبەستی پێ ئەو هاوەڵانەیە كە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دا بوون، بەڵام بەنسبەت ئەوانەی دوای ئەوان واتە شوێنكەوتووان (تابعين) وە یان ئەو هاوەڵانەی كە لە خزمەن پێغەمبەر ﷺ دا نەبوون، (خۆ هەموو هاوەڵان هەر لە كۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ دا دانەنیشتوون) وە ئەوانەی دوای ئەوانیش تاكو دونیا كۆتایی پێ دێ. چونكە خوای پەروەردگار نەی

فەرمووە: (یا صحابة رسول الله) بەڵكو فەرموویەتی: ﴿یاأیها الذین آمنـوا﴾ واتە: هەموو ئیمانداران دەگریتەوە بە پیـاو ئافرەتـەوە بەدرێـژایی زەمـان و بەپانایی زەمین! هەر بۆیە دەبێ ئەو ڕستەیە چەمك (مفهوم) ێكی دیكەشی هەبێت! ئەویش ئەوەیە كە هیچ مسوڵمانێك وە مسوڵمانان بەگشـتی مـادام خۆیان بە مسوڵمان بزانن بۆیان نیە كە هیچ بڕیارو بۆچوون و ڕایەك زاڵبكەن بەسەر یاساو بڕیارێكی ئـەو شـەریعەتەدا كـە پێغەمبـەر ﷺ لـە خـوای پەروەردگارەوە هێناویەتی و هەر كەسێك ڕاو بۆچوونێكی خۆی یـان غـەیری خۆی زاڵبكات بەسەر ئەوە دا كە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی ئەوە بێ گومان كردەوەكانی هەڵدەوەشێنەوە، بۆچی...؟! چونكە دیارە پێی كافر دەبێت، دەنا تا مرۆڤ كافر نەبێ كردەوەكانی هەڵناوەشێنەوە، بەبەڵگەی ئەوە ئایەتـەی كـە خوای پەروەردگار تێیدا دەفەرموێ: ﴿..وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَـئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ (البقرة ـ٢١٧) .

واتە: (وە هەر كەسێك لە ئێوە لە دینەكەی هەڵبگەرێتەوە و بـەكافریی بمرێ ئەوا كردەوە باشەكانی هەڵوەشاونەتەوە). كەواتە هەر میللەتێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ هیچ بڕیارێك نادات و هیچ بۆچوونێكی نابێت جیابێ لە هی پێغەمبەر ﷺ و هیچ بۆچوونێك زاڵ ناكات بەسـەر ئـەوەدا كـە پێغەمبـەر هێناویەتی. هەروەها خوای پەروەردگار هەر لەو بارەوە دەفـەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَـرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾ (الأحزاب ـ٣٦).

واتە: (هیچ پیاوێكی بڕوادارو ئافرەتێكی بڕوادار بۆیان نیە كاتێ كەخواو پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیارێك دەدەن مافی سەر پشك بوون و مافی هەڵبژاردن

بە خۆیان بدەن، هەر كەسێكیش سەر پێچی خواو پێغەمبەری خوا بكات ئەوە بە شێوەیەكی زۆر ئاشكرا ڕێی لێ ونبووە و سەرگەردان بووە) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەش مارە كردنی(زینب بن جحش) بوو، كە خۆی و (عبدالله)ی برایشی خوا لێیان ڕازی بێ هیچ كامیان ڕازی نەبوون بەوەی كە پێغەمبەر ﷺ (زەینەب) مارە بكات لە (زید بن حارثة) خوا لێی ڕازی بێت.

چونكە زەید بە كوڕ كراو(مُتبنَّى)ی پێغەمبەر بوو ﷺ وە لە سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتی دا زەید كۆیلە بوو پێغەمبەر ﷺ ئازادی كردبوو(تَبنّي) كردبوو (واتە كردبووی بە كوڕی خۆی)وەك عادەتی عارەبەكان لە سەردەمی نەفامیدا، جا لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئەو ئافرەتە قورەیشی بوو وە كچی پووری پێغەمبەر ﷺ بوو خۆی پێ لەوە بەرزتر بوو كەمارە ببڕدرێ لە كۆیلەیەكی ئازاد كراو، بۆیە خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارێ كە دەفەرموێ: (هیچ پیاوێكی بڕوادار ــ كەمەبەست[عبدالله بن جحش]ە ـ وە هیچ ئافرەتێكی بڕوادار ـ كە مەبەست لێرەدا(زینب بن جحش)ە ـ بۆیان نیە كاتێك خواو پێغەمبەری خوا بڕیارێك دەدەن مافی سەرپشك بوون و هەڵبژاردن بە خۆیان بدەن، بەڵكو دەبێ مل كەچ بن).

جا كاتێك كە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە،هەم (عبدالله)و هەم (زینب)یش ڕازی بوون و تەسلیم بوون[١].

كەواتە فەرمانی خوای لەسەر بووە كە (زینب) مارەبڕدراوە لە(زید بن حارثة) بەلاَم لە دواییشدا خوای پەروەردگار عزوجل وەك قەرەبوو كردنەوەیەك

(١) أخرجه الطبراني عن قتادة بسند صحيح ، بڕوانە (أسباب النزول) للسيوطي.

لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە جارێكی دیكە ـ دوای ئەوەی كە زەید زەینەبی تەڵاق دا ـ بۆ خۆی (سبحانە وتعالی) زەینەبی لە پێغەمبەر ﷺ مارە كرد بۆ ئەوەی بەم بڕیارەش عادەتێكی دیكەی هەڵەی عارەبەكان كە لە سەردەمی نەفامیی دا هەیانبوو هەڵوەشێنێتەوە ئەویش ئەوە بوو كە پیاو بۆی نەبوو هاوسەری ئەو كەسەی كە كردوویەتی بە كوڕی خۆی دوای ئەوەی كە تەڵاقی دەدات، مارە بكاتەوە .

جا دەگوترێ: زۆر جاران زەینەب شانازی دەكرد بە سەر خێزانەكانی دیكەی پێغەمبەردا ﷺ وە دەیگوت: ((أنتنَّ زوجكُنَّ أهاليكُن وأنا زوَّجني الله مِنْ فوق سَبْع سماوات)) واتە: (ئێوە كەسوكارتان مارەی بڕیون لە پێغەمبەر ﷺ بەڵام من خوا لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە مارەی بڕیوم) ئنجا لە ڕاستیدا شایستەش بووە كە ئەو شانازییە بكات. هەروەها هەر لە و بارەوە خوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ (النور-٥١) .

واتە: (بێگومان قسەی بڕواداران كاتێك كە بانگ دەكرێن بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی دادوەرییان لە نێواندا بكەن تەنها ئەمەیە كە بڵێن: بیستمان وە فەرمانبەریی مان كرد و ملكەچین!

واتە: بێجگە لەم قسەیە هیچ قسەیەكی دی قسەی مسوڵمان نیە، كەواتە مسوڵمان جگە لە بیستنمان و فەرمانبەرییمان كرد (سمعناو أطعنا) نابێ قسەیەكی دیكەی هەبێ لە بەرانبەر حوكمی خوا (عزوجلّ) و پێغەمبەری خوادا ﷺ.

## سێ یەم: سیمای بنەمای سێ یەمی كۆمەڵگایەكی ئیسلامی ئەوەیە كە كاروباری بەڕاوێژ بەڕێوە دەبات:

خوای زانا و زاڵ لەوبارەوە لە سوورەتی (الشوری)دا فەرموویەتی:
﴿ وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (٣٨) ﴾.

واتە: (وە ئیمانداران كەسانێكن كە بەدەم بانگەوازی خوای پەروەردگارەوە چوون و فەرمانی پەروەردگاریان جێ بەجێ كردوە، وە نوێژێ بەرپا دەكەن، وە كارەكانیان بەڕاوێژ هەڵدەسووڕێنن، وە لەوەی كە پێمان داون دەبەخشن) وەك دەبینین لێرەدا خوای بەرز (تبارك وتعالى) ڕستەی: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ)ی خستۆتە نێوان بەرپا كردنی نوێژو ماڵ بەخشینەوە، چونكە بەرپاكردنی نوێژ پایەیەكی ڕووحی و مەعنەویی مسوڵمانەتی یە، وە ماڵ بەخشین پایەی ئابووریەتی و كارو بار بەڕاوێژ بەڕێوەبردنیش پایەی سیاسی و كۆمەڵایەتیەتی. كەواتە: وەك چۆن ئینسان بەبێ نوێژ كردن و ماڵ بەخشین نابێ بە مسوڵمان، بەهەمان شێوەش بەبێ كارو بار بەڕێوەبردن بەڕاوێژیش نابێت بەو مسوڵمانەی كە خوا (سبحانه وتعالى) دەیەوێ!

شایەنی باسیشە وشەی (أَمْر) لە (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ)دا وەك زانایان دەڵێن: چەمك (مفهوم)ێكی گشتی هەیە، واتە هەر جۆرە كارو بارێك كە پێویستی بەڕاوێژ هەبێت، چ پەیوەندی بەلایەنی سیاسی یەوە هەبێ وەك هەڵبژاردنی سەرۆك و مشوورخۆران و بەڕێوەبەرانی وڵات و دەوڵەت چ پەیوەندی بە لایەنی ئابوورییەوە هەبێت، چ بە لایەنی كۆمەڵایەتییەوە، چ بە

لایەنی جەنگ و جیهـادەوە، چ پەیوەنـدی بـە نێـوان دەوڵـەتی ئیسـلامی و کیانەکانی دیکە وە هەبێ، چ پەیوەندی بەلایەنی فیکرییەوە هەبێ، یـان بـە لایەنی کلتوور یان ڕاگەیاندن ... هتـد ، لـە هـەموو لایەنـەکانی ژیـان دا کۆمەڵگایەکی مسوڵمان و ئیسلامی لە سەری پێویستە کارو باری بە ڕاوێژ بەڕێوە بەرێت، چونکە بەدیلی ڕاوێژ جگە لـە خـۆ سـەپاندن و تـاکڕەویی و دیکتاتۆریی و چی دیکە نیە!

## چوارەم: کۆمەڵگـای ئیسـلامی: لەسـەر بناغەی پابەندیی بە قورئـان و سـوننەتەوە گوێڕایەڵی کار بەدەسـتانی خۆی دەکات:

خوای بێ هاوەڵ لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ (النساء ـ٥٩).

بەڕێزان!

ئەم ئایەتە زانایان زۆر شتیان لێ هەڵێنجاوە کە دەرفەت نیـە هـەمووی باس بکەین...، بۆ نموونە: ئیمام شافیعی ڕەحمەتی خوای لە سەر بێ هەر چوار بنچینەکانی یاسادانانی لێ هەڵێنجاوە کە زۆربەی هـەرە زۆری زانایـان لـە سەریان یەك دەنگن، کە بریتین لە (قورئان و سوننەت و ئیجماع و قیاس).

چونکە فەرمانبەریی (إطاعة)ی خوا بەشوێن کەوتنی قورئـان دەکـرێ و فەرمانبەریی (إطاعة)ی پێغەمبەریش بە شوێنکەوتنی سوننەت دەکـرێ، وە گوێڕایەڵی کاربەدەستان بەکۆدەنگی زانایان دەکرێ کەپێی دەگوترێ (إجماع).

وەكەوتنە كێشەش لەگەڵ كاربەدەستان بەگێڕانەوەی بۆلای قورئان و سوننەت چارەسەر دەكرێ كە، ئەوەش پێی دەگوترێ (قیاس).

لێرەدا خوای پەروەردگار فەرمووپەتی: (ئەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە فەرمان بەریی خوا بكەن و فەرمان بەریی پێغەمبەر ﷺ بكەن وە هی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن.

جا لێرەدا پێویستە هەڵوەستەیەك بكەین، چونكە بەداخەوە زۆر كۆلكە مەلا ئەم ڕستەیە بۆ مەبەستی ناهەق بەكاردێنن و وادەزانن هەر كەسێك دەسەلاتی هەبوو بەسەر میللەتێكی مسوڵماندا ئەوە لەسەر ئەو میللەتە پێویستە كە گوێڕایەڵی ئەو كاربەدەستە بكەن چونكە خوا (جلّ وعلا) فەرمانی بەوە كردوە....!!. بەلاّم ئەوە ڕاست نیە، چونكە خوای پەروەردگار فەرموویەتی:﴿وأولوا الأمر منكم﴾ (كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن) جائایا چ كاربەدەستێك لە مسوڵمانانە؟! دیارە كاربەدەستێك كە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بكات، بەڵكو مشوورخۆران و كاربەدەستانی مسوڵمانان دەبێ لە مسوڵمانان چاكتر و زیاتر فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بن و پابەندی قورئان و سوننەت بن، چونكە خەڵك دەبێ دینداریی و مسوڵمانەتیی و ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی و ئەخلاقی ئیسلامی و برایەتی و... هتد یان لێوە فێربێ، ئەگەر نا وەك گوتراوە(فاقد الشيء لايُعطيه) كەسێك خۆی شتێكی نەبێ چۆن دەتوانێ لێی ببەخشێ! لێرەدا جێ سەرنج ئەوەیە كە خوای كاربەجێ (عز وجل) دەفەرموێ: ﴿ وأولوا الأمر منكم ﴾ و وشەی (إطاعة)ی بۆ (أولي الأمر)دوبارە نەكردۆتەوە، تاكو بزانرێ كە فەرمانبەریی (إطاعة)ی كاربەدەستان شتێكی سەربەخۆ نیە، وەك چۆن (إطاعة)ی خواو پێغەمبەری

خوا شـــتێکی سەربەخۆیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ چەند یاســا (حکم)ێکی هێناون لە ســـــوننەت دا کە لە قورئاندا نین، بەڵام مشـــــوور خۆران و کاربەدەستانی مسوڵمانان بۆیان نیە حوکمی شەرعی دابنێن بەڵکو دەبێ حوکمە شەرعییەکان لە قورئان و سوننەتدا هەڵبهێنجن وە لەبەر ڕۆشنایی قورئان سوننەتدا یاسا دابنێن و دیارە هەریاسایەکیش پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێ ڕەتکراوەیە(١) ، ئنجا هەر بەو شـــــێوەیەش هەر کەسێك لەسەر بنەمای قورئان و سوننەت نەبوویێتــە کاربەدەســتی مسوڵمانان، شەرعییەتی نیە، دیارە لەسەر بنەمای قورئان وسوننەت دانانی کاربەدەستانیش تەنیا ئەوە نیە کە کاربەدەستەکە مسوڵمان بێت! بەڵکو دەبێ مسوڵمانان بە ڕەزامەندیی خۆیان و بە ڕاوێژ هەڵیان بژاردبێ، چونکە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وأمرهم شورى بينهم ﴾ دیارە گەورەترین کار (أمر)ی مسوڵمانان بریتیە لە هەڵبژاردن و دانانی کاربەدەستان و مشوورخۆرانیان کە ئەویش پێویستە بەڕاوێژ بێ.

کەواتە: هەر ســـەرۆکێك و هەر دەسەڵات دارێك بە ڕاوێژ و بە پرس و ڕاو ڕەزامەندیی دانەنرابێ و مسوڵمانان خۆیان هەڵیان نەبژاردبێ و پەسەندیان نەکردبێ، ئەوە بێگومان بەکاربەدەست و دەسەڵات دارێکی شەرعی دانانرێ. ئنجا ئایا کاتێك کە مسوڵمانان لەگەڵ کاربەدەستانیان دا دەکەونە کێشەو مشت و مڕەوە دەبێ چ بکەن؟!

---

(١) وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَن احدث في امرنا هذا ما ليس منه فهو ردٌّ) رواه مسلم.

خوای پەنهانبین ئەوەشی ڕوونكردۆتەوە و فەرموویەتی: ﴿ فإن تنازعتم في شيء فردّوه الى الله والرسول﴾.

واتە: جا هەر كاتێك لە شتێك دا كەوتنە كێشە و مشت و مڕەوە ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا.

واتە: بۆ لای قورئان و سوننەت، قورئانی خوا (جلَّ وعلا) و سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ﴾ .

واتە: (ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە دەبێ وابكەن).

كەواتە: ئێمە دەبێ لەسەر بناغەی پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە گوێڕایەڵ بین بۆ كار بەدەستان و مشوورخۆرانمان جا چ بچووك بن چ گەورە، چ لەسەر ئاستی (سێ) كەس وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ كەس بە سەفەرێك ڕۆیشتن با یەكێكیان بكەنە برا گەورە[1]. جا هەر لە سێ كەسەوە بگرە هەتا میللەتێك دەبێ كۆمەڵگای مسوڵمانان و ئیسلامی بەقسەی كاربەدەستانی خۆی بكات لەسەر بنەمای پابەندیی یان بە قورئان و سوننەتەوە، ئەگەرنا لە ناشەرعیی دا فەرمانبەریی هیچ كەس ناكرێ. وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنما الطاعة في المعروف) رواه البخاري

واتە: بێگومان فەرمانبەریی كردن تەنها لە شتی چاك و شەرعی دایە.

## پێنجەم: كۆمەڵگایەكی ئیسلامی پیاوان و ئافرەتانی پشتیوان و هاوكاری یەكدین:

وەك خوای پەروەردگار لە ئایەتی (٧١)ی سوورەتی (التوبة)دا فەرموویەتی: ﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾

ئێستاش با بڕگە بڕگە سەرنجی ئەم ئایەتە بەهێز و پێزە بدەین:

سەرەتا خوای كاربەجێ تبارك و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ ﴾

واتە: (وە پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار هەندێكیان دۆست و پشتیوان و هاوكاری هەندێكیانن).

كەواتە: كۆمەڵگای ئیسلامی لە هەردووك ڕەگەزی (نێرومێ) پێكدێت كە هەردووكیان ئەهلی ئیمانن، وە پێكەوەش هاوكارن و هاریكارن و دەستبار بۆ یەكتر دەگرن. پاشان خوای بەرز و مەزن سبحانه وتعالى شەش بواری گرنگی دیاری كردوون بۆ هاوكاری پێكەوە كردن و دەستبار بۆ یەكتر گرتنی پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار كە هەموو لایەنەكانی ژیان دەگرنەوە:

١،٢: ﴿ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ﴾ (فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێگریی لە خراپە دەكەن)! شایەنی باسیشە كە مەبەست لە (المعروف)و(المنكر) ـ كە هەردووكیان تەلیف و لام (أل)ی جینسیان لەسەرە ـ سەرجەم چاكەو خراپەكانن بەبێ هەڵاواردن لە تێكرای بوارو لایەنەكانی دین و ژین دا، چ لە ڕووی عەقیدەوە، كە بێگومان خوا بە

یەکگرتن (التوحید) گەورەترین چاکەیەو هاوبەش بۆ خوا دانان (الشرك)یش لەو بوارەدا گەورەترین خراپە (منكر)یە، چ لە ڕووی عیبادەتەوە چ لە ڕووی سیاسەتەوە چ لە ڕووی ئابوورییەوە، چ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، چ لە بواری ئەخلاقی دا و هتد. لە تێکڕای بوارەکاندا پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار هاوکاری یەکتری دەکەن بۆ چەسپاندنی سەرجەم چاکەکان و لابردنی هەموو خراپەکان. دیارە چاکەش ئەوەیە کە شەرع بە چاکی بزانێ و خراپەش ئەوەیە کە شەرع بە خراپی بزانێ.

٣،٤: ﴿وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ﴾ (نوێژ بەرپادەکەن و زەکات دەدەن) دیارە ئەمانەش دووانن لەو چاکە (معروف)انەی کەدەبێ هەوڵی چەسپاندنیان بدەن.

٥،٦: ﴿وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ﴾ (وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خواش دەکەن) ئاشکراشە کەفەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا هەم فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە و هەم نوێژو زەکات و هەم غەیری ئەوانەش دەگرێتەوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ﴾ واتە: ئائەوانەن کە خوا بەزەیی پێیان دادێتەوە، ﴿ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ بێگومان خوا زاڵ و کاربەجێیە.

بەڵێ: بەرێزان پێکەوە هاوکار بوون و دەستبار بۆ یەکتری گرتنی هەردووك ڕەگەزی نێرو مێ لە کۆمەڵگای ئیسلامی دا یەکێکە لە بنەماو سیما بنەڕەتییەکانی ی هەر بۆیەش خوای بەرزو بێ وێنە لەگەڵێك ئایەتی قورئانی دا پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار پێکەوە پێناسەو وەسف دەکات، بۆ وێنە:

ئەو ئایەتەی كە لە سووڕەتی (ئەحزاب)دا هاتوە كە خـوای پـەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا (٣٥)﴾ .

وەك دەبینین خوای كاربەجێ (عزّوجل) هەر كام لـە پیـاوان و ئافرەتـانی مسوڵمانی بە: (ئیسلام و ئیمان و فەرمانبـەریی و ڕاسـتیی و خـۆڕاگریی و ملكەچیی و ماڵبەخشین و ڕۆژووگرتن و داوێن پاكیی و زۆر یادی خوا كردن) وەسف و پێناسە كردوە بەبێ جیاوازیی! كەواتە ئەم ئایەتانە و هاو وێنەكانیان بەڵگەن لەسەر ئەوە كە: پیاوان و ئافرەتان وەك یەك لە بەرانبەر دین و ژینی كۆمەڵگاكەیان دا بەرپرسیارن و پێویستە هەردووك لا وەك یەك شان بدەنـە بەر باری مسوڵمانەتی و لە هەر كۆمەڵگایەكدا ئافرەتان پەراوێز بكـرێن وە بواریان پێ نەدرێ كە ئەركە شەرعییەكانیان جێ بـەجێ بكـەن، ئـەوە ئـەو كۆمەڵگایە كۆمەڵگایەكی هاوسەنگ نیە و نالەبارو ناهەموارە! هەر بۆیەش ئێمە پێش ئەوەی بڵێین: ئافرەتان لە حاڵەتێكی وادا مافیان پێنەدراوە دەبـێ بڵێین ڕێگای دینداریـیان لێگیراوە! چونكە ئەوە كە دەبێ ئافرەتی مسـوڵمان بەشداربێ لە بەڕێوەبردنی كۆمەڵگایەكەی دا پێش ئەوەی (ماف) بێ ئـەرك (واجب)ە و ئەگەر نەیكات تاوانبار دەبێت ـ مادام بەهۆی كەمتـەر خـەمی كردنی خۆیەوە بێت نەك بەهۆی ڕێ لێ گیرانەوە ـ چـونكە وەك چـۆن خـوای پـەروەردگار لەسـەر پیـاوانی فـەرزكردوە كـە مشـووری بـەڕێوەبردنی

كۆمەڵگاكەیان بخۆن بەگوێرەی شەریعەتی خوا بەهەمان شێوەش لەسەر ئافرەتانی فەرز كردوە.

بەڵێ خوای پەروەردگار سروشتی پیاوان و ئافرەتانی لەبەر چەند حیكمەتێك لەیەك جیا ڕەخساندوە كە ئەمەش داخوازی ئەوە دەكات لە چەند ئەركێك دا لەیەك جیابن، بەڵام بێگومان هەر كامێكیان بەلەبەر چاو گرتنی تایبەتمەندییەكانی فیطرەت و سروشتی، لە بەرانبەر دین و ژینی خەڵك و كۆمەڵگایەكەی دا بەرپرسیارە.

**شەشەم: تێدا بچەسپێنرانی دادگەریی لە هەموو بوارەكاندا (لە بواری سیاسیی و ئابووری و كۆمەڵایەتی و .. هتد دا:**

(بەڵێ بەڕێزان! كۆمەڵگای مسوڵمان و ئیسلامی دەبێ كۆمەڵگایەكی دادگەر بێ و دادگەریی تێدا بەرقەرار بێ. خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الحديد) لە ئایەتی (٢٥)دا ئامانجی نێردرانی هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لەوەدا كورت هەڵدێنێ كە مرۆڤایەتی و خەڵك دادگەریی لە نێو خۆیاندا بچەسپێنن و بەدادگەریی بەڕێوە بچن: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾

واتە: (هەموو پێغەمبەرانی خۆمانمان ڕەوانە نەكردوە بە معجیزەو بەڵگەی ئاشكراوەو كتێب و تەرازوومان لەگەڵ ناردوونە خوارێ، تاكو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچن)، دیارە خوای بەرز لێرەدا بە دادگەریی بەڕێوەچوونیشی نەبەستۆتەوە بەلایەنێك لە لایەنەكانی ژیانەوە، بەڵكو بەرەهایی باسی دادگەریی كردوە، كەواتە دەبێ كۆمەڵگایەك كە شوێن پێغەمبەران (عليهم

الصلاة والسلام) و پەیام و بەرنامەکەیان دەکـەوێ، لەسـەرجەم لایەنـەکانی ژیان و گوزەرانی دا بەدادگەریی بـەڕێوە بچـێ و نابـێ هـیچ جـۆرە زوڵـم و ستەمێك هەبێ لە کۆمەڵگایەکی ئیسـلامیی دا و نابێ فەرق و جیایی و قرپیی و پرپیی و زاڵم و مەزڵوومی هەبێت لە ڕووی ئابووریی و سیاسییەوە و نابێ ئاغاو مسکێنی هەبێ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە و پێویستە خـەڵك وەك یەك بـن لەبەردەم شەریعەتی خوای دادگەردا لە هەموو ڕووێکەوە بە تایبەت لە ڕووی دادوەریی یەوە. هەروەها خوای دادگەر تبارك وتعـالی فـەرمانی بـە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ کردوە کە لە ڕووی سەرجەم مرۆڤایەتی دا بفەرمویَ: ﴿ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ﴾ (الشورى-١٥).

واتە: (وە فەرمانم پێکراوە کە لە نێوتـان دا دادگـەریی بەرپابکـەم)، وە خوای کاربەجێ (عزّوجل) لە سوورەتی (النسـاء)دا ڕوو لـە ئـەهلی ئیمـان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ (١٣٥) ﴾.

واتـە: (ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە زۆر بەجیـددی دادگـەریی بچەسپێنن). چونکە وشەی (قوّام) (صیغة المبالغة)ی (قائم)ە، واتە: زۆر بە جیددی دادگەریی بچەسپێنن لە هەموو بوارەکانی ژیان دا ئەگەر خۆتان بـە ئەهلی ئیمان دەزانن، ئنجا بێگومان دادگەرییش تەنها بەوە دەچەسـپێ کـە شەریعەتی خوا پیادە بکرێ، چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی پێغەمبەرانم هەموو بۆ ئەوە ناردوون کە دادگەریی بچەسپێنن، کەواتـە شـەریعەتی خـوا عزّوجل کە بە پێغەمبەران دا (علیهم الصـلاة والسـلام) ناردوویـەتی، بـۆ چەسپاندنی دادگەرییە و دادگەریی بەرهەم دێنێ، هەروەها خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ فَلا تَتَّبِعوا الهوى أن تَعْدِلوا﴾ (النساء-١٣٥).

واتە: جا بە دوای ئارەزوو مەكەون تاكو دادگەربن)، واتە كۆمەڵگایەكی مسوڵمان دەبێ بەدوای هەواو ئارەزووی خۆی و غەیری خۆشی نەكەوێ و دادگەربێ و دادگەریی بچەسپێنێ، بەهۆی چەسپاندنی شەریعەتی دادگەرانەی خوای كاربەجێ وە و بەرێوەچوون بەپێ ی یاساكانی یەوە.

**حەوتەم: نیشانەو بنەمای حەوتەمی كۆمەڵگای ئیسلامی ئەوەیە كە ژیان و ئاسایش و وەچەو كەرامەت و ماڵ و سامانی خەڵكی تێدا پارێزراو دەبێ:**

١- خوای بە بەزەیی (جلّ وعلا) سەبارەت بە پارێزرانی ژیانی خەڵك زۆر ئایەتی فەرمووە، یەكێك لەوانە: ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (البقرة-١٧٩)،

واتە: (وە لە تۆڵەدا ژیان هەیە بۆ ئێوە ئەی خاوەن عەقڵان بۆ ئەوەی پارێز بكەن). واتە پارێز بكەن و پارێزراو بن لە خوێن ڕێژیی بە ناهەق و لە سزاو جەزرەبەی خوای تۆڵەستێن لە دنیاو دوارۆژدا. دیارە هەم لە قورئاندا و هەم لە كتێبە شەرعیەكاندا، بە ڕاشكاویی باسكراوە كە سزای كوشتنی بە ئەنقەست كوشتنەوەیە ئەگەر خاوەن خوێنەكە بیەوێ، ئەگەر نا خوێن (دیة)ە.

٢- وە دەربارەی كەسانێك كە هێمنیی و ئاسایشی وڵات و خەڵك تێكدەدەن، خوای باڵا دەست فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم

مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ (المائدة ـ۳۳) .

واته: (بێگومان سزای كەسانێك كە دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەكەن، وە خراپەو پەشێوی لە زەویدا بڵاودەكەنەوە ئەوەیە كە بكوژرێن یان هەڵبواسرێن، یان دەست و پێی ڕاست و چەپیان ببڕیٚ، یان لەسەر زەوی دوور بخرێنەوە، ئەوە سزای ڕیسواكەریانە لە دنیادا و لە دوارۆژیش دا ئازارێكی مەزنیان هەیە.)

جا ئایا دژایەتی كردنیان بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ لە چیدا بەرجەستە دەبیٚ؟ دیارە لە بڵاوكردنەوەی پەشێوی و فەسادو تێكدانی هێمنیی و ئاسایشی خەڵك، وە خوا چوار سزای بۆ داناون:

١. كوشتن ٢.كوشتن و هەڵواسین.

٣. بڕینی دەست و پێی ڕاست و چەپیان ٤. دوورخستنەوەیان.

دیارە هەركام لەو سزایانە بەپێ ی ئەو تاوانانە كەدەیان كەن. بەسەریان دا دەچەسپیٚ و زانایان بەدوورو درێژی باسیان كردوە و پوختەی قسەكانیان ئاوایە:

ئەگەر خەڵكیان كوشتبوو ماڵیشیان لیٚ ستاندبوون، دەكوژرێن و هەڵیش دەواسرێن، بەڵام ئەگەر تەنها خەڵكیان كوشتبوو ئەوە بەس دەكوژرێن. وە ئەگەر تەنها خەڵكیان ڕووت كرد بوو و ماڵ وسامانیان لیٚستاند بوون، ئەوە سزایەكەیان ئەوەیە كە دەستی ڕاست و پیٚ ی چەپیان دەبڕدریٚ. وە ئەگەر تەنها خەڵكیان ترساندبوو ئەوە لەو وڵات و شوێنە دووردەخرێنەوە.

٣- وە خوای کاربەجێ دەربارەی سزای کەسانێك کە نەسل و وەچەی خەڵکی دەخەنە مەترسییەوە ـ لە ڕێ ی داوێن پیسییەوە ـ فەرموویەتی:

﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾ (النور ـ٢).

واتە: (ئافرەتی داوێن پیس و پیاوی داوێن پیس هەر کامێکیان سەد قەمچیان لێ بدەن....).

٤- وە دەربارەی کەسانێك کە ئابڕوو و کەرامەتی خەڵکی دەڕووشێنن و تۆمەتی داوێن پیسییان دەدەنە پاڵ بە ناهەق و بێ بەڵگەی شەرعیی فەرموویەتی: ﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً ﴾ (النور ـ٤)

واتە: وە ئەوانەی کە ئافرەتان(یان پیاوان)ی داوێن پاك ـ بەڵام لەبەر ئەوەی تۆمەت زیاتر بۆ ئافرەت دەکرێت بۆیە تەنها باسی ئافرەتان کراوە ئەگەر نا، کەسێکیش بوختان بە پیاویش بکات هەر هەمان سزای هەیە ـ تۆمەتباردەکەن بە داوێن پیسیی پاشان چوار شایەدان ناهێنن، سزاکەیان ئەوەیە کە (هەشتا)قەمچیان لێ بدەن وە هەرگیز شایەدییان لێ وەرمەگرن وە ئائەوانەن لەڕێ دەرچووان.

٥- کەسانێکیش کە ماڵ و سامانی خەڵکی دەخەنە مەترسییەوە سزای دەست برینیان بۆ دانراوە وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (المائدة –٣٨) .

واتە: (پیاوی دز و ئافرەتی دز دەستیان ببڕن ئەوە سزایەکی سڵەمێنەرەوەیە وە خوا زاڵ و کاربەجێیە).

كەواتە: هەر كەسێك ژیانی خەڵك و هێمنیی و ئاسایشیان و نەسل و وەچەیان و كەرامەت و ئابڕوویان و ماڵ و سامانیان لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا بخاتە مەترسییەوە، دەبێ سزا بدرێ دیارە سزایەكەش لەلایەن خوای كاربەجێ وە ڕاگەیەندراوە چونكە لە قورئاندا تەنها ئەو(پێنج) سزایە هەن كەدیاری كراو(محدّد) بن، هەر چەندە سزای دیكەش هەن بەڵام ئاوا بەو شێوەیە دیاری(محدّد) نەكراون وەك خوای پەروەردگار لە بارەی ئافرەتانێك كە هاو جینسی لەگەڵ یەك دەكەن یان پیاوانێك كە پێكەوە هاوجنسی دەكەن. لە سورەتی (النساء)دا فەرموویەتی:

﴿ وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىَ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً (١٥) وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا (١٦)﴾.

لێرەدا سزای دیاری كردوە بەڵام سزایەكە شتێكی گشتی یە و دەبێ دەسەڵاتی شەرعی بەگوێرەی حاڵەتە جیاجیایەكان و بە ئیجتیهادی خۆی بۆ هەركام لە تاوانباران دیاری بكات. بەڵام بێگومان ئەو(پێنج)سزایەی پێشەوە وانین بەڵكو بەوردی دیاری كراون، ئینجا شایانی باسیشە كە هەر كۆمەڵگایەك ئەو پێنج شتەی ـ كە ئەو پێنج سزایانەیان بۆ دانراون ــ تێدا پارێزراوبن، ئەوە ئەو كۆمەڵگایە پارێزراو دەبێ و تۆكمەو دامەزراو دەبێ و بەختەوەر و كامەران و پاك و پوختە دەبێ.

**هەشتەم: بنەماو سیمایەکی دیکەی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی ئەوەیە کە درووشمەکانی خوا پەرستی تێدا بەرجەستە دەکرێن:**

وەك پێشتر گوتمان لە کۆمەڵگایەکی مسوڵماندا تەنها خوا دەپەرستریّ. تنجا تەنها خوا پەرستانیش هەندێك دروشمی مەعنەویی و تایبەتی هەن، وەك: نوێژ و ڕۆژوو حەج و عومرە و یادی خوا کردن و نوێژەکانی جەژنی ڕەمەزان و قوربان و نوێژی خۆرگیان و مانگ گیان و نوێژی داواکردنی باران و، قوربانی سەربڕین و نەذر و پاڕانەوە... هتد کە ئەمانە پێیان دەگوتریّ: درووشمەکان(الشعائر) چونکە دروشم و نیشانەی مسوڵمانەتیی و خواپەرستیی تاك و کۆمەڵی مسوڵمانن. خوای پەروەردگار دەفەرمویّ:
﴿الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ﴾ (الحج-٤١)، وە دەفەرمویّ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ﴾ (البقرة-١٣٨)
وە دەفەرمویّ: ﴿وأتموا الحجّ والعُمرة لله﴾ (البقرة-١٩٦) وە دەفەرمویّ:
﴿ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى الْقُلُوبِ ﴾ (الحج-٣٢) .
وە دەفەرمویّ: ﴿ ياأيها الذين آمنوا اذكروا الله ذكراً كثيراً ﴾ (الأحزاب-٤١). وە دەفەرمویّ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ﴾ (الجمعة-٩)، وە دەفەرمویّ: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ..﴾ (غافر-٦٠). وە دەفەرمویّ: ﴿فصلِّ لربك وانحرْ﴾ (الكوثر-٢).
بەڵێ بەڕێزان!

لە کۆمەڵگایەکی ئیسلامی دا سەرجەم ئەم درووشمانەی خواپەرستیی ج بەشێوەی تاکی چ بەکۆمەڵ و هەرەوەزیی، بەڕێز و حورمەت و شکۆوە بەڕێوە دەبرێن و ئەو پەڕی گرنگی و بایەخیان پیّ دەدریّ، بەپیّ ی فەرمانی خوا جلّ

وعلا: ﴿ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى الْقُلُوبِ ﴾ (الحج -٣٢)، وەك دەبینین خوای بەرزو مەزن ڕێزلێگرتن و بەمەزن گرتنی درووشمەکانی خۆی بەمایەی هەبوونی پارێزکاریی داناون!

نۆیەم: بنەماو نیشانەیەکی دیکەی کۆمەڵگای ئیسلامی ئەوەیە ئادابە شەرعییە بەرزەکان و ڕەوشتە پەسەندەکانی تێدا بەرقەرار دەبن، ڕەخسڵەت و ڕەوشتە نزم و پەستەکانیشی تێدا بەر کەنار دەبن و دوورییان لێ دەکرێ:

وەك:

١- وەژوور نەکەوتن لەماڵی یەکدی بەبێ مۆڵەت وەرگرتن و سەلام کردن:
﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ﴾ (النور -٢٧).

٢- هەرکات ئینسان سڵاوی لێ کرا پێویستە بەچاکتر لە خۆی یان بەلایەنی کەم وەك خۆی وەڵامی بداتەوە:
﴿وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا﴾ (النساء -٨٦).

٣- پێویستە هەرکام لە پیاوان و ئافرەتان لەبەرانبەری یەکدی دا چاوی خۆیان بگرنەوە لە سەرنج دان و ڕوانینی ئارەزوومەندانە:
﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ (٣٠) وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ....(٣١)﴾ النور .

٤- نابێ ئافرەتان هیچ شوێنێك لەجوانی جەستەیان دەربخەن بێجگە لەوەی کە بە ناچاریی و لە کاتی عیبادەت دا و بەعادەت دەردەکەوێ کەدەم و چاوو

هەردووك دەستی، وە دەبێ سنگ و بەرۆكی خۆیان بە زیادەی سەرپۆشەكانیان دابپۆشن: ﴿.... وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ ...﴾ (النور-٣١).

٥- پێویستە تاك تاكی مسوڵمانان بەهەردووك ڕەگەزی نێرو مێیانەوە خۆیان لە سەرجەم ڕەفتارو خەسڵەتە دزێوو زیانبەخشەكان بپارێزن. وەك: گاڵتە بە یەكدی كردن و ناوو ناتۆرە لە یەكدی هەڵدان و عەیب لە یەكدی گرتن و گومانی خراپ بەیەكدی بردن و جاسووسیی لە سەر یەكدی كردن و پاش ملە بە خراپە باسی یەكدی كردن:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاء مِّن نِّسَاء عَسَى أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (١١) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ (١٢) ﴾ الحجرات .

وەك دەبینین خوای دادگەر هەركام لەو شەش خەسڵەتە دزێوانەی بە گوناهی گەورە لە قەڵەم داوە و كردوونی بە مایەی(فاسق) بوونی ئینسان و سزادرانی! هەروەها هەر خەسڵەت و سیفەتێكی دیكەی دزێوو خراپ لە قورئاندا قەدەغە كراوە وەك زانایان گوتوویانە: هیچ شتێكی باش نیە كە لە قورئانێدا پێویست نەكرابێ لەسەر مسوڵمانان و هیچ شتێكی خراپیش نیە كە لێیان قەدەغە نەكرابێ.

**دەیـەم: بنەماو نیشانەیەكی دیكەی كۆمەڵگای ئیسلامی ئەوەیە كە لـە بەرانبـەر ئـەو كلتـوور و فەرهەنگانـەدا كـە فیكـری بەشـەر بەرهەمیان دێنێ عەقڵ و چاوی كراوەیە.**

بە شێوەیەك كە هەموو شتێكی سوود بەخش و پەسەندو چاك وەردەگرێ و هەزمی دەكات، بەڵام بە لە بەرچاو گرتنی هێڵـە گشـتییەكانی شـەریعەتی دادگەرانەی خوای پەروەردگار كە دەرگای ئاوەڵایە و فەرمان بەشوێنكەوتووانی دەكات و هانیان دەدات بۆ وەرگرتن و پێشوازی لێكردنی هەموو شتێكی باش: ﴿ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُوْلَئِكَ هُمْ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ ﴾ (الزمر ـ١٧،١٨)

واتە: جا مژدە بدە بە بەندەكانم ئەوانەی كە هەموو قسـەیەك دەبیسـتن بەڵام شوێن ئەوەی دەكەون كەچاكترە و هەڵی دەبژێرن، ئائەوانە كەسانێكن كە خوا ڕێڕوونی كردوون، وە هەر ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

بەڵێ كۆمەڵگای مسوڵمان كۆمەڵگایەكی داخراو نیـە بـەڵكو كراوەیـە بەڕووی هەر زانیـاریی و ئـەزموون و فیكرەیـەكی چـاك و بەسـوود دا، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (( الحكمة ضالة المؤمن بحيث وجدها فهـو أحق بها ))[1] واتە: (زانیاریی بە سوود شتێكە لە مرۆڤی بڕوادار ون بووە و لە هەرشوێنێك بیدۆزێتەوە لە هەموو كەس زیاتر حەقی پێوەیە)

(١) رواه الترمذي برقم : ٢٦١١ و ابن ماجة برقم : ٤١٥٩ .

**یازدەیەم: سیماو نیشانەیەکی دیکەی کۆمەڵگای ئیسلامی ئەوەیە کە تێیدا بانگەواز دەکرێ بۆ ئیسلام وە فەرمان بە هەرچی چاکەیە دەکرێ و ڕێ لە هەرچی خراپەیە دەگیرێ:**

وەك خـــوا فەرمویەتی:
﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ (آل عمران ـ ١٠٤).

**دوانزدەیەم: وە لە کۆتایی دا، کۆمەڵگای ئیسلامی لەسەر بناغەی وەفـاداریی و دادگـەریی و چـاکەکاریی و هاوکـاری لەگـەڵ کەمایەتییە دینییەکاندا ڕەفتار دەکات:**

بۆیـەش گوتوومانـە کەمایەتییـە دینییـەکان چـونکە لەکۆمـەڵگای ئیسلامی دا کەمایەتی نەتەوەیی نیەو نەتەوەکان[١] هـەموویان وەك یـەکن و تەماشای ئەوە ناکرێ داخۆ کێ لە نەتەوەکان زیـاترەو کـێ کـەمترە!، وە بـە هەموویان یەك ئۆممەت پێك دەهێنن کە ئۆممەتی ئیسلامە:
﴿ إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً ﴾ (الأنبياء ـ ٩٢)

بەڵام لە کۆمەڵگای ئیسلامیی دا یەك جـۆرە کەمینـە (أقليـة) هەیـە ئەویش کەمینەی دینی یـە، کـە بریتیـە لـە هـەمور ئـەو خـاوەن فیکـرەو بەرنامانەی کە بە دوای ئیسلام ناکەون و بڕوایـان بـە ئیسـلام نیـە، جـا چ لەئەسڵدا ئایینی ئاسمانی بووبن و دوایی گۆڕابن و شێوێنرابن، وەك: جوولەکەو

(٢) نەتەوە ، گەل ، تەرجەمەی (شعب) ، لە زمانی عارەبی دا.

دیانەتی (الیهودیة والنصرانیة)یان هەر لە بنەڕەتەوە دەستكردی ئینسان بن، بەڵێ لەسایەی كیان و دەوڵەتێی ئیسلامی دا ڕێگا دەدرێ بەهەر خاوەن فیكرەیەك كە دوای فیكرەكەی خۆی بكەوێ، واتە تەنها جوولەكەو نەصرانییەكان مافی ئەوەیان پێ نەدراوە كە لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامی دا كیانێكی دینی دابنێن بەڵكو هەموو خاوەن فیكرەیەك ئەو مافەی هەیە:

﴿ فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر ﴾ (الكهف ـ٢٩).

﴿ لاإكراه في الدين ﴾ (البقرة ـ٢٥٦)

واتە: لەقبووڵ كردنی بەرنامەی ژیاندا زۆری كردن نیە. هەر كەسێك چ بەرنامەو ڕێبازێك هەڵدەبژێرێ باهەڵی ببژێرێ، لە ئیسلام دا كوفر مەنع نەكراوە بەڵام زوڵم مەنع كراوە، واتە: لەئیسلام دا ڕێگا لەخەڵك نەگیراوە كەكافر بن بەڵام ڕێگایان لێ گیراوە كەزاڵم[1] بن، زانایانیش جوانیان گوتوە: (قد يدوم الملك مع الكفر ولا يدوم مع الظّلْم) واتە:. موڵك و دەسەڵات لەگەڵ كوفردا بەردەوام دەبێ بەڵام لەگەڵ زوڵم دا بەردەوام نابێ.

ئەم چەند ئایەتەش دەكەین بەكۆتایی ئەم باسە:.

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿وأوفوا بالعهد إذا عاهدتم﴾ (النحل ـ٩١).

واتە: (لەگەڵ هەر كەسێك پەیمانتان هەبوو بیگەیەننەسەر و مەیشكێنن).

---

(١) لە كتێبی (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)دا لە كاتی توێژینەوە ■ (مافەكانی مرۆڤ) و (جیهانێتی ئیسلام و جیهانگیریی)دا ئەو بابەتە تاڕادەیەكی باش ڕوون كراوەتەوەو بە بەڵگەی شەرعی پتەو پتەو سەلمێنراوە .

٢- وە دەفەرموێ: ﴿ ولايجرمنّكم شنآن قومٍ على ألاّ تعْدِلوا﴾ (المائدة -٨) .

واتە: (با ڕق هەڵسانتان لەكەسانێك كە نەیاری فیكرییتان لەگەڵیان هەیە، واتان لێ نەكات كە نا دادگەربن).

٣- وە دەفەرموێ: ﴿ لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴾ (الممتحنة -٨).

واتە: خوا ڕێگاتان لێ ناگرێت بۆ كەسانێك كە لە سەر دینتان دژایەتی تان ناكەن و جەنگتان لەگەڵ ناكەن و لە ماڵ و حاڵی خۆتان دەرتان ناكەن كە لەگەڵیان چاكەكاربن و بەشێك لە ماڵ و سامانتانیان بەش بدەن[1] بێگومان خوا ماڵی خۆبەخشەرانی خۆش دەوێ.

واتە: خوای بەرزو بێ وێنە (تبارك وتعالى) مسوڵمانێكی خۆش دەوێ و لای پەسندە كە لەگەڵ هاوولاتی یە نامسوڵمانەكان دا چاكەكار و بەخشندە بێ و دەست باریان بۆ بگرێ.



(١) چونكە (أقسط إليه) یانی: ( أعطاه قسطاً و نصيباً من ماله ) .
واتە: بەشێك لە ماڵ و سامانی خۆی پێدا .

الحمدلله وكفى وصلاته وسلامه على عباده الذين اصطفى، خصوصاً سيّدهم وخاتمهم محمد المصطفى و آله أجمعين من الصحب و الأزواج والقرابة و التابعين لهم بأحسان إلى يوم الدين .

بەڕێزان:

مەبەستمان لە كار وچالاكی ئیسلامی هەموو ئەو هەوڵ و كۆششانەیە كە دەدرێن، بە مەبەستی بەرپاكردنی دین لە ژینی كۆمەڵگاو دەورویەردا لە بواری فیكریی، بانگەواز، ڕاگەیاندن، كۆمەلایەتی، سیاسی ...هتد.

واتە: مەبەستمان لە كارو جوجۆڵی ئیسلامی ئەو كردو كۆششانەیە كە چ فیكریی بن چ مادیی، چ تاكیی بن چ كۆمەڵیی، دەویسترێ بە هۆیانەوە (دین)ی خوا لە ژیان دا بەرپا بكرێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿....أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ...﴾ (الشورى-١٣).

واتە: ئایین بەرپا بكەن و تییدا پەرتەوازە مەبن، بەڵێ . لەسەر مسوڵمانان پێویستە كە هەرچی وزەو توانایانە بیخەنە گەڕ تاكو دینی خوا بەرپا بكەن لە ژیانی خۆیانداو بە پێی شەریعەتی خوا ژیانی خۆیان ڕێكبخەن، جا دیارە ئەوەش بەبێ هەوڵ و تەقەللا بۆدان ناكرێ و دەبێ خەڵك لە دین تێ بگەیەنرێ و بەر چاوی ڕۆشن بكرێتەوە و ڕاستییەكانی ئیسلامیان لێ حاڵی بكرێ و بیرو بۆچوونی نەیارەكانی ئیسلامیان بۆ بپووچێنرێتەوە و، لە هەموو لایەنەكانی ڕووحی و ئەخلاقی و كۆمەلایەتی و سیاسی و ئیداریی و ـ هتددا پەروەردە بكرێن و ساز و تەییار بكرێن، جا هەموو ئەو

جموجۆڵ و چالاكییانەی كە لەو بازنەیەدا خۆیان دەبیننەوە پێیـان دەگـوترێ: (كارو چالاكی ئیسلامیی) ئنجا هەر لێرەشەوە دەزانـین كـە حـوكمی كـار و چالاكی ئیسلامی چی یە؟!

چونكە ئەگەر بگەڕێینـەوە بـۆ حەقیقـەت و ماهیـەتی كـار و چـالاكی ئیسلامی دەبینین كە هەر كام لە موفرەدەو چالاكییەكانی كـاری ئیسـلامی بەشێكە و جۆرێكە لـە جۆرەكـانی فەرمانبـەریی (طاعـة)و خـوا پەرسـتی (عبادة)بۆچی؟!

چونكە: خوای پەروەردگار وەك چۆن پێ ی فەرمووین ئیمان بێنن:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ آمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِيَ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ...﴾ (النساء ـ١٣٦)

وە وەك چۆن پێی فەرمووین كە خوا بپەرستین:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ ﴾ (البقرة ـ٢١)، وە وەك چۆن لە سەری فـەرز كردووین كە ڕۆژوو بگرین :

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ ﴾ (البقرة ـ١٨٣)

بە هەمان شێوەش ئەو شتانەی دیكەشی لە سـەر فـەرز كـردووین، كـە دەچنە نێو جوغزو بازنەی كارو چالاكی ئیسلامییەوە: وەك بانگەوازی خـەڵك بۆ لای خوا: ﴿أدْعُ الى سبيل ربِّك﴾ (النمل ـ١٢٥)،

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّـهِ وَعَمِـلَ صَـالِحًا وَقَـالَ إِنَّنِي مِـنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ (فصلت ـ٣٣) ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَـدْعُونَ إِلَـى الْخَيْـرِ وَيَـأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ..﴾ (آل عمران ـ١٠٤) ؛ وە فەرمانی پێ كردووین كە دادگەری بچەسپێنین: ﴿ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴾(الحديد ـ١٥)

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ﴾ (النساء ـ١٣٥) وە فـەرمانی پێ کردوین کە سزا شەرعییەکان بەسەر ئەو کەسانەدا بچەسپێنین کە ژیان و هێمنیی و ئاسایش و ئابڕوو و کەرامەت و نەسل و وەچەو مـاڵ و سـامانی خەڵکی دەخەنە مەترسییەوە وەك پێشتر باسمان کرد لە دەرسی پێشوودا.

کەواتە : کارو چالاکی ئیسـلامی کە دەیەوێ شەریعەتی خوا بەر قەرار بکات و دینی خوای پەروەردگار بەرپابکات و کۆمەڵگا وا لێ بکات بە پێی شەریعەت و دینی خوا بە ڕێوە بچێ، جۆرێکە لە جۆرەکانی خوا پەرستیی (عبادة) و فەرمانبەریی (طاعة)بۆ خوا (عزّوجلّ)، بەڵکو زۆر جۆرە (عبادة)و (طاعة)یش لە خۆیدا کۆدەکاتەوە. شتێکی ئاشکراشە کە خوای کار بەجێ وەك سەرجەم ئۆممەتانی پێشوو ئۆممەتی (محمد ﷺ )یشی مولزەم کردوە بە پەیڕەویی لێکردن و شوێنکەوتنی شەریعەتەکەی وەك فەرموویەتی :

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاء الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ (١٨) إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ (١٩)﴾ (الجاثية).

لە ئایەتەکانی پێشەوەدا خوای پاك و تاك (عزّ وجلّ) باسـی ئـەزموونی دینداریی ئەهلی کیتاب دەکات پاشان دەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ﴾

واتە: (دوایی تۆمان داناوە لەسەر بەرنامەیەك لە دینی خۆمان)چونکە شەریعەتی محمد ﷺ یەکێکە لەو شەریعەتانەی کە لە دینـە گشـتییەکەی خوای پەروەردگارەوە هەڵێنجراون، ئەو دینە گشتییەی کە هەموو پێغەمبەرانی (علیهم السلام) پێ ڕەوانە کراوە شەریعەتی محمد المصطفی ﷺ بەشێکە لەو دینە گشتییە کەواتە لێرەدا (من) لە (من الأمر)بۆ هەندێك (تبعیض)ە.

(فاتَّبِعْها) جا شوێنی بکەوە ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاء الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (بە دوای ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن)

ئەوانەی کە نازانن کێن؟

هەموو ئەوانەن کە بەرنامەی ژیانیان لە خواوە وەرنەگرتوە، ئەوانەن کە بە دوای هیدایەتی خوا ناکەون، وە هەر کەسێك کـە بـە دوای بەرنامــەی خـوا ناکەوێ نەزانە بۆ؟ چونکە دیارە نازانێ کێ دروستی کـردوە! وە نازانــێ لـە کوێوە هاتوە!، وە نازانێ بۆ کوێش دەچێت! نازانێ بۆچـی دروسـت کـراوە! وە نازانێ ئەرك و وەزیفەی چییە لە ژیاندا، وە هەر بەرنامەیـەکیش دابـنێ بـۆ ڕێکخستنی ژیانی لەسەر بناغەی نەزانی و نەفامی دایدەنێ، بۆچی؟

چونکە تەنها خوای پەروەردگار نهێنییەکانی ئینسان و ژیان و بوونەوەر و دونیاو دوا ڕۆژ دەزانێت و ژیانی ئینسانیش پەیوەندی هەیە بە دونیا و بە دوا ڕۆژەوە و، پەیوەندی هەیە بە ڕووح و جەستەوە و بە ئێستا و داهاتووەوە و، بە تاك و خێزانەوە، وە جا ئەو زانیارییــە دەورەدەر(محـیط)ەش تـەنها لای خـوای پەروەردگارە هەر بۆیەش خوای بەرز و بێ وێنە (عزَّوجلَّ) لە بارەی قورئانەوە دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ (الفرقان ـ٦).

واتە: (کەسێك قورئانی ناردۆتە خوارێ کە نهێنییەکانی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ).

کەواتە: کەسێك شایستەی ئەوەیە کە بەرنامــە بـۆ ئینســان دابـنێ کـە شارەزاو ئاشنای نهێنیەکانی ئاسمان و زەوییە و هەموو نهێنی یەکانی لایـە، ئەویش تەنها خوای پەروەردگارە (تبارك و تعالى) هەروەها خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرمووێ:

﴿ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ٥٠﴾ .

واتە: (ئایا ئەوانە بەرنامەی نەفامیێتی دەخوازن! جا کێ بەرنامەی چاکتری هەیە لە خوای پەروەردگار بۆ کەسانێك کە ئیمان و یەقینیان هەبێ بە پەروەردگاریێتی خوا).

لێرەش دا خوای پەروەردگار خەڵکی خستۆتە نێوان دوو حوکمەوە و ڕایگەیاندوە کە ناچارن حەتمەن یەکێکیان هەڵبژێرن: حوکمی خواو حوکمی نەفامی، بەڵێ بەدیلی حوکمی خوا کە ئیسلامە حوکمی نەفامییە کە غەیری ئیسلامە هەر چی یەك بێت و هەر ناوو نیشانێکی هەبێ.

ئنجا خوای کار بەجێ (عزَّوجلَّ) لە سوورەتی (المائدة)دا دوای ئەوەی باسی تەورات و ئینجیل دەکات کە وەك بەرنامەی ژیان و گوزەران بۆ جوولەکەو نەصرانییەکانی ناردوونە خوارێ دەفەرموێ:

﴿ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ..(٤٨)﴾ .

واتە: (وە ئەم کتێبەمان بۆ تۆ نارد بۆیە (الكتاب)م بە ئەم کتێبەم مانا کرد، چونکە (الکتاب)(ال)ی (عهد)ی لەسەرە، واتە ئەو کتێبەی کە ناسراوە کە قورئانە)ئەوەی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ ــ قورئان دان بە هەموو ئەو کتێبانە دادەنێ کە لە لایەن خواوە هاتوون . دان بە ئەسڵەکەیان دادێنێ نەك بەو حاڵەتەی ئێستایان کە بێگومان تەحریف کراون و گۆڕانیان بەسەر داهێنراوە)ـ ﴿وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾ واتە: وە قورئانمان ناردوە کە چاودێر بێت بەسەر کتێبەکانی پێش خۆیەوە (کە ئەگەر هەڵەو کەم و کوڕییەکیان تێدا بێت ـ

كە بێگومان تێشیان دایە وەك خوای زانا وپەنهانبین لە قورئانیٰ دا هەواڵی پێداوین ـ ڕاستییان دەكاتەوە) ﴿ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ ﴾

خوای (عزَّوجلَّ) بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٰ: كەواتە تۆ حوكمیان لە بەین دا بكە بەوە كە خوا ناردوویەتی ﴿ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ ﴾ وە بە دوای ئارەزووەكانیان مەكەوەو نەچی لەو حەقە لابدەی كە بۆت هاتوە. ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴾ چونكە بۆ هەر كامێكتان بەرنامەو پەیڕەوێكمان داناوە (واتە بۆ جوولەكە و بۆ نەسرانی و بۆ سەرجەم ئۆممەتانی پێشوو بۆ هەر كامێكیان خوای پەروەردگار بەرنامەو پەیڕەو ڕێبازێكی داناوە كە لەگەڵ ژیان و گوزەران و قۆناغ و هەل و مەرجێك كە تێیدا ژیاون پڕ بە پێست بووە، جا ئەی موحەممەد ﷺ بۆ تۆش و ئۆممەتەكەشت بەرنامەو ڕێبازێكمان داناوە كە لە قورئان دا بەرجەستە دەبیٰ و تۆش دەبیٰ بە سوننەتی خۆت شەرحی بكەی و ڕوونی بكەیەوە)، چونكە پێغەمبەر ﷺ سوننەتەكەی هەر بریتییە لە شەرحی قورئان بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی كە دەفەرمویٰ: ﴿ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ[1] لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل ـ ٤٤).

واتە: (قورئانمان بۆ تۆ ناردووە تاكو ئەوەی كە بۆیان نێرراوەتە خواریٰ بۆیان ڕوون بكەیەوە و بەڵكو خۆشیان بیر بكەنەوە. كەواتە: پێغەمبەر ﷺ مولزەم كراوە كە بە دوای شەریعەتی خوا بكەویٰ و بە دوا ئەو كتێبە بكەویٰ كە خوا ناردوویەتی وە بەو حوكمەش كە خوا ناردوویەتی حوكم لە نێوان

---

(١) (الذكر) یەكێكە لە ناوەكانی قورئان، چونكە باسی خوای تێدایە و ڕاستییەكان دەخاتەوە بیر مرۆڤ و ...هتد.

ئۆممەتەكەیدا بكات. جا دیارە پێغەمبەریش ﷺ سەر مەشقی ئۆممەتەكەیەتی، بەڵكو خوای پەروەردگار شوێن كەوتنی پێغەمبەری ﷺ لە هەموو بوارەكان دا كردوە بە بەڵگەی ئەوە كە ئایا ئێمە خوامان خۆش دەوێ یان نا؟! وە كردووشیەتی بە هۆكاری ئەوە كە خوا خۆشی بوێین وەك لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣١) قُلْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ فإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ (٣٢)﴾

لێرەدا خوای پەروەردگار پێغەمبەری خۆی دەدوێنی و پێ ی دەفەرموێ كە بە خەڵكی بە گشتی و بە ئۆممەتەكەی بە تایبەت بڵێ: (ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن خواتان خۆش دەوێ ـ جلَّ شأنه ـ دەبێ شوێنم بكەون ـــ (كەواتە: شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە لایەن مرۆڤەوە بەڵگەی خۆشەویستی یەتی بۆ خوا (تبارك و تعالى) و بەو بەڵگەیە ئیسپاتی دەكات كە خوای پەروەردگاری خۆش دەوێ ... چۆن؟!

دیارە خوای پەروەردگار پێغەمبەری خۆی لە هەموو كەس خۆشتر دەوێ وە لە هەموو كەس لەلای بەڕێزترە، كەواتە كەسێك بەڕاستی خوای خۆش بوێ دەبێ بە دوای خۆشەویستی خواش بكەوێت. پاشان دەفەرموێ: ﴿يُحْبِبْكُمُ اللهُ﴾ واتە: ئەگەر شوێنی پێغەمبەر كەوتن مانای وایە ئیسپاتتان كردوە كە بە ڕاستی خواتان خۆش دەوێ دیارە هەر كاتێك كە واش بوون ئەوە خواش خۆشی دەوێن.

﴿ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾

واتە: وە لە گوناهەكانتان دەتانبورێ، وە خوا لێبوردەو بە بەزەیی یە .

پاشان جارێكی دیكە خوای بەرزو بێ هاوتا ڕوو دەكاتە پێغەمبەر ﷺ و دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ فإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ ﴾

پێیان بڵێ: فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بكەن جا ئەگەر پشتیان هەڵكرد ئەوە دڵنیا بە خوا كافرانی خۆش ناوێن، (واتە: هەر كەسێك بە قسەی خواو پێغەمبەری خوا نەكات كافرەو خواش كافرانی خۆش ناوێن).

هەروەها خوای بە بەزەیی هەر لە بارەی شوێنكەوتنی پێغەمبەرەوە فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (الأحزاب-٢١)

واتە: (بێ گومان لە پێغەمبەری خوادا سەر مەشقیەكی باش هەیە بۆ ئێوە - بۆ كێ..؟! - بۆ هەر كەسێك كە بە ئومێدی (بەخشش و بەزەیی) خوا بێت و بە ئومێدی (پاداشتی) دواڕۆژ بێت وە زۆریش یادی خوا بكات) كەواتە هەر كەسێك بە تەمای ئەوەیە كە بە دیداری خوا شاد بێ لە بەهەشتدا وە بە پاداشتی خوا بگات دەبێ بە دوای پێغەمبەری خوا بكەوێت، وە هەر كەسێك بە دوای پێغەمبەری خوا نەكەوت ئەوە بە تەمای بەخشش و ڕەحمەتی خوا نیە و چاوەڕێیی پاداشتی خوا ناكات! هەروەها - وەك پێشتریش ئاماژەمان پێ كرد لێرە زیاتری ڕوون دەكەینەوە ـــ خوای زاناو توانا فەرمانی پێكردوین كە ئیمان بێنین و بیپەرستین و نوێژی بۆ بكەین و حەج و عومرەی بۆ بكەین و ڕۆژووی بۆ بگرین: ﴿یا أیها الذین آمَنوا آمِنوا بالله ورسوله﴾ (النساء-١٣٦)

﴿ فاقیموا الصلاة واتوا الزكاة وأعتصموا بالله هو مولكم فنعم المولى ونعم النصیر﴾ (الحج-٧٨)

﴿ يا أيها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام﴾ (البقرة ـ١٨٣)
﴿ وأَتِمّوا الحجَّ والعمرة لله ﴾ (البقرة ـ١٩٦)
﴿يا أيها الذين آمنوا اذكروا الله ذكراً كثيراً﴾ (الأحزاب ـ٤١).

دیارە ئەم فەرمانانە هەموویان لە خوای پەروەردگارەوە هاتوون، دەجا بە هەمان شێوە ئەو فەرمانانەی دیکەش کە کارو جموجۆڵ و چالاکی ئیسلامییان لێ پێك دێ بەو چەمك و واتا باو و عورفیەی کە ئێستا هەیە، ئەوانیش هەر لە خواو وەحیەکەیەوە سەرچاوەیان گرتوە بە بێ هیچ جیاوازی یەك لە نێوانیان دا، کە یەکێکیان[1] بریتییە لە خەڵك بانگ کردن بۆ لای خواو بۆ لای دینی خوا:

﴿ ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾ (النحل ـ١٢٥)

بەڵــێ: ئا ئەمەش هەر فەرمانی خوایە،چونکە خوا وەك چۆن فەرموویەتی: نوێژ بکە: بەهەمان شێوەش فەرموویەتی: خەڵکم بۆ لا بانگ بکە!

وەیەکێکی دیکەیان بریتیە لە: (فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە) وەك فەرموویەتی:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ (آل عمران ـ١٠٤)

جا ئەگەر لێرەدا بەپێ ی وشەی (منکم) ئایەتەکە دوو مانای هەن، بەم جـــۆرە:

---

(١) واتە یەکێك لەو فەرمانە خواییانەی کە کاری ئیسلامییان لێ پێك دێ.

١- ئەگەر (من) بۆ (تبعیض) بێ، واتە : با لەنێو ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ دا كۆمەڵێك هەبن كە بانگەواز بكەن بۆ چاكەو فەرمان بەچاكە بكەن و ڕێگریی لە خراپە بكەن.

٢- وە ئەگەر(من) (بیانیة) بێ، واتە دەبێ ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ هەمووی بانگەواز بكات بۆ چاكەو فەرمان بەچاكەو ڕێگریی لە خراپە بكات. ئەوا ئایەتی ژمارە (٧١) لە سووڕەتی (التوبة) دا تێكڕای مسوڵمانان بەوردو درشت و نێر و مێ دەگرێتەوە، كە دەفەرموێ:

﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ ﴾

كەواتە: لە حەقیقەتدا فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپە، كە هەموو جم و جۆڵ و چالاكی ئیسلامی لە خۆ دەگرێت، ئەرك و وەزیفەی هەموو مسوڵمانانە بە پیاو و ئافرەت و وردو درشتەوە! كەواتە: كاریی ئیسلامی ئەركێكە لە ئەستۆی هەموو مسوڵمانان دا چونكە خوای پەروەردگار لە پێناسەی ئیمانداران و مسوڵمانان دا پیاو و ئافرەتانی ئیماندار دۆست و پشتیوان و هاوكاری یەكدین... بۆچی؟! فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێ لە خراپە دەگرن و نوێژ بەرپادەكەن و زەكات دەدەن و فەرمان بەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەن (وەك پێشتریش باسمان كرد). هەروەها خوای بەرزو مەزن (تبارك وتعالى) فەرمانی بە هەموو ئەهلی ئیمان كردوە كە دادگەریی بچەسپێنن دیارە دادگەرییش وەختێك وەك پێویست دەچەسپێت كە شەریعەتی خوا حاكم بێت:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ﴾ (النساء ـ١٣٥)

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بەچاكی دادگەریی بچەسپێنن) دیارە وشەی (القسط) كە هاو واتای (عَدْل)ە (أل)ی (تعریف)ی لەسەرەو سەرجەم جۆرەكانی دادگەریی دەگرێتەوە لە هەموو بوار و لایەنەكانی ژیان و گوزەران داو دادگەرییەكی واش تەنیا كاتێك دەچەسپێ كە ڕاستیی شەریعەتی خوا حاكم بێت.

هەروەها خوای دادگەر فەرمانی بە ئەهلی ئیمان كردوە كە سزا شەرعیەكان بەسەر ئەو كەسانەدا بچەسپێنن كە ژیان و ئاسایش و نامووس و وەچەو ماڵ و سامانی خەڵك دەخەنە مەترسییەوە، ئاشكراشە كە بێ كارو چالاكی ئیسلامی مسوڵمانان كیان و قەوارەیان بۆ دروست نابێت و كۆمەڵگایەكی ئیسلامی دانامەزرێت و دەسەڵاتێكی ئیسلامی نایەتە دی و دیارە هەتا دەسەڵات و كۆمەڵگەیەكی ئیسلامیش نەبێت بە تەئكید ناكرێت و ناگونجێ كە ڕێگە بگیرێت لەو كەسانەی كە دەیانەوێ ژیان و ئاسایش و كەرامەت و وەچەو نامووس و ماڵ و سامانی خەڵكی بخەنە مەترسییەوە. دیسان خوای زاڵ و كار بە جێ (تبارك و تعالى) فەرمانی پێكردووین كە حوكم بە شەریعەتی خوا بكەین: ﴿ وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ... ﴾ (المائدة ـ٤٩)

واتە : ئەی موحەممەد! حوكمیان لە بەین دا بكە بەوە كە خوا ناردوویەتیە خوار وە وریا بە لاتنەدەن لە هەندێك لەوەی كە خوا بۆی ناردوویە خوار، (نەك لە هەموو بەڵكو تەنانەت لە هەندێك لە حوكمە شەرعییەكانیش لاتنەدەن ئەی موحەممەد!)

كەواتە: ئێستا دەتوانین زۆر بە ڕاشكاویی بڵێین: حوكمی كارو چالاكی ئیسلامی ئەوەیە كە پێویست (فرض)ە، ئینجا ئایا (فرض العَيْن)ە یان (فرض

الكفاية)یە؟!، ئەوەش بە پێی حاڵەتەكان دەگۆڕێت، چونكە فەڕزی كیفایە و فەڕزی عەین بە پێی بارو دۆخەكان گۆڕانیان بەسەر دادێت، بۆ پێناسەی (فرض الكفاية)ش زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە: (فەڕزی كیفایە ئەو جۆرە ئەرك و كارەیە كە ئەگەر هەندێك لە مسوڵمانان پێی هەڵسان لە سەر هەموویان لادەچێت بەڵام ئەگەر كەس نەبوو پێ ی هەڵسێ هەموویان گوناهبار دەبن).

بۆ وێنە: نوێژی مردوو ـ كە زۆربەی زانایان بە نموونەی فەڕزی كیفایە هێناویانەتەوە ئەگەر نا، فەڕزی كیفایە یەكجار زۆرن و دەتوانیت بڵێین لە فەڕزە عەینییەكان زیاترن ـ ئەگەر مسوڵمانێك بمرێ لەسەر مسوڵمانان فەڕزە كە كەسێك هەبێ لە نێویاندا نوێژی لەسەر بكات و كفنی بكات و بیشارێتەوە، جا ئەگەر كەس هەبوو ئەو ئەركانەی لەگەڵ جێبەجێ بكات با یەكێكیش بێت، ئەوا لەسەر هەموویان لادەچێت، بەڵام ئەگەر كەس نەبوو ئەوا هەموویان گوناهبارن. بەڵام زانایان لەسەر ئەوەش یەك دەنگن كە ئەگەر فەڕزی كیفایەش تەنها كەسێك هەبوو پێی هەڵبستێ لەو كات و شوێنەدا ئەوە لەسەری دەبێت بە فەڕزی عەین. بۆیە دەڵێین لە قۆناغێكی وەك ئێستای كاری ئیسلامی ئێمەدا لە كوردستان و عێراق و جیهانی ئیسلامی دا بە گشتی، كە ئەوانەی لەمەیدانی كارو چالاكی و جم وجۆڵی ئیسلامیدان لە چاو ئەو واقیعەی كە تێیدان و دەیانەوێ پاكسازیی و چاكسازیی تێدا بكەن و بیگۆڕن ئەگەر بەراورد بكرێن زۆر كەمترن و، توانایان كەمترەو بڕستیان كەمترە، بۆیە دەتوانین بڵێین: كارو چالاكی ئیسلامی ئێستاكە فەڕزی عەینە، بەڵێ هەرچەندە لە ئەسڵدا بانگەوازی خەڵك بۆ ئیسلام و فەرمان بە چاكەو ڕێ گریی لە خراپەو كارو چالاكییەكانی دیكەی نێو بازنەی كاری ئیسلامیی

(العمل الأسلامي) ئەگەر فەڕزی كیفایەش بن، بەلاّم ئێستا لەسەر لایەنە ئیسلامیەكان و هەموو ئەوانەی كە لەمەیدانی كاری ئیسلامیدان، فەڕزی عەینن ... بۆ؟! چونكە ئایە ئەگەر ئێمە نەیكەین چۆن دەبیٚ؟! ئەوە ئێستا ئێمە كە دەشیكەین پێمان تەواو نابێت و كەلێن و كەم و كوورِی زۆرە، واتە: ئێمە بە هەمووشمانەوە لە ئاستی پێویست دانین، چ جای خەڵكیشمان لیٚ كەم بێتەوە؟!

كەواتە: ئێستا هیچ كەس بۆی نیە شان لە بن باری كاری ئیسلامی دەربێنێ و بڵیٚ:

جا خۆ كاكە كاری ئیسلامی فەڕزی كیفایەیە من نایكەم .....!!!

كەواتە : كەسێك كەلە قورئان و سوننەت شارەزابێت و سەرنجی ئەو ئایەتانە بدات كەبە نموونە هێناومانەوە، دەزانیٚ كە حوكمی كارو چالاكی ئیسلامی زۆر ڕۆشن و ئاشكرایە ئنجا هەر لێرەشەوە بۆمان دەر دەكەویٚ كەلەو بارەوە دوو جۆرە كەس بەهەڵە داچوونە:

جۆری یەكەم: كەسانێكی سیكۆلاریست (عەلمانی)ی توند ڕەون كە دەڵێن ئیسلام حیزب و ڕێكخراوی ئیسلامی بۆ چی یە ...!؟

دەڵێن: ئێمە هەموومان مسوڵمانین وپێویست ناكات حیزب و لایەنێكی ئیسلامی هەبێت خۆی بكاتە نوێنەری ئیسلام چونكە میللەتەكەمان هەمووی مسوڵمانە ..!!

جۆری دووەم: هەندێك مسوڵمانی ناحاڵێن كەپێیان وایە هەبوونی حیزب و لایەنێكی ئیسلامی، شتێكی ناشەرعی و داهێنراو (مبتدع)ە!

وەڵامی تاقمی یەكەم: بەكورتی لەوەڵامی عەلمانییە توندڕەو (متطرِّف)ەكاندا دەڵێین: (چونكە عەلمانییش هەیانە هەر عەلمانییە[1] و بڕوای بە ئیسلام نیە بەرنامەی ژین بێ، بەڵام قەناعەتی وایەو دەڵێ مادام مـن بـە ڕێ ی (بێ دینایەتی)دا دەڕۆم با خەڵكیش بۆی هـەبێ بـە ڕێـی دینـداریی دا بڕوات. بەڵام توندڕەو (متطرف)ی وایان هەیە دەڵێ: نەخێر من بۆم هەیە بە ڕێی بێ دینایەتی دا بڕۆم، بەڵام خەڵكی مسوڵمان بۆی نیـە بـەڕێی دینداریی دا بڕوات!! جا ئەوە زۆر شتێكی سەیرەو ئەوەیە دەڵێ (ماڵ لـە ماخۆ حەرامە)!

یەكەم: مسوڵمان بوونی تاكێك یان كۆمەڵگایەك یان میللەتێك نـاوی بـێ نێوەڕۆك نیە (چونكە كە دەڵێ: ئێمە هەموومان مسوڵمانین دیارە ئەو برادەرە عەلمانییەی كەوا دەڵێ خۆیشی هەر لـە ڕیـزی مسـوڵمانان دا حیساب كردوە و لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئێمە پێشـتر چـەمك و واتـای مسوڵمانەتیمان ڕوون كردۆتەوە و باسمان كردوە كـە مسـوڵمان بـوونی ئینسان یانی چی؟ وە میللەت و كۆمەڵگایـەكی مسـوڵمان كێیـە و چۆنە؟! بۆیە لێرە دووبـارەی ناكەینـەوە و حەوالـەی دەرسـی یەكـەم و دووەمی ئەم زنجیرە دەرسەیان دەكەمەوە.

دووەم: وەك لە سەرەتادا خستمانە ڕوو تاكە بەرنامەی پەسندكراوی خوا بە دەق(نص)ی قورئان، بریتییـــە لە ئیسلام و خوای پەروەردگار جگە لە ئیسلام هیچ دین و بەرنامەیەكی دیكە بە حەق نازانێت و بە پەسند و

---

(١) لە كتێبی (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)دا پێناسەی (سیكۆلاریزم) مان كردوە و هەڵمان سەنگاندوە.

شایستەی ئەوە نازانێت كە مرۆڤەكان ژیانیانی بە گوێرە بە ڕێ بكەن[1] كەواتە: هەر كەسێك خۆی بە مسولْمان بزانێ لەسەری پێویست كراوە كە لە ژیانی تاكیی و كۆمەڵییدا تەنیا دینی حەق و پەسندكراوی خوا پیادەبكات، ئنجا دیارە پیادەكردن و جێبەجێكردنی دین و شەریعەتی خواش بەبێ هــــەوڵ بۆ دان و زەمینە بۆ خۆش كردن مەیسەر نابێت، كەواتە: كاركردن بۆ زەمینە ڕەخساندن بۆ فەرمانڕەوا (حاكم)كردنی دینی خوا فەرزە، بۆچی؟! چونكە بنچینەیەكی شەرعییە، (ما لا یتم الواجب الاّ به فهو واجب) واتە (هەر شتێك ئەركێكی پێویست پەكی لەسەری بكەوێ ئەویش پێویستە)، كەوابێ: كاركردن بۆ ئەوەی كە زەمینە برەخسێنرێ تاكو دینی خوا حاكم بێ، نەك هەر لەسەر لایەنە ئیسلامییەكان بەڵكو لەسەر هەموو مسولْمانێك فەرزە، كە دەیەوێ بە مســــولْمان دابنرێ، دیارە ئەوە لە كاتێكداو لە شــــوێنێك دا كە شــــەریعەتی خوا باڵادەســــت وحاكم نیە، لە حاڵێكی وادا هەموو مسولْمانێك لەسەری فەرزە كە هەوڵ بدات شەریعەتی خوا حاكم بێ و ژینەكــەی بە پێی دینەكەی بەڕێوە بچــێ، بەڵــێ بەڕێـــزان لە حاڵێكی وادا:

هەر تاكێكی مسولْمان پیاو بێت یان ئافرەت لە ســەری فــەرزە كــە هەوڵ بدات بۆ ئەوەی شەریعەتی خوای لەسەر حوكمڕان بێت.

---

(١) ( إن الدّین عند الله الأسلام ..) آل عمران ــ١٩ــ ( و رضیت لكم الأسلام دیناً..) المائدة ــ٣ــ.

سێیەم: هەروەها لە وەڵامیان دا دەڵێین : ئەگەر وابێ[1] ، دەبێ بۆمان هەبێ بڵێین ئێمە مادام کوردین ڕێکخراوو حیزبی کوردیمان بۆچی یە..؟! خۆ هەمووومان هەر کوردین؟!!

چوارەم: وە لە وەڵامی ئەوەش دا کە زۆر جار عەلمانییەکان دەڵێن: ئیسلامییەکان ئیسلام بۆ مەرامی سیاسی خۆیان بە کاردێنن! دەڵێین: لە ڕاستی دا ئەوە عەلمانییەکانن کە ئیسلام بە ناهەق بۆ مەرامی سیاسی خۆیان بەکاردێنن، بەڵام دەزانی چ جۆرە سیاسەتێك؟! سیاسەتێك کە لە بێدینایەتی(سیکۆلاریزم)ەوە سەرچاوە دەگرێ!!ئەوە لە لایەکەوە لە لایەکی دیکەشەوە دەڵێین:

لەبەر ئەوەی کە مسوڵمانان دەبێ سیاسەتەکەشیان وەك دینەکەیان بێ، ئەگەر بابای ئیسلامی بەناوی ئیسلامەوە و بۆ ئیسلام کاری سیاسیش بکات، شتێکی زۆر ئاسایی و ڕەوایە، بۆچی؟! چونکە سیاسەت لە ڕوانگەی شەرعەوە یانی چی؟! لە (صحيح البخاري)دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(كانت بنو إسرائيل تسوسهم الأنبياء كلّما هلَكَ نبيٌّ خَلَفَه نبيّ وإنَّه لا نبيَّ بَعْدي و سَيَكُونُ خلفاء فيكثرون)

واتە: گەلی (بەنو ئیسرائیل) پێغەمبەران سیاسەتیان دەکردن ـ واتە: سەرپەرشتیان دەکردن و کاروباریان بەڕێوە دەبردن ـ ... هتد.

کەواتە: میللەتێکی مسوڵمان سیاسەتەکەی بریتیە لە شەریعەتەکەی و دینەکەی و دەبێ بەپێ ی دینەکەی کارو باری بەڕێوە ببرێ.

---

(١) واتە: ئەگەر لەبەر ئەوەی مسوڵمانین بێ نیاز بین لە ڕێکخراوو لایەنێکی ئیسلامی.

مادام وابێ دیاره بۆ خەڵکێکی ئیسلامی شتێکی زۆر ڕەوایە کە لە کاتێکدا باسی سیاسەتی خۆی دەکات ئایەت وفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بە بەڵگە بێنێتەوە و باسی یاسا شەرعییەکان بکات، بەڵام ئەوەی زۆر شتێکی نەگونجاوەو جێی سەر سوڕمانە ئەوەیە کە کەسێك بڕوای بە (دین[1])نەبێ و باسی (دین)بکات، وە باسی ئایەتی قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بکات!!

ئنجا ئەگەر بڕواشی بە(ئیسلام)هەیە، زۆر باشە، خۆ کەس ڕێی لێنەگرتوە با بێت وەك مسوڵمانان بیکاتە بەرنامەی ژیانی، وەك چۆن خوا (عزَّ وجلَّ) فەرزی کردوە با شەریعەتی خوا جێبەجێ بکات!! یان با بە لای کەمەوە لە ڕاگەیاندن دا بڵێ و دانی پێدابنێ کە: شەریعەتی خوا ڕاست و تەواوە، وەك خوای کار بەجێ (تبارك وتعالی) فەرموویەتی ئایین و بەرنامەکەم تەواوکردوە لە ڕاستی و دادگەریی دا.

﴿وتمّتْ كلمةُ ربِّك صِدْقاً و عدلاً﴾ (الأنعام -١١٥) . بەڵێ با لە جیاتی ئەوە کە خۆی کافر بکات و بڵێ: ئیسلام بە کەڵکی ژیان نایەت!! با بڵێ: دینی خوا تێرو تەواوە، وەك چۆن خوای پەنهانبین فەرموویەتی:

﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴾ (المائدة -٣) .

وە با هەر کاتێك کێشەو گیروگرفتێکی بوو لە جیاتی لەبەر دەرگای بێدۆزەو ڕێچکان بگەڕێ بیگێڕێتەوە بۆ لای قورئان و سوننەت وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی:

---

(١) (دین) بە واتاو چەمکە باوەکەی (ئیسلام)ە .

﴿ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ﴾ (النساء ـ٥٩)

واتە: (هەر كات لە هەر شتێك دا كێشەتان بۆ پەیدا بوو بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر ئەگەر ئیمانتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە).

<u>وەڵامی تاقمی دووەم:</u> لە وەڵامی تاقمی دووەمیشدا دەڵێین:

یەكەم: كاری بە كۆمەڵ و ڕێكخراوەیی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ و پێغەمبەری خوا كە ئیشی ئیسلامی كردوە هەر لە سەرەتاوە بە شێوەیەكی ڕێك وپێك(مُنَظَّم و مرتَّب) بووەو، كۆمەڵێك هەبووە كە بۆ خۆی دینی تێ گەیاندوون و ئەمیریان بووە و سەرپەرشتی دەكردن و ئاڕاستە(توجیه)ی دەكردن و ماوەی سێ ساڵ كۆبوونەوەی نهێنی پێ دەكردن لە خانووی ئەرقەمی كوڕی باوكی ئەرقەم كە لە لای شاخۆلكەی (صفا)بوو، لە نزیك (كعبه)وە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ پەیمان وبەیعەتی لە هاوەڵانی بەڕێز و دڵسۆزی خوا لێیان ڕازی بێ وەردەگرت و ئەرك و كارەكانی بۆ دیاری دەكردن و ئەوانیش گوێ ڕایەڵیی و فەرمانبەریی (سمع و طاعة) یان بۆی هەبوو ...

بە كورتی: سەرجەم ئەو شەرت و مەرجانەی كە لە ڕێكخراوێكدا هەن، لەو كۆمەڵ (جماعە)ە ئیسلامییەی یەكەم، كۆمەڵی ئیسلامیی پێغەمبەر ﷺ دا هەبوون!! كەواتە: دیارە كامیان بیدعەت و داهێنراوە كاری ڕێك و پێك و بەسەرو بەر وەك هی پێغەمبەر ﷺ یان هی ناڕێك و بێسەروبەر!!

دووەم: ئایا بەدیلی كاری ڕێكخراوەیی وكاری بە كۆمەڵ چی یە؟!

لە ڕاستیدا بەدیلەكەی بریتییە لە پاشاگەردانیی و بێ سەرەو بەرەیی (فوضى)!

جا ئایا ماقووڵە بگوترێ، ئیسلام بە ڕێكخستن و هۆنینەوە و تەرتیب كردن خزمەت ناكرێ، بەڵام بە پاشاگەردانی و بەبێ سەرەوبەرەیی خزمەت دەكرێ؟! چونكە بێگومان بەدیلی ڕێك و پێكی (نظام) بێ سەرەوبەرەیی(فوضى)یەو، بەدیلی هەبوونی كۆمەڵ، پەرتەوازەیی‌یە و قورئان و سوننەتیش فەرمانیان بەوە كردوە كە پێویستە مسوڵمانان كۆمەڵ و تۆكمەو توند و تۆڵ و ڕێك و پێك و بەسەرەوبەرە بن. وە بە پێچەوانەشەوە هیچ دەقێكی قورئان و سوننەت نیە كە فەرمان بە پرژو بڵاوی و بێ یاسایی و پاشاگەردانیی بكات!! ئنجا لە ڕاستیدا كاری تاكیی زۆر لەوە بچووكترە كە واقیعی پێ بگۆڕێت، بۆیەش پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام)لە یەكەمین هەنگاوەوە بە كاری هەرەوەزیی و بە كۆمەڵ دەستیان پێ كردوە، جا هەبووە زۆری خەڵك وە دەست كەوتوەو هەشبووە كەم، بەڵام گرنگ ئەوەیە كە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە كە هەر ئامۆژگاری (موعظة)بكات بۆ خەڵك و بڕوات! بەڵكو هەر پێغەمبەرێك (عليه السلام) ئەوانەی كە لە گەڵی بوونە پەروەردەی كردوون و قۆناغ بە قۆناغ لەگەڵیاندا ڕۆیشتووە و ئەوەندەی بۆی لوا بێ واقیعی پێ گۆڕیون. بەڵێ لە ڕاستییدا واقیع تەنهاو تەنها بە كاری بە كۆمەڵ دەگۆڕێ، وە كاری تاكیی هەرچەندە ئینسان زۆریش ماندوو بێ و بەرهەمیشی زۆر بێت، بەڵام واقیعی پێ ناگۆڕێ. ئنجا لە لایەكی دیكەشەوە ئامانجە شەرعییەكانیش زۆر لەوە گەورەترن كە بە هەوڵ و تێكۆشانی تاكیی بێنە دی.

سێیەم: زانایان سەرجەم لەسەر ئەو بنچینە شەرعییە كۆكن كە دەڵێت: (للوسائِل حكم المقاصد) (هۆكارەكان هەمان حوكمی ئامانجە

شەرعییەكانیان هەیە)واتە تۆ ئامانجێكی شەرعییت هەیە و دەتەوێ بیهێنیە دی و ئەو ئامانجە شەرعییەش پێویستی بە هۆكارێك هەیە. جا ئەگەر ئامانجە شەرعییەكە(واجب) بێ بیهێنیە دی ئەو هۆكار و وەسیلەیەش كە ئامانجە شەرعییەكە پەكی لەسەر كەوتوە ئەویش (واجب) دەبێ. وە هەروەها زانایان لە مەسەلەی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەدا گوتوویانە: مادام پەكی لەسەر كاری هەرەوەزی و بە كۆمەڵ كەوتبێ پێویستە مسوڵمانان لە نێو خۆیاندا كۆڕ و كۆمەڵی وا ساز بكەن كە بۆیان بلوێ ئەو ئەركە شەرعییە گەورەو گرنگە ــ كە لە ڕاستیی دا چەندان ئەرك و كاری دیكەی شەرعیی دەگرێتە خۆی ـ جێبەجێ بكەن، بۆ نموونە: (أبو حامد الغزالي) لە كتێبی (إحياء علوم الدين)دا دەڵێ: لە هەر شوێنێك كۆمەڵێك ناشەرعیی (منكر)هەبوون كە بە هەوڵ و توانای تاكە كەسی نەدەگونجا لابرێن و، كۆمەڵە چاكە (معروف)یەك هەبوون كە خەڵكە مسوڵمانەكە فەرامۆشیان كردبوون و نەشدەلوا كە بە هەوڵی تاكە كەسیی بچەسپێنرێن، لەسەر مسوڵمانان پێویستە كە كۆبن و خۆڕێكخەن و، هەتا ئەگەر پێویستی بە بەیعەت بێ دەبێ بەیعەت بە یەكدی بدەن و ئەگەر پێویستی بە ماڵ بوو دەبێ ماڵیشی بۆ كۆبكەنەوە، وە ئەگەر پێویستی بە (أمیر) و برا گەورە بوو بۆ خۆیان داینێن، بە كورتی پێویستی بە هەر وەسیلەو هۆكارێك بوو دەبێ بۆی بكەن ...بۆچی؟! چونكە خوای بەرزو بێ وێنە (عزَّ و جلَّ) دەفەرموێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ﴾ (آل عمران ـ ١٠٤)

واتە: (وە با لە ئێوەدا كۆمەڵێك هەبن بانگەواز بكەن بۆ ئیسلام و فەرمان بە چاكە بكەن ڕێ لە خراپە بگرن).

كەواتە: ئەركی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپە لە ئەسڵ دا ئەركێكی كۆمەڵییەو خوای زاڵ و كار بەجێ فەرمانی بە كۆ(جمع)ی مسوڵمانان كردوە كە ئەنجامی بدەن! هەروەها خوای بەرزو مەزن (سبحانە و تعالی) لەسەری پێویست كردووین كە هاوكاری بكەین لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی:﴿وتعاونوا علی البرّ والتقوی..﴾(المائدة ـ٢).

دەجا ئایا بانگەواز بۆ لای خوا، چاكەو پارێز نیە؟! ئایا خەڵك لە كوفر گێڕانەوە شتێكی چاك (بِرّ) نیە؟! وە ئایا خەڵك بانگ كردن بۆ ئاداب و ڕەوشتی ئیسلامی شتێكی چاك (برّ)نیە....؟؟!! وە ئایا خەڵك بانگ كردن بۆ لای دادگەری ئیسلامی، وە دەست پێ هەڵگرتنیان لە زوڵم، شتێكی چاك نیە؟! وە ئایا هەوڵدان بۆ ئەوە كە شەریعەتی خوا بچەسپێ، وە خەڵك ژیان و ئاساییش و وەچەو نامووس و كەرامەت و ماڵ و سامانی پارێزراو بێ، ئایا ئەو شتانەو غەیری ئەوانەش هەموویان چاكەكاریی(البـرّ) وە پارێزكاریی (التقوی)نین؟! بێگومان با. دەجا خوای تاك وپاك فەرموویەتی: لەسەر هەر شتێك كە چاكەكارییە و پارێزكارییە، چاكە كارییە وەك نێوانی خۆتان و خەڵك و پارێزكارییە وەك نێوانی خۆتان و خوا، هاوكاری یەكدی لەسەر بكەن، بەڵێ خوای پەروەردگار پێویستی كردوە لەسەر مسوڵمانان كە هاوكاری یەكدی بكەن و دەست بار بۆیەكدی بگرن بۆ هێنانەدی هەر شتێك و جێبەجێكردنی هەر ئەركێك كە بۆ خەڵكی مایەی چاكەیە و بۆ خواش پارێزگارییە، جا ئەو هاوكاری یەكدی كردن و دەستبار بۆ یەكدی گرتنەش دیارە دەبێ حەتمەن لە میانە(خلال)ی حیزب و كۆمەڵ و ڕێكخراوو دامەزراوە (مؤسسة)یەك دا بێتە دی. لە كۆتاییشدا دەڵێم: ئێمە كە دەڵێین: كار كردن بۆ

ئیسلام فەرزەو هەرچی ئەو كارەش پەكی لەسەری كەوتبێ و حەوجێ ی بێ پێویستە بۆی دابین بكرێ، دەبێ لەوەش ئاگاداربین كە كار كردنیش بۆ ئیسلام دەبێ لە چوار چێوەی ڕێكخراوو كۆمەڵێك دا بێ كە بنەما شەرعییەكانی تێدا ڕەچاو بكرێن، بۆ نموونە:

یەكەم: دەبێ ئەو بەرنامەو ڕێبازەی كە ئەو (كۆمەڵ)ە لەسەری دەڕوات هەڵقوڵاوی قورئان و سوننەت بێت.

دووەم: دەبێ تێكڕای ئەندامانی ئەو ڕێكخراوو كۆمەڵە، چ ئەوانەیان كە لەسەرەوەن و چ ئەوانەیان كە لە خوارەوەن هەموویان بە (قیادة)و (قاعدة)وە پابەندبن بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە و بەو مەرجانەوە كە لەسەریان ڕێك دەكەون.

سێیەم: نابێت دەمارگیریی و حیزبگەرایی(تعصّب و تحزّب) یان هەبێت بۆ حزب و كۆمەڵەكەی خۆیان و ئیسلام و مسوڵمانەتی و هەق، تەنیا لە خۆیان دا ببینن و كورت هەڵبێنن!

بەڵكو دەبێ خۆیان تەنیا بە بەشێك لە مسوڵمانان بزانن، پێشم وانیە كە هیچ لایەنێكی ئیسلامی هەبێت بڵێ من نوێنەرایەتی (تمثیل) هەموو مسوڵمانان دەكەم! جگە لە كۆمەڵی (التفكیر و الهجرة) كە كاتی خۆی لە(مِصْر) هەبوون ئەوانیش لە زیندانەكانی میسر لە ژێر دارو فەلاقەی ڕژێمە دیكتاتۆرییەكان دا لە دایك بوون، ئەگەرنا بێجگە لەوان نەمبیستوە هیچ كەس گوتبێتی: من نوێنەرایەتی سەرجەم مسوڵمانان دەكەم....!

چوارەم: هەر لایەنێكی ئسلامیی ئەگەر بیەوێ بە ڕەسەن و شەرعیی لە قەڵەم بدرێ نابێ كەللە وشك ودەمارگیر بێ بۆ حیزب و ڕێكخراوەكەی خۆی، بەڵكو دەبێ عەقڵی كراوەبێت و سینگیشی ئاوەڵا بێت بۆ قبووڵ كردنی

هەر ڕەخنە و پێشنیار و سەرنجێك بـۆ ئـەوەی كارەكـەی هەرچـی زیـاتر شەرعیی و ڕێكتـر و ڕاست تر بێ.

پێنجـەم: وە ئەو كۆمەڵە كە كۆدەبێتەوە بۆ ئەنجام دانی كارێكی ئیسـلامی دەبێ وریا بێ ئەو ئاڵایەی لە سەر خۆیەوە هەڵی داوەو بەرزی كردۆتـەوە لە ژێر هیچ فشارێك دا و نە لە ترسان ونە لە برسان لـێخن و چڵكنیی نەكات و لە بیری نەچێ كە خۆی تـەنها وەسـیلەیە و ئیسـلام ئامانجـە و خزمەتی خەڵكی مسوڵمان ئامانجە[1] .

لە كۆتاییش دا دەڵێم:

با هەموو لایەكمان خوا پشتیوان بێ زیاتر شان بدەینە بەر كۆڵ وباری ئەم كارو كاروانە ئیسلامییەو دڵنیابین كە وەك چۆن نوێژو ڕۆژوومان لەسەر فەرزە بە هەمان شـێوەش كـاری ئیسـلامیی مـان لەسـەر فـەرزەو وەك چـۆن بـە كەمتەرخەمیی تێدا كردن و چواندنی نوێژ و ڕۆژوو گوناهبار دەبین، ئاواش بە كەمتەرخەمیی تێدا كردنی كارو چالاكی ئیسـلامی و چـواندنی گوناهبـار دەبین. وە وەك چۆن پێویستە هەرچی زیاتر هەوڵ بدەین نوێژەكانمان چاك ورێك بن بەو جۆرە بن كە بۆ خوا شایستەیەو لێمان قبـووڵ دەفـەرموێ، دەبـێ بـە هەمان شێوەش هەوڵبدەین كـارو جم وجۆڵ و چالاكی ئیسلامیی مان ڕێك و چاك و پاك و بە شێوەیەك بێـت كـە ئامانجـەكانی خـۆی بپێكـێ و مایـەی پاداشتی خواو ڕەزامەندی بەرزو گەورە بێ.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله ألاأنت أستغفرك وأتوب اليك

(١) خوا پشتیوان بێ ﷲ دەرسی پێنجەم (كۆمەڵبوونی مسوڵمانان..) دا چاكتر و زیاتر مەسەلەی: (پێویست بوونی كارو چالاكی ئیسلامی) دەتوێژینەوە .




# وانەی پێنجــەم

## کۆمەڵبوونی مســوڵمانان: یانی چـی و بۆچـی پێویســـتە و بەرهەمی چی یەو دەبێ چۆن بێ ؟!

١- وتـــاری یەکـەم

٢- وتـــاری دووەم

## وتاری یەكەم:

ان الحمدلله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له وَمن يضلل فلا هادي له، اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له واشهد أن محمدا عبده ورسوله، فصل اللّهُمَّ وسَلّم وبارك عليه وعلى آله وصحبه أجمعين ومن اهتدى بهديه وسار بسيرته بإحسان الى يوم الدين.

مسوڵمانە بەڕێز و خۆشەویستەكان! لە وتاری ئەمڕۆمان داو لە وتاری داهاتووش دا (ان شاءالله) باسی بابەتێكی زۆر گرنگ دەكەین كە بریتییە لە: (كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان)

خوا پشتیوان بێ سەرجەم لە شەش خالان دا ـ ئەم بابەتە دەخەینە ڕوو:

١- باسی ئەوە دەكەین كە كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان(واتە كە دەبێ مسوڵمانان ئوممەت بن، حیزب بن، كۆمەڵ بن) یانی چی؟!

٢- دەیخەینەڕوو كە ئایا بەڵگەی شەرعی بوونی كۆمەڵبوونی مسوڵمانان چی یە؟!

٣- ئنجا ڕوونی دەكەینەوە كە ئایا ئەو بنەما و بنچینانەی كە دەبێ هەر كۆمەڵێكی مسوڵمان لە سەریان بنیات بنرێ، چین؟!

٤- بەرهەمی كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان چی یە و حیكمەتی چی یە لە ژیانیان دا؟!

٥- بۆچی دوژمنانی ئیسلام ڕقیان لە كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان دەبێتەوەو دژایەتی دەكەن؟!

٦- چەند ئاگاداری و ئامۆژگاری یەك بۆ كۆمەڵە ئیسلامیی یەكان بۆ مسوڵمانانێك كە كۆمەڵن و بە كۆمەڵ كار دەكەن بۆ دینی خوا.

# كۆمـەڵ بوونی مســـوڵمانان

## ١- مەبەسـت لە كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان چی یە؟!

سەرەتا بابزانین مەبەستمان لە كۆمەڵ بوونی مسڵمانان چی یە؟ بێگومان مسوڵمانان، ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ بە گشتی دوو حاڵەتیان هەن:

أ- حاڵەتێكی ئاسایی ب- حاڵەتێكی نائاسایی.

أ- حاڵەتی سروشتی و ئاسـایی مسـوڵمانان ئەوەیـە كـە كیـان و قـەوارەی خۆیانیان هەبێت. واتە حكومەت و دەوڵەتیان هـەبێت، ئـەوە حاڵـەتی سروشتی و ئاسایی مسوڵمانانە.

یانی ئەگەر مسوڵمانان لە حاڵەتێكی ئاسایی و سروشتی دابـن دەبـێ كیان و قەوارەی خۆیانیان هەبێت كە ئەو كیان و قـەوارە و حكومـەت و دەوڵەتە هەڵدەستێ بە جێبەجێكردنی شەریعەتی خوا لە ژیانی ڕۆژانەی تاك و كۆمەڵیان دا لە هەموو بوارو لایەنەكان دا مەعنەوی و مـاددی، تاكی و كۆمـەڵیی، سیاسی و عیبادی، ئەوە حاڵەتی ئاسایی و سروشـتی مسوڵمانانە. كەواتە لە حاڵەتی ئاسایی مسوڵمانان دا كۆمەڵ بوونیـان شتێكی ئاشكراو بەڵگە نەویستە!

ب- حاڵەتی دووەمی مسوڵمانان كە حاڵەتی نـا ئاسـایی و ناسروشـتی یـە، ئەوەیە كە كیان و قەوارەو سەر و سێبەرو دەوڵەتیان نەبێت. ئەوەیـە كـە چارەنووس و كاروباری خۆیان بەدەست خۆیان نەبێت، كە ئەوە حاڵەتێكی نائاسایی و ڕیزپەڕو نەویسـتـراوو ناسروشـتی یـە، وەك ئـەم حاڵـەتـەی ئێستای مسوڵمانان لە زۆربەی وڵاتانی مسوڵمان نشین دا.

دیارە لە چەند شوێنێك لە جیهانی ئیسلامیی دا موسوڵمانان کیان و قەوارەیەکیان بۆ دروست بووە تا ئەندازەیەك بۆ وێنە: ئێران، سوودان، ئەفغانستان[1] ، وەلە چەند شوێنێکی دیکەش خوا پشتیوان بێ بەڕێوەیە.

بەڵام زۆربەی هەرە زۆری موسوڵمانان لەم حاڵەتەی دووەمی نائاسایی دا دەژین، کە ئێمەش وەك موسوڵمانانی عێراق و کوردستان تێدایین.

جا ئایا لە حاڵەتی نائاسایی وەك ئێستای ئێمەی موسوڵمانانی عێراق و کوردستان دا کە کیان و قەوارەکەمان نایەوێ شەریعەتی خوا پیادە بکات! ئایا موسوڵمانان چارەسەریان چی یە؟! دروستە کۆمەڵ بن و کۆمەڵیان هەبێت؟! حیزب و جەماعەتیان هەبێت؟! یاخود وەك هەندێك دەڵێن: ناشەرعی یە و بیدعەتەو داهێنراوە؟!!

یان وەك هەندێکی دیکە لە خەڵکی نامسوڵمان و نائیسلامیی دەڵێن: ئەوە بوختان (إفتراء)کردنە بە ئیسلام و بە دین کە موسوڵمانان کۆمەڵ و جەماعەتێك و حیزبیکی سیاسی لەسەر بنچینەی دینەکەیان دروست بکەن و بەو هۆیەوە کارو چالاکی ئەنجام بدەن و کۆمەڵگا بگۆڕن، بەڵێ دەڵێن: ئەوە سیاسەتاندنی دینە، واتە دین هێنانە نێو سیاسەتە!! کاتی خۆی (ئەنوەر سادات) گووتبووی (لا دين في السياسة ولا سياسة في الدين) واتە: نە دین سیاسەتی تێدایەو نە سیاسەت دینی تێدایە.

جا ئێمە لەو نێوانەدا وەك خەڵکێکی ئیسلامیی کە لەسەر گۆڕەپانی کوردستاندا هەین، وەك ئەوژمێکی ئیسلامیی کە کارو خەباتی سیاسی دەکەین، هاوکات لەگەڵ کارو خەباتی بانگەوازو عیلمیی و فیکریی و

---

(١) بەڵام بێگومان لە هەر کامێکیان دا کەم و کووڕی و کرچ و کاڵی هەیە و لە ئاستی بەرزی ئیسلام نزمترن.

پەروەردەیی و تەزکیە و خزمەتگوزاریی و...هتد ئەگەر نا وەك ڕوونی دەکەمەوە خۆ خەلکی دیکەش هەر کۆمەڵەو حیزب و جەماعەتی هەیە، بەلام ناوی حیزبێکی ئیسلامی لە خۆی نەناوە، کە مەبەستمان پێ لە کۆمەڵ بوونی مسوڵمانان حاڵەتی دووەمە کە حاڵەتی نا ئاسایی یە. حاڵەتی یەکەم کە مسوڵمانان کیان ودەوڵەتیان هەبێت دیارە کۆمەڵگایەکی ئیسلامی دروست بووە بۆیە کیان و قەوارەو دەوڵەتێکی هەیە، بەلام کاتێك مسوڵمانان قەوارەو دەوڵەتیان نەبێت ئایا دەکرێ بە پەرش و بلاوی بمێننەوە؟! یاخود دروستە کۆمەڵ و حیزب بۆ خۆیان دروست بکەن و لە دەوری یەك کۆ ببنەوەو چەند بنەماو بنچینەیەك بۆ خۆیان دابنێن تا کاری لەسەر بکەن و بەو هۆیەوە کۆمەڵگاو دەورو بەریان بگۆڕن؟

جا بۆ وەلامی ئەوە کە ئایا لە کاتێك دا مسوڵمانان سەرو سێبەریان نامێنێ کیان و قەوارەو دەوڵەتیان نامێنێ دەکرێ هەر کەسە و لە ماڵی خۆی دابنیشێ، و کەس حەقی بەسەر کەسەوە نەبێ و هەر کەسە دەست بە کلاوی خۆیەوە بگرێ؟! یان دەبێ لە دەوری یەك کۆ ببنەوەو کۆمەڵ و جەماعەت دروست بکەن؟! لە ڕاستی دا ئەگەر تەماشای قورئان و سوننەت بکەین و سەرنجی فەرمایشتەکانی خوای پەروەردگارو پێغەمبەری سەروەرمان محمد ﷺ بدەین وەلامی ئەو پرسیارانە زۆر ئاشکراو ڕوونە :

ئەوەتا خوای پەروەردگار لە سوورەتی(المائدة)دا ڕوو لە ئیمان داران و مسوڵمانان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ (المائدة ـ ٥٤)

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هەر كامێك لە ئێوە لە ئایینەكەی هەڵگەڕێتەوە و دەست بەرداری بێت، ئەوە خوا كۆمەڵێك دێنێت ، بۆ ئەوەی دینی خۆی بەوان ببووژێنێتەوە و شەریعەتی خۆی بەوان پیادە بكاتەوە ئەو كۆمەڵە چۆنن؟ شەش سیفەتی سەرەكیان لێ هەڵدەدات :

١-٢- ﴿ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ خوا خۆشی دەوێن، ئەوانیش خوایان خۆش دەوێ، خۆشەویستی خوا ـ جلَّ جلاله ـ بۆ ئەوان لەقەدەر خۆیەتی، خۆشەویستی ئەوانیش بۆ خوا لەقەدەر خۆیانە.

٣-٤-﴿ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ لەگەڵ ئیمانداراندا میهرەبان و نەرم و نیان و بە ڕەحم و بەزەیین، لە بەرانبەر كافرانیشدا توندو تیژو زبرو بە زەبرو زەنگن.

٥-٦-﴿ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ﴾ لە ڕێی خوادا جیهاد دەكەن بە ماڵ و گیان، وە لە لۆمەی لۆمە كاران و توانج و پللاریان بێ باكن و ترسیان نیە.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء ﴾ ئەو كۆمەڵە كە خوا دەیانهێنێت بۆ بوژاندنەوەو هێنانەوەكایەو گێڕانەوەی شەریعەت و بەرنامەی خۆی بۆ ژیان، ئا ئەوە كۆمەڵێكی خوا پێداون، ئەوە چاكەو نیعمەتێكە خوا دەیدات بە هەر كەسێك كە شایستەی بێت.

كەواتە كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان لە كاتێكدا كە كیان و دەوڵەتیان لە گۆڕێ دا نەماوەو شەریعەتی خوا كاری پێ ناكرێت كارێكی پەسندو پێویستەو شەرع داوای دەكات، بە تایبەت لە كاتێكدا كە هەندێك لە مسوڵمانان دەستبەرداری دینەكەیان بوون، جا بە یەكجاری یاخود بە

شێوەیەكی جوزئی وازیـان لـێهێنا بـێ و دەسـتبەرداری بـووبن، چـونكە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین و فەرموویەتی[٢]:

(لَتُنْقَضُنَّ عُرى الإسلام عُرْوةً عُرْوةً كلّما انتقَضَتْ عـروةٌ تشـبّث النـاس بالتي تليها، فأوّلهنَّ نقضاً الحُكْمُ وآخرهنَّ الصَّلاةُ) رواه أحمد والطبراني وابـن حبّان و الحاكم عن أبي امامة

واتە: ئەم ئیسلامە گرێ بە گرێ و بەند بە بەنـد هەڵدەوەشـێندرێتەوە، هەر كە گرێ یەك هەڵدەوەشێتەوە خەڵك دەست بە ئەوەی دیكـەوە دەگرێـت، هەروا پێبەپێ ـ دیارە ئەوانەی كە سوورن لەسەر دینداریی ـ یەكەمین گرێ و بەند كە لە ئیسلام هەڵدەوەشێنرێتەوە حوكم و سیاسەتەو دواهەمینیش نوێژە.

بەڵێ فەرمانڕەوایەتی و حوكم و سیاسەت و بەڕێوەبردنی گەل و وڵات لە ئیسلام و ئەهلی ئیسلام زەوت دەكرێت ودەدرێتە دەست ئەهلی كوفرو نیفاق و دەست ڕێچكەو بیدعەكاران، یەكەمین شـت كـە لـە دیـنی خـوا لادەبردرێ حوكم و سیاسەتە! كۆتایی هەموو گرێ و بەندەكانی دیكەش نوێژە، كاتێك پڕۆسەی هەڵوەشاندنەوەی ئیسلام دەگاتە مزگەوت و نوێژ كردن، دەبێ مسوڵمانان وریا بن كە ئەوە ئاخیر سەنگەریانە لێیان دەگیرێت و دواین گرێ ی دینەكەیانە كە لێیان هەڵدەوەشێنرێتەوە!!

كەواتە كۆمەڵ بوونی مـسوڵمانان لە كاتێك دا كـە قـەوارەو دەوڵـەتیان نەماوە، ئەصڵ و بنەمایەكە هەم شەرع داوای دەكات و هەم عەقل و ژیری و فیطـرەتی ساغ داوای دەكات.

---

(١) بڕوانە : ( فیض القدیر شرح الجامع الصغیر ) رقم : ٧٢٣٢

زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەكدەنگن و كۆڕا (إجماع)یان لەسەر ئەوەیە كە كاتێك مسوڵمانان (أميرالمؤمنين)یان نەما سوڵتان و دەسەلاتدارێكیان نەما كە بە شەریعەتی خوا حوكمیان بەسەردا بكات، ئەوە ویلایەت و سەر پەرشتی كردنی كاروباری ئیسلام و مسوڵمانان دەگەڕێتەوە بۆ ئەهلی حەلل و عەقد (أهل الحل والعقد)یان (أولي الأمر)جا با بزانین ئەوانە كێن؟ (إبن تيمية) و غەیری ئەویش لە زانایان و پێشەوایانی مەزنی ئیسلام ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەڵێن: مەبەست لە(أولي الأمر)لەو ئایەتەدا كە خوای پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ ﴾ (النساء-٥٩).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بكەن، وە هی كار بەدەستانێك بكەن كە لە خۆتانن،جا زانایان دەڵێن(أولي الأمر: أي ذوي العلم والقدرة) واتە: ئەوانەی كە زانیارییان هەیە دەربارەی دین و دەسەلاتیان هەیە لە نێو مسوڵمانان دا، خاوەنی زانست و زانیاری شەرعیی و دەسەلاتێكی ئیسلامیی یانەن (الجويني) ڕەحمەتی خوای لێبێ كە یەكێكە لە زانایانی شافیعی مەزهەب لە كتێبی (غياث الأمم)دا یەك دەنگی زانایانی ئیسلام لەو بارەوە نەقل دەكات و دەڵێ: (هەر كاتێك مسوڵمانان سەرو سێبەریان نەماو دەستەلاتێكیان نەما كە شەریعەتی خوا بەسەر خۆیاندا بچەسپێنن، كیان و دەوڵەتێكیان نەما، ئەوە كاروباری مسوڵمانان دەگێڕدرێتەوە بۆ(أهل الحل و العقد) واتە ئەوانەی كە ئیش و كاروباری مسوڵمانان گرێدەدەن و دەیكەنەوە، وە كاروباری مسوڵمانانیان لەسەر دەست پێك دێت، ئەوانیش(أولي الأمر)ن كە ئەوانەن خاوەنی شارەزایی و زانیارین لە دین داو خاوەنی دەسەلاتن و دەست ڕۆیشتوون لە نێو مسوڵمانان دا).

کەواتە: کاتێك کە مسوڵمانان کیان و دەوڵەتیان نامێنێت، دەبێ بـزانن کێن ئەوانەی مسوڵمانان بە قسـەیان دەکەن؟ کێن ئەوانەی لـە دیـن دا شارەزان و قسەشیان دەڕوات، دەبێ لە دەوریان کۆبنەوە. وە ئـەو(أهـل الحـل والعقد)ەش پێویستە بە یەکەوە کۆبنەوە و پرس و ڕاو مەشـوەرەت و ڕاوێـژ بکەن و لە حاڵ و وەزعی مسوڵمانان بکۆڵنەوە و مشووری کاروباریان بخۆن و پێداویستی یەکانیان جێبەجێ بکەن.

هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ هەواڵی پێداوین کە کاتێك دێ مسوڵمانان کیان و دەوڵەتیان نامێنێ، بەڵام کۆمەڵێك لە مسوڵمانان هەر لەسەر حەق دەمێنن و دەستەڵات و توانایان هەردەبێت، لەو بارەوە چەند فەرموودەیەکی (صحیح) هەن بۆ وێنە لە یەکێکیان دا دەفەرموێ:

(لاتزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لايضرهم من خذلهم ولا مـن خالفهم حتى يأتي أمر الله) رواه مسلم

واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئۆممەتی من بە هێزو دەسەڵاتەوە دەمێننەوە، نە ئەوانە کە پشتیان بەردەدەن و نە ئەوانەش کە دژایەتی یان دەکەن ـ دیارە ئەوانەی دژایەتی یان دەکەن، بێ دینن، ئەوانەش کە پشتیان بـەردەدەن دیـن لاواز(ضعیف)ن ـ هیچ کام لەوانە زیانیان پێ ناگەیەنن تاکو دنیـا کۆتـایی پێدێت.

کەواتە: کۆمەڵێك هـەر دەمێـنن، کـە ڕەمـزی دەسـتەڵات و قـودرەت و عیززەتمەندیی ئیسلام و مسوڵمانانن با خەلیفەش نـەمابێت، بۆیـە زانایـان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە مسوڵمانان خەلیفەشـیان نـەمێنێت جـەنگ و جیهاد لە پێناوی خوادا و، دیفاع و بەرگری کردن لە موقەددەساتی ئیسلام و حورومـاتی مسوڵمانان نابێ ڕابوەستێ، بەڵکو دەبێ هەر بەر قەرار بێ و هەر

ببێ، دیارە كە پێغەمبەریش ﷺ موژدەو مزگێنی داوە كە هەر بەردەوام دەبێت وەك فەرموویەتی[1] : (لَنْ يَبْرحَ هذا الدين قائماً يُقاتلُ عليه عصابة من المسلمين حتى تقوم الساعة) رواه مسلم.

## ٢- بەڵگەی شەرعی بوونی كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان چی یە؟

بە داخەوە لە جیاتی ئەوەی خەڵك بەڵگە بێنێتەوە لەسەر ئەوەی كە ئایا شتێكی شەرعی یە مسوڵمانان پرش و بڵاوو لێك ترازاو بن؟ وە لە سەر ئەوەی كە بەڵگەو پاساو چی یە مسوڵمان لە ماڵی خۆی دادەنیشێ و حەقی بەسەر كەسەوە نیە؟ ئێستا دەبێ ئەوانەی دەیانەوێ دینی خوا زیندوو بكەنەوە بەڵگە بهێننەوە كە شتێكی شەرعی دەكەن! بەڵگە بهێننەوە بۆ هەندێك لە مسوڵمانەكان و هەموو عەلمانیی یەكان كە بێ گومان ئەوان زۆری لە زۆرزانی و چەواشەكاری یەوە یە ئەگەر نا دەزانن كە بەڵگە نەریستە ئەم دینە هەر دینی تاك نیە، بەڵكو دینی تاك و كۆمەڵە، وە تەنیا دینی مزگەوت نیە بەڵكو دینی مزگەوت و بازاڕە، وە تەنیا دینی سەر دوانگە (منبر) نیە، بەڵكو دینی فەرمانگە (دائرة)شە، بەڵام بە هەرحاڵ بۆ چەواشەكردنی خەڵك دەڵێن: دین سیاسەت و حوكمڕانی تێدا نیە و، دین حیزبایەتی و كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان قبووڵ ناكات، بەڵێ بەشێك لە لائیكەكان و ئەوانەش كە بە دەمۆڵی ئەوان هەڵدەپەڕن بانگەشەی ئەوە دەكەن كە مسوڵمان دروستە ببێتە حیزبێكی عەلمانی و لەسەر كوفر كۆ ببێتەوەو بە مسوڵمانیش لە قەڵەم

(١) لە دەرسی شەشەم دا چەند فەرموودەیەكمان لەو بارەوە هێناون جگە لەم فەرمایشتە.

بدرێ، بەڵام دروست نیە مسوڵمانان لەسەر بنچینە (أساس)ی دینەكەیان كۆمەڵ (تجمع)دروست بكەن، سەرنجی ئەو چەواشەكاری یە بدەن !!!

بە داخەوە هەندێك لەوانەش كە لە بەرگی (ئەهلی عیلم)دان، دەچنە سەر مینبەر، دەچنە سەر كەناڵەكانی ڕاگەیاندن و ئەوە ڕەواج پێ دەدەن كە: بەڵێ دروستە مسوڵمانان لە حیزبێكی عەلمانی دابن، بەڵام نابێ لەسەر بنچینەی ئیسلام كۆببنەوە!!، و نابێ ئیسلامیی بن! جا بێگومان ئەوەش لە جۆری فەتوای ئاخر زەمانە!!

كەواتە: با بزانین بەڵگەی شەرعی بوونی كۆمەڵبوونی مسوڵمانان و جەماعەت هەبوونیان چی یە؟ بەڵگەی توندو تۆڵ بوون و تۆكمە بوونی مسوڵمانان وەك دیواری قورقوشمیی بەیەكەوە چۆشدراو چی یە؟ وەك سەرەتاش ئاماژەم پێكرد شتەكە زۆر ئاشكراو بەڵگە نەویستە. بەڵام بە هەر حاڵ ئێمە لە بارودۆخێك داین كە ناچار دەبین بەڵگە بهێنینەوە بۆ شتی بەڵگەنەویست، شتی ڕوون ڕوونبكەینەوەو شتی ئاشكرا ئاشكرا بكەین!!:

یەك- ئەسڵ لە مسوڵمانەتیی دا كۆبوونەوەیە و دەبێت خڕبنەوە سەر یەك و بە یەكەوە بن.

خوای پەروەردگار لە هەموو قورئان دا بۆ تەنها جارێكیش نەیفەرمووە (یاأیها المؤمن) یان (یاأیها المسلم) هەمیشە فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، ئەی مسوڵمانەكان، كەواتە خوا (جلَّ وعلا) بە كۆ(جمع)دەمان دوێنێ، ئێمە لە نوێژدا كە نوێژ عیبادەتێكی شەخسی یە و لە نێو عیبادەتە شەخسیەكان دا لە هەموویان گەورەترە. ئەو عیبادەتە شەخسیەشمان بە كۆمەڵ ئەنجام دەدەین، وە زۆر لە زانایان ڕایان وایە كە نوێژی بە كۆمەڵ (جماعة) فەرزە، جا

هەندێکیان دەڵێن فەرزی عەینە هەندێکیشیان دەڵێن فەرزی کیفایەیە، وە من ئەو ڕایەم پێ بە هێزترە کە دەڵێ فەرزی کفایەیە. واتە دەبێ مسوڵمانان نوێژەکانیان بە کۆمەڵ بکەن، ناڵێین نوێژی تەنیا بەرناکەوێ بەڵام بە ئەنجام نەدانی نوێژی جەماعەت گوناحبار دەبن. واتە ئەگەر کۆمەڵێك پێی هەستا ئەوە لە سەر هەموویان لادەچێ بەڵام کە کەس پێی هەڵنەستا هەموویان گوناهبارن.

جا لە نوێژدا کە عیبادەتێکی شەخسی یە ئێمە دەڵێین:

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهدِنَـا الصِّرَاطَ الْمُستَقِيمَ (٦)﴾

واتە: (خوایە تەنیا بەندایەتی بۆتۆ دەکەین، وەتەنیا یارمەتیش لە تۆ دەخوازین، ڕێ ی ڕاستمان پیشان بدە). ئێمە بە کۆمەڵ لە خوا دەپارێینەوە. بە کۆمەڵ دەچینە سەجدەو ڕکووع، بە کۆمەڵ ڕازو نیاز لەگەڵ خوا دا دەکەین لە عیبادەتێکی زۆر ڕووحیی و شەخسیی دا کە نوێژە، هەروەها لە سەرجەم فەرمانەکانی دیکەی قورئان دا هەمیشە خوای پەروەردگار دەفەرموێ :﴿ کتب علیکم الصیام، کتب علیکم القتال، کتب علیکم...﴾ لەسەرتان پێویست کراوە، لەسەرتان پێویست کراوە فلان شتە... واتە لەسەر هەمووتان پێویست کراوە.

دوو- ئەگەر تەماشای دەقەکانی قورئان بکەین! خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وتعاونوا علی البر والتقوی﴾ (المائدة ـ٢) .

واتە: لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی هاوکاری یەکتر بکەن .

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ (آل عمران ـ ١٠٤)

واتە: ئێوە كۆمەڵێك بن[1] ، یاخود باكۆمەڵێك لە ئێوەداهەبن[2] ، كە بانگەواز دەكەن بۆ چاكە، فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێ لە خراپە دەگرن. بەڵێ مسوڵمانان دەوڵەتیشیان نەبێت فەرزە كۆمەڵێكیان تێدابن كە بانگەواز بكەن، بانگی خەڵك بكەن بۆ دینی خواو فەرمان بە چاكە بكەن و ڕێ لە خراپە بگرن.

زانایانی ڕەوانبێژی (بلاغة) دەڵێین: (أمر) بریتی یە لە دەرچوونی قسەیەك لە جیهەتێكی سەرێ بۆ جیهەتێكی خوارێ كە فلاَن شتە بكرێ و ئەنجام بدرێ، (نهي)ش بریتی یە لە دەرچوونی فەرمانێك لە جیهەتێكی سەرێ بۆ جیهەتێكی خوارێ كە فلاَن شتە نەكرێ و ئەنجام نەدرێ، بێگومان فەرمان بە چاكە و ڕێ لە خراپە گرتن (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)یش بە دەسەلاَتەوە جێبەجێ دەكرێ، دەبێ كۆمەڵێك هەبن و دەستەلاَتیان هەبێ بۆ ئەوەی ئەو چاكەیە بچەسپێنن و ئەو خراپەیە نەیهێڵن، كەواتە ئەو كۆمەڵ بوون و پەیداكردنی دەسەلاَتە فەرزە لەسەر مسوڵمانان.

پێغەمبەر ﷺ یش لە فەرموودەیەكی(صحیح)دا باسی(عیسی ابن مریم) دەكات دوایی باسی(یحیی بن زكریا) دەكات (علیهم الصلاة والسلام) كە پێنج فەرمانی بە قەومەكەی كردن، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

(وأنا أمركم بخمس الجماعة و السمع و الطاعة والهجرة والجهاد) رواه الترمذي وأحمد.

واتە: ئەی ئۆممەتەكەم منیش فەرمانتان پێ دەكەم بە پێنج شت:

(١) ئەگەر (من)ەكە بۆ (بیانیة) بێت.

(٢) ئەگەر (من) بۆ (تبعیض) بێت.

١- بەوەی كە كۆمەڵ(جماعة) بن و پرش و بڵاو نەبن و لێك دانەبڕێن .
٢- وە بە گوێ ڕاگرتن بۆ براگەورەكانتان.
٣- وە بە قسەكردن و فەرمانبەریی بۆ كردنیان .
٤- وە فەرمانتان پێ دەكەم بە كۆچكردن لە پێناوی خوادا ئەگەر دینەكەتان لێی داواكردن.
٥- وە بە جیهاد و خەبات و فیداكاریی لە پێناوی دینی خوادا.

دیسان پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: (يد الله مع الجماعة) لە ڕیوایەتێكی دیكەدا (يدالله على الجماعة ومَنْ شذَّ شَذَّ الى النار) واتە: دەستی خوا لەگەڵ كۆمەڵ دایە، یاخود دەستی خوا لەسەر كۆمەڵە، هەر كەسێكیش ڕیزپەڕ بێ و لابدات بەرەو دۆزەخ لادەدات. وە لە فەرموودەیەكی دیكەدا دەفەرمویٚ(إنما يأكل الذئب من الغنم القاصية) واتە: گورگ تەنیا زەفەر بە مەڕێك دەبات كە لە ڕانە مەڕ ـ مێ گەل ـ دابڕا بێ ، كەواتە مسوڵمان نابێ داببڕێ(٣).

سێ- ئەگەر تەماشای سیرەو مێژووی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بكەین هەر لەو ڕۆژەوە كە دەست بەكاربوو لە خانووی (الأرقم بن أبي الأرقم)دا كۆبوونەوەی بە هاوەڵانی بەڕێزی دەكرد شانە(خلية)یەكی لێ دروستكردن، ئەو شانەیە بوو بە چەند شانە، هەروا خوا بەرەكەتی خستە ئیش و كاریانەوە هەتا كاتێك وای لێهات كە ئەو كۆمەڵە ئەوەیان لە توانادا هەبێت دینی خوا هەمووی جێ بەجێ بكەن، دیارە لە مەككەش بۆیان نەدەكرا بۆیە خوای كاربەجێ فەرمانی پێكردن بە هیجرەت و كۆچ بەرەو مەدینە، ئەوە بوو لەوێ كیان و دەوڵەتی ئیسلامیی یان دامەزراند.

(٣) ئەم فەرموودانە لە دەرسی نۆیەم دا هێنراون و (تخريج) یش كراون

واتە پێغەمبەر ﷺ هەر لە یەكەمین هەنگاوەوە لە سەر بنچینەی كۆمەڵ بوون دەست بە كار بوو، دەستی كرد بە هۆنینەوەی هاوەڵانی، تەنیا ئەوە نەبوو كە وتارێك لە فلاَن شوێن بخوێنێتەوە و بەس جا ئەوەی بە قسەی كردو ئەوەی بە قسەی نەكرد، نەخێر یەك بەیەك هاوەڵانی بەڕێزی خۆی پەروەردە كردن و تێی گەیاندن تا بوون بە یەك كۆمەڵ بە مانای وشە، دواتریش جێنشینە سەر ڕاستەكان(الخلفاء الراشدون) خوا لێیان ڕازی بێ بەهەمان شێوەیان دەكرد و لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوون.

چوار- ئەگەر تەماشای ئیسلام بكەین دەبینین یاسا و حوكمەكانی ئیسلام دوو بەشی سەرەكین: بەشێكیان بە ئینسان بە تەنیا جێبەجێ دەكرێن، وەك ئیمان و عەقیدە و هەندێك لە عیبادەتی شەخسیی، بەلاَم زۆربەی هەرەزۆری یاساكانی ئیسلام بە كۆمەڵ نەبێت جێبەجێ ناكرێن و ئەنجام نادرێن، بۆ وێنە: ئێمە چۆن دەتوانین دادگەریی بچەسپێنین؟ چۆن دەتوانین دەستی زاڵم بگرین و حەقی حەق خوراوان بستێنین؟

چۆن دەتوانین بەرگری لە نیشتیمانی خۆمان بكەین؟ چۆن دەتوانین بەرگری لە حورماتی مسوڵمانان بكەین؟ چۆن دەتوانین ئەو لێپرسینەوە و سزا و سنوورانەی كە شەرع دیاری كردوون جێبەجێیان بكەین؟ ئەگەر كۆمەڵ و جەماعەت نەبین و دەستەلاَتی سیاسی مان نەبێت؟!

جا بۆیە ئەوانەی كە دەڵێن: پێویست بەوە ناكات مسوڵمانان كۆمەڵ و حیزبیان هەبێت... وەك زۆربەی ئەهلی طەریقەت و بەشێك لە سەلەفیی ناوەكان و خەڵكێكی عەوامیش پێیان وایە كە نەخێر مسوڵمانەتی و دینداریی پێوستی بە كۆمەڵ و جەماعەت ناكات! كە بە بۆچوونی من

ئەوە هەمووی لەوەوە سەرچاوەی گرتوە کە مسوڵمانەتی و دینـداریی لـە مێشکی ئەو جۆرە کەسانەدا گچکە کراوەتـەوە. هەنـدێکیان وا دەزانـن دینداریی تەنیا ئیمـان و عەقیدەیـە. یـان عیبـادەتی شەخسـیـیـە، وە هەندێکیان وا دەزانن دینداریی تەنیا تەزکیەی نەفس و زیکر و ویردێکە، هەندێکی دیکە وا دەزانن دینداریی تەنیا هەندێك هەڵسوکەوتی جوان و ڕەوشتی بەرزەو هیچی دیکە، جا بۆیە لەو سۆنگەیەوە کەسێك کە تـاوای لێ حاڵی بووە دەڵێ: ئیمان و عەقیدەو جێبەجێکردنی هەنـدێك فـەڕزو واجب و سوننەتەکان، یاخود تەزکیەی نەفس و زیکرو ویرد، پێوستی بـە حیزبایەتی و کۆمەڵ بوون ناکات، بەڵێ ئەگەر دینداریی هەر ئەوەندە بێ، منیش دەڵێم: پێویستی بە کۆمەڵ و جەماعەت و دەستەڵات و دەوڵـەت ناکات، بەڵام ئایا دینداریی و مسوڵمانەتی هەر ئەوەندەیە؟!

ئایا قورئان و سوننەت هەر ئەوەندەیان فەرمووە؟! بێگومان نەخێر!

جا زانایان قاعیدەیەکیان داناوە دەڵێن (مالا یتم الواجب الاّ بـه فهـو واجب) واتە هەرشتێك فەرزێك پەکی لەسەر بکەوێت ئەویش فەڕز دەبێت!

بۆ وێنە: نوێژ بەبێ دەست نوێژ گرتن دروست نیە، کەوابوو دەست نوێژ فەڕزە، دەست نوێژیش بەبێ تارەت گرتن و خۆ پاکردنـەوە دروسـت نیـە، کەوابوو ئەویش دەبێتە فەڕز، ئنجا ئێمـە ئەگـەر کۆمـەڵ نـەبین دیـنی خوامان بۆ جێ بەجێ نابێت و شەریعەتی ئیسلام پیادە ناکرێت، کەوابوو کۆمەڵ بوون لەسەرمان فەڕزە و دەبێ کۆمەڵ بین.

پێنج- بەڵگەیەکی دیکە ئەوەیە کە ئێمە تەماشا دەکەین ئاو هەرچەندە زۆر بێت بەڵام ئەگەر ڕێك نەخرێ و (تنظیم و ترتیب) نەکرێ، لەجیاتی کە ئاودێری مان بۆ بکات و هێزو وزەی کارەبامان بۆ بەرهەم بهێنـێ، دەبێتە

طـوفان و لافاوێك دنیامان لێ خاپوور و وێران و كاول دەكات، بێگومان هێـــز و وزەی مســــوڵمانانیش هەرچەندە زۆر بێت ئەگەر ڕێك نەخرێ و (تنظیم و ترتیب)نەكرێ هیچی لێ شین نابێتەوە، بەڵكو زۆر جاران ئەو مسوڵمانە ڕێك نەخراوو پەروەردە نەكراوو گۆش نەكراوانە دەبنە دار دەستی دوژمنانی ئیسلام و دەبنە ئامرازو ئالەتێك و دەبنە بورغویەك لە مەكینەیەك كە بە پێچەوانەی ئاڕاستەی ئیسلام دەســووڕێ.

شــەش- ئنجا ئەگەر تەماشای واقیعی ئێستاشمان بكەین! خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ ﴾ (البقرة-١٩٤) واتە: هەر كەسێك دەستدرێژی كرد سەرتان ئێوەش وەك خۆی دەستدرێژی بكەنەوە سەر.

دەجا ئەمڕۆ دوژمنانی ئیسـلام وەك حیــزب دوژمنایــەتی مســوڵمانان دەكەن، بەڵكو وەك دەوڵەتان و هاوپەیمانێتی لــە دژ دەبەســترێ، لــەوەش گەورەتر وەك سیستەمی نوێ ی جیهانی دژایەتی مسوڵمان دەكەن، كەواتە ئەی مسوڵمان! تۆ چۆن دەتوانی بە تەنیا لە بەرانبەر ئەوەی كــە ناویــان ناوە عەولەمەو سیستەمی نوێ ی جیهانی بوەستی بە تاقی تەنێ؟! ئەگەر لەگەڵ براكانت نەبی و لەگەڵ باقی مسوڵمانان پشت لێك نەدەی و قــۆڵ لە قۆڵیان هەڵنەهێنی و ڕیزێكی مەحكەم دروست نەكەی چۆن دەتــوانی مقاوەمەو بەرهەڵستی بكەی؟ هەر بە پێی ئەو ئایەتەی كە دەفــەرموێ: هەر كەسێك دەستدرێژی كردە سەرتان وەك خۆی بەرپەرچی بدەنەوە، مادام ئەو بە كۆمەڵ دژایەتی ئیسلام و دژایەتی تۆ دەكات تۆش دەبێ كۆمەڵێك دروست بكەی و ڕیزێكی مەحكەم پێك بهێنی و بەر پەرچی بدەیەوە.

حەوت- ئەو جۆرە کەسانە کە دەڵێن : با مسولمانان کۆمەڵ نەبن لەسەر بنچینەی دین، با حیزب و کۆمەڵ دروست نەکرێت، ئەگەر ئەو کەسانە عەلمانی بن دەڵێین: ئەدی بۆچی بۆ خۆتان کۆمەڵتان هەیە؟ ئایا بۆچی بۆ خۆتانی بەڕەوا دەبینن ـ خۆشتان بە بەچکە مسولمان دەزانن ـ کە لەسەر بنچینەی فیکرەیەکی کوفر کۆمەڵ بن و خۆتان ڕێکخەن و کۆ بینەوە، بەلام بۆچی بۆ مسولمانان ڕەوا نیە لەسەر بنچینەی دینەکەی خۆیان و لە ولاتی خۆیان دا کۆ ببنەوە ؟!!

ئەگەر مسولمانیشن، ئێمە تەماشا دەکەین ئەوانەی کە بانگەشە دەکەن بۆ ئەوەی کە مسولمانان کۆمەلیان نەبێ، ئەمیرو برا گەورەیان نەبێ، ڕێکخستن و ڕێکبوونیان نەبێ، ئەو کەسانە هەموویان بە زمانی حاڵ خۆیان پێچەوانەی ئەوەن چۆن؟ چونکە کابرا ناوی لە برا گەورەکەی نەناوە بۆ وێنە: (أمیر المؤمنین) یان ڕابەر، سەرۆك، ئەمیندار، سکرتێر هتد.

بەلام ئەویش ئەگەر ئەهلی طەریقەت بێ شێخێکی هەیە، کۆمەڵ و جەماعەتەکەشی بۆ وێنە ناوی لێ نەناوە موجاهید یان پێشمەرگە یان ئەندام، بەلام ناوی لێنراوە دەروێش، مورید، صۆفی، دێوانە، هتد.

ئەوی دیکەش هەروەها دیسان شێخێکی هەیە، بەلێ جەماعەتەکەی ناوی حیزبی سیاسی لێ نیە، بەلام ئەویش پەیوەندی یەکی پتەوی بە جەنابی شێخەوە هەیە، قوتابی ئەو شێخ و مامۆستایەیەو بە قسەی دەکات و ڕێنمایشی لێ وەردەگرێ، لە هەمان کات دا ئەو تەوژمە و ئەو ڕەوتە بنەمای دارایی و مادیشیان هەیە، کۆمەڵیشن و کۆڕ و کۆبوونەوەی تایبەتیش ئەنجام دەدەن، وە بەرنامەیەکیشیان هەیە کاری

لەسەر دەكەن!! ئەدی حیزب یانی چی؟! كۆمەڵ بوون یانی چی ؟! هەر ئەوەیە!

تەنیا یەك جیاوازی هەیە لە نێوان كۆمەڵە ئیسلامیی یەكان كە دەیانەوێ خەباتی سیاسی بكەن بۆ گێڕانەوەی حوكمی خوا لەگەڵ ئەو برا مسوڵمانانەی دیكە چ وەك ئەهلی طەریقەت ▪ وەك هەندێك لە برایانی سەلەفی، چونكە وەك دوایی باسی دەكەین سەلەفی یەكان هەموویان ڕایان وانیە، بەڵێ جیاوازییەكە ئەوەیە كە لایەنە ئیسلامیی یەكان دەڵێن: (دەبێ هەوڵ بدەین جڵەوی حوكم وسیاسەت بگرینە دەست وكیان و قەوارەو دەوڵەت بۆ ئیسلام دروست بكەین، چونكە وانەبێ ئیسلام بەڕێوە نابردرێ و بەختەوەر نابین) بەڵام ئەوانی دیكە بەوە قەناعەت دەكەن كە لەگەڵ وەزعەكان دا بڕۆن و هەمیشە پاشكۆ بن و ببنە جوزئێك لە واقیعێكی ناشەرعیی دا!، جیاوازی یەكە هەر ئەوەندەیە. جا بێگومان كۆمەڵ بوونی مسوڵمانانیش ئەگەر بۆ ئەوە نەبێ كە هێزو دەسەڵات و سام و هەیبەتیان پەیدا ببێ مانای وایە دەبێتەوە شتی شەخسی، ڕەنگە زیاتر دووكان دانان و كات گوزەراندان و بەرژەوەندی شەخسی و بنەماڵەیی و بەرژەوندی دابینكردنی هەندێك خەڵك بێت!!

تۆ مادام هەر كۆمەڵ و حیزبی و ڕێكخراوێكی و خەڵكت لە خۆت ئالاندوە بۆ چیتە؟ بۆچی هێزو دەسەڵات و هەیبەتێك پەیدا دەكەی؟ بۆ خۆتە؟! یان بۆ خوا؟، ئەگەر بۆ خواتە دەی بەو هێزو دەسەڵات و بەو جەماعەت و موریدو قوتابی یانە هەوڵ بدە دینی خوا بچەسپێنە ▪ نەك تەنیا بەرژەوەندی یەكانی خۆت دابین بكەی، یان هەندێك شتی لاوەكی بەدەست بهێنێ، كە ڕەنگە بۆ ئیسلامیش شتێكی تێدا بێت، بەڵام بە هەر

حاڵ دەبێ هەوڵ بدەین (مُنْكَر)ی گەورە بگۆڕین، کە بێگومان حوکم کردنی بەغەیری شەریعەتی خوا (الحكم بغير ما أنـزل الله) خراپە و (منكر)ی هەرە گەورەیە و ئەگەر ئەوت گۆڕی، لابردنی وردە ناشەرعییەکان (منكرات) زۆر ئاسانە. بەڵێ (منكر)ی هەرە گەورە بگۆڕە ولآت و گەل و نیشتیمان بچێتە ژێر سایەی شەریعەتی خوا. خەڵك بۆ خۆی چاك دەبێت. لە پێش سەردەمی(عمر بن عبدالعزيز)دا کە هەر دەستەلآتی ئیسلامیش بوو لە سەردەمی ئەمەوی یەکان دا خەڵك خەریکی دونیا گەرایی و ئارەزوو پەرستی بوون، (عمر بن عبدالعزيز) خوا لێی ڕازی بێ کە بە خەلیفەی پێنجەمی سەر ڕاست (راشد)ناوی دەرکردوە دوو ساڵ و شەش مانگ حوکمی کرد، بەلآم لەو ماوە کورتە دا یەکسەر بارودۆخی دونیای گۆڕی! لە سەردەمی ناو براودا باس باسی ئەوە بوو: چەندت قورئان لەبەرکردوە؟ چەند فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەزانی؟ حوکمی شەرعی فلآن شتە چۆنە؟ شەو نوێژ و ڕۆژووی سوننەتت چەند و چۆنە؟ بەڵێ ئاڵوگۆڕ بەسەر دونیا دا هات، چونکە وەك گوتراوە: (الناس على دين ملوكهم).

هەشت- ئنجا ئایا بەدیلی کۆمەڵ بوونی مسوڵمانان چی یە؟ وە ئایا بە دیلی ڕێکبوون(مُـنَظَّم)ی مسـوڵمانان چی یە؟ وە بەدیلی ئەوە کە مسوڵمانان ئەمیرو براگەورەیان هەبێت چی یە؟

بەدیل و جێگرەوەی کۆمەڵ بوون، واتە ئەگەر مسوڵمانان کۆمەڵ نەبن، ئەوەیە کە دەبێ پرش و بلآوبن!، وە ئەگەر مسوڵمانان ڕێك وپێك (مُنَظَّم و مُرَتَّب) نەبن دەبێ فەوزاو بێ سەرەو بەرەیی لە ئارادابێت! وە ئەگەر مسوڵمانان برا گەورەیان نەبێ دەبێ بێ سەر بن! زۆر سەیرە بگوترێ:

حاڵەتی شەرعی بۆ مسوڵمانان ئەوەیە سەریان نەبێ و سایەو سێبەرو براگەورەیان نەبێ!

هەندێك كەسیش دەڵێن: باشە بەڵام دەبێ مسوڵمانان هەموویان یەك كۆمەڵ بن، بەڵێ ئەوە داخوازی هەموو لایەكە هەر ئەوەش ئەصڵی شەرعی یە كە دەبێ مسوڵمانان یەك كۆمەڵ بن نەك لە سەر ئاستی كوردستان بەڵكو لەسەر ئاستی هەموو جیهانی ئیسلامیی ﴿ إِنَّ هَـٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ (الأنبياء -٩٢)، بەڵام ئەگەر ئەوە نەكرا؟! بێگومان هەموو لەسەر ئەوە یەكدەنگین كە (ما لايُدرَكُ كُلُّه لا يُترَكُ جُلُّهُ) ئەوەی كە هەمووی لە توانا دا نیە، نابێ زۆربەشی پشتگوێ بخرێ، ئەگەر نەتوانی دینی خوا هەمووی جێبەجێ بكەی خۆ نابێ هەمووی بەیەك جاری لێ بگەڕێی، ئەوەندەی لە توانات دا هەیە ئەنجامی بدە وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ ﴾ (التغابن -١٦)

یان ﴿ لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا... ﴾ (البقرة -٢٨٦) .

ئێمە دەتوانین كۆمەڵێك پێك بهێنین(٦) هەزار مسوڵمانی پابەندی لێ كۆ ببێتەوە یان (١٠) هەزاری لێ كۆببێتەوە، بەڵام بێگومان ناتوانین سەرجەم مسوڵمانانی لێ كۆبكەینەوە، واتە نابێ ئەوەی كە لە تواناماندا هەیە لێی بگەڕێین و وازی لێ بهێنین، لە بەر ئەوەی چاكترمان لە توانادا نیە، چونكە ئەوە دەبێتە پێپلیكەو قالدرمە، دەبێتە پێشەكی و ڕێخۆشكەر بۆ ئەوەی دیكەش، بەڵام هەر لە سەرەتاوە دەست لە كراس دەربهێنی و دەست لە ئەژنۆ وەربێنی هیچ ناكرێت، لە شتێكەوە دەبێتە شتێكی باشتر. بەڵام لە هیچەوە هیچ پەیدا نابێت!

زانایانیش لەسەر ئەم بنچینە شەرعییە یەكدەنگن كە دەڵێ: (لايَسْقُطُ الميسر بالمعسور) واتە: ئەوەی كە ئاسانە و بۆت ئەنجام دەدرێ لە كۆڵ ناكەوێ بە هۆی ئەوەوە كە زەحمەتەو پێت جێ بەجێ ناكرێ.

## ٣- بنەمایەكانی كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان:

ئنجا با بە خێراییش چاوێك بە بنەمایەكانی كۆمەڵی مسوڵمانان دا بخشێنین، ئایا مسوڵمانان كاتێك كۆمەڵ دەبن و جەماعەت و حیزب پێكدێنن دەبێ چۆن بن و بنەمایەكانی كۆمەڵبوونیان چین؟

١- دەبێ لەسەر بنچینەو بنەمای بەرنامەیەك كۆببنەوە وەك خوا (عزوجل) فەرموویەتی: ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴾ (المائدة ـ٤٨)

واتە: بۆ هەر كامێكتان بەرنامەو ڕێبازێكمان داناوە.

شەریعەتی خوای پەروەردگار بۆ هەموو ئۆممەتە، بەڵام هەر كۆمەڵە مسوڵمانێك لە قۆناغێك لە قۆناغەكانی مێژووی ئیسلامیی دا دەبێ بەرنامەیەكیان هەبێت بە لەبەرچاوگرتنی هەل و مەرجەكانی خۆیان تا بە پێی ئەو بەرنامەیە بەرێوەبچن، پێویستە هەر كۆمەڵە مسوڵمانێك بەرنامەو كاروكارنامەو پەیڕەو پرۆگرامێكی هەبێت كە لە قورئان و سوننەتەوە هەڵی هێنجابێت وەك گوتم بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەل و مەرجە تایبەتی یەی كە خۆی تێیدا دەژی.

٢- كۆمەڵی مسوڵمان دەبێ ڕاوێژو پرس و ڕایان بەیەكتر بێ، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وأمرهم شورى بينهم﴾ (الشورى ـ٣٨)، دیكتاتۆریەت و خۆسەپاندن، تاكڕەویی و ئیستیبداد لە ئیسلام دا نیە،

چونکه ئەوە فیرعەونایەتی یە وەك خـوای دادگـەر لـە فیرعـەون دەگێڕێتەوە کە دەیگوت: ﴿ مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ ﴾ (غافر ـ٢٩)، مسوڵمانان دەبێ پرس و ڕایان بەیەکتـر بێ و هەر بە پرس و ڕاوێژیش براگەورەو کاربەدەستی خۆیان دیاری بکەن، براگەورەش ڕاوێژیان پێ دەکات و ئەوانیش ڕێز لەو برا گەورەیە دەگرن و لە سنووری شەرع دا بە قسەی دەکەن.

٣- مسوڵمانان دەبێ ئەمیرو براگەورەیان هەبێت چونکە هیچ کۆمەڵێکی مسوڵمان بە بێ هەبوون براگەورە و سەروسێبەر کاریان بەڕێوە ناچێت، خوای پەروەردگاریش فەرمان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ ... ﴾ (النساء ـ٥٩) بەڵێ دەبێ مسوڵمانان ئەمیرو براگەورەو کاربەدەستێکیان لە خۆیان هەبێت کە بەرانبەر ئەو براگەورەیە بیستن و گوێڕایەڵیی و بەقسە کردنیان هەبێ و لە فەرمانی دەرنەچن و لە سنووری شەرع دا (سمع و طاعة)یان بۆی هەبێت، کە لەو بارەیەوە فەرموودە زۆرن بۆ وێنە (إسمعوا وأطيعوا وإن وليَّ عليكم عَبْدٌ حبشيٌّ)رواه البخاري ومسلم یان (على المرء المسلم السمع والطاعة فيما أحب أو كره ما لم يؤمَرْ بمعصية)رواه البخاري ومسلم.

کۆمەڵی مسوڵمان دەبێ براگەورەیەکی هەبێت و فەرمانەکانی ببیستێ و بە قسەشی بکات و نابێ کەس بە ڕەی کەس نەپێوێ، ئاوا ئیش و کاری مسوڵمانان بە ڕێوە ناچێت، وە ئەوە پێچەوانەی سیرەو سوننەتی پێغەمبەریشە ﷺ، وە پێچەوانەی واقیعی ژیان و گوزەرانی ئینسانیشە.

٤- بۆ خوا یەكلابوونەوەو پابەندی بە شەرعەوە، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرمویْ: ﴿ وما أمروا الا ليعبدوا الله مخلصين له الدين ﴾(البيّنة ـ٥).

٥- ئەو كۆمەڵە مسوڵمانەی كە دروست دەبیْ، پێویستە بەرچاو ڕوون و واقیع بین بن، بزانن دەورو بەرەكەیان چۆنە؟ بەرانبەرەكەیان كێیە و چەندەو چۆنە؟ بۆخۆیان توانایان چەندەو چی یان پیْ دەكرێت؟! واتە واقیع بین بن و خەیاڵ پلاو نەكەن و لە جیهانێكی میثالی دا نەژین وەك خوا (جلّ و علا) فەرموویەتی:

﴿قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي﴾ (يوسف ـ١٠٨)

واتە: بڵیْ ئەوە ڕێبازی منەو لەبەر ڕۆشنایی دا بانگەواز دەكەم بۆ لای خوا من و شوێنكەوتووانم.

بەڵیْ كۆمەڵی مسوڵمان دەبیْ بەر چاوی ڕوون بیْ، خۆی بناسیْ و دەورو بەری بناسیْ، بە تەواوی ئاگاداری هەل و مەرجی سیاسی نێو دەوڵەتی بێت، ئنجا بەو پێیە، بە پێی توانای خۆی هەنگاو بنیْ بەرەو ئەو ئامانجانەی لە پێشیەوەن.

٦- بنەمای شەشەم و كۆتایی بۆ هەر كۆمەڵێكی مسوڵمان ئەوەیە كە توانایەكی دارایی و ئابووریی خۆیانیان هەبێت، لەو بوارەوە (اعتماد)یان لەسەر خۆیان بێت، چونكە وەك قاعیدەیەكی لیْ هاتوە كە گوتراوە:

(مَنْ لا يَمْلِكُ قُوْتَهُ لا يَمْلِكُ قَرارَهُ)

واتە: كەسێك بژێوی خۆی بەدەست خۆی نەبێت، ئەوە بڕیاری خۆی بەدەست خۆی نیە!

ئنجا ئەگەر هات و ئەوەیان دەستە بەر کرد پێویستە هەوڵ بدەن لە ڕووی سیاسی و فیکریشەوە سەربەخۆبن و وابەستەو دابەستەی کەس نەبن! کۆمەڵی مسوڵمان کاتێك دەستی دەچێتە ژێر باری خەڵکەوەو کاتێك نیری خەڵکی دەچێتە سەر شان لە کەڵکی ئەوە دەبێت کە بتوانێت خزمەتی دینی خوا بکات!

بەڵێ کۆمەڵی مسوڵمان دەبێت هەوڵ بدات سەر بەخۆیی هەبێت سەرەتا لە ڕووی ئابووریی، پاشان لە ڕووی فیکریی و بڕیارو هەڵوێستی سیاسی یەوە.

بەڕاستی خوشك و برایانی مسوڵمان: ئێمە وەك ئەهلی ئیمان و ئیسلام وەك مسوڵمانانی کوردستان و عێراق زۆر پێویستی مان بەوە هەیە کە دڵنیابین هەتا کۆمەڵ نەبین و هەتا جەماعەت و ئوممەت نەبین، نابینە ئەو مسوڵمانەی کە جێی ڕەزامەندیی و پەسندیی خوای بەدیبهێنەرە! پاشان ئاگاشمان لەوە بێ کە دەبێ کۆمەڵ و جەماعەت بین و پێکەوەبین لەسەر ئەساس و بنچینەی شەرع، چونکە تەنیا کۆمەڵ بوون و خڕبوونەوە سەریەك بەس نیە، کامەشمان لە هەموومان گەورەترە، دەبێ لە هەموومان مل کەچتربێ بۆ شەرع، لە ئیسلام دا کەس لەسەرووی شەرع و قانوونەوە نیە، لە ئیسلام دا هیچ کەس جیاکراوەو هەڵاوێردراو (مُسْتَثْنى) نیە لەوەی کە مل کەچی شەرع بێت، کێ لە هەموویان گەورەتر بێت دەبێ لە هەموویان مل کەچتر بێت بۆ شەرع!

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی تەوفیق و هیدایەتمان بدات کەلە دەوری دینی خوا کۆببینەوە، پشتیوانی مان لێ بکات کە کۆمەڵ و جەماعەتێك بین لە کوردستانی خۆمان داو لەغەیری کوردستانیش دا کە جێی ڕەزامەندیی و

پەسندیی خوا و پێغەمبەر ﷺ بین. خوایە دەرووی خێرمـان لـێ بكەیـەوە، خوایە دڵەكانمان بەیەكەوە ببەستی لەسەر ئەساسـی تـەقوا، برایـەتی مـان مەحكەمتر بكەی، ڕیزەكانمان زیاتر بەیەكەوە جـۆش بـدەی، خوایـە بەرچـاو ڕوونترمـان بكـەی لـە دیـنی خـۆت دا، ئـەو مسـوڵمانانەش كـەتا ئێسـتا چاوپێچكیان لەسەر چاوە یاخود تا ئێستا تەم و مژ بەر چاوی گرتوون، خوایە بەرچاویان ڕوون بكەیەوە.

آمین

## وتـــــاری دووەم

### ٤- ئەنجام و بەرهەمی كۆمەڵبوونی مسوڵمانان چی یە؟

ئەگەر مسوڵمانان كۆمەڵ بن، جەماعەت بن، ئۆممەت بن، دەتوانن چی بكەن؟ بۆچی خوای كاربەجێ لەسەر مسوڵمانانی پێویست كردوە كە كۆمەڵ بن، ئامانج لەوە چی یە؟

دیارە خوای كار بەجێ بۆ كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان چەند وشەیەكی بە كار هێناوە بۆ وێنە: ئۆممەت (الأمة) وەك دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً ﴾ (الأنبياء-٩٢)

واتە: (ئا ئەوە ئۆممەت ـ كۆمەڵ ـ ی ئێوەیە یەك كۆمەڵە)، پێناسەی ئۆممەتیش بریتی یە لە:كۆمەڵە خەڵكێك كە نیازو مەبەستێك، ئاوات و هیوایەك، كۆیان دەكاتەوە، جا لەسەر حەق بن یان ناحەق.

وە لە قورئان دا وشەی (قوم) هاتوە:

﴿ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ ﴾ (المائدة-٥٤)

پێناسەی(قەوم)یش بریتی یە لە: كۆمەڵە خەڵكێك كۆببنەوە لەسەر بنچینەیەك.

وە وشەی(فرقة)ش هاتوە، هەروەها وشەی(طائفة)ش وەك خوا عزَّوجلَّ دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ ﴾ (التوبة-١٢٢).

لە سونننەتی پێغەمبەریش دا (علیە الصلاة والسلام) هەركام لە وشەكانی (الجماعة، الأُمة، فرقة، طائفة) هاتون كە هەموویان بەڵگەن لەسەر كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان و تۆكمە بوون و بە یەكەوە بوونیان.

لە وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرێ دا زۆر بە كورتی دەتوانین بڵێین: ئامانج وبەرهەمی كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان ئەوەیە كە دینی خوا، شەریعەت و بەرنامەی خوا، لە ژیانی خۆیان دا بەرپابكەن، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ﴾ (الشورى -١٣)

واتە: دینی خوا بەرپا(إقامة) بكەن و جێ بەجێ بكەن لە ژیانی خۆتان دا تێیدا پەرتەوازە مەبن....

خوای پەروەردگار لە چەندان دەقی قورئان دا ئاماژەی بەوە كردوە ئینسان لە كاتێك دا وەك تاك هیدایەتی خوا وەربگرێ و قبوولی بكات هەر ئەو ئەركانەی دەخرێتە سەر كە وەك تاك دەتوانێ پێیان هەستێت، بەلاَم كاتێك چەند تاكێكی مسوڵمان كۆمەڵێكی ئیسلامیی، كۆمەڵگایەكی ئیسلامیی پێك دێنن، ئەو كاتە چەندین ئەرك(وظيفة)ی دیكە دەخرێتە سەر شانیان كە دەتوانن جێ بەجێ یان بكەن.

خوای بێ وێنە جلّ شأنه دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ ﴾ (النور -٥٥)

واتە: خوا بەڵێنی داوە بە ئەوانەتان كە ئیمانیان هێناوەو كردەوەی باش دەكەن بیان كاتە جێنشین لەسەر زەوی ـ جێنشینی خۆی بۆ جێ بەجێ كردنی شەریعەتەكەی ـ وەك چۆن ئەوانەی كە لە پێش ئەوان دا بوون لە سەر زەوی كردبوونی بە جێنشین...

وە بۆ ئەوەی ئیمانداران زەوی خوا بە میات بگرن: ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴾ (الأنبياء ـ١٠٥) بەڵێ دەبێ عەبدە چاکەکانی خوا زەوی خوا بە میات بگرن، چونکە خوای بەرزو بەتوانا ئەم زەوی یەی نەکردوە بە سفرەیەك و ڕاینەخستوەو نەیڕازانۆتەوە بۆ ئەهلی کوفرو بۆ طاغووتەکان، ئەوانەی بە ناحەق تەراتێن لە سەر زەوی خوادا دەکەن، بەڵکو لە ئەصڵ دا ئینسانەکان بۆ بەندایەتی کردن بۆ خوا دروستکراون، ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ (الذاريات ـ٥٦)، وە لە ئەصڵ دا ئینسان ئەرکی جێنشینایەتی و هەڵگرتنی ئەمانەتی خواو ئاوەدانکردنەوەی زەوی خوای پێ سپێردراوە بە پێی شەریعەتی خوا: ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾ (هود ـ٦١) . جا لەکاتێك دا ئینسانەکان لە جیاتی خوا طاغوتەکان دەپەرستن، لە جیاتی (هدى) بە دوای هەوا (هوى) دەکەون، لە جیاتی شەریعەتی خوا بە دوای ڕێچکەو بیدۆزە دەستکردەکان دەکەون! لەو حالەتانەدا مرۆڤایەتی لەو حیکمەتە کە خوا بۆی خوڵقاندوە لەو ئامانجە کە خوا بۆی دیاری کردوە، لایداوە، کەواتە ئەرکی سەرشانی مسوڵمانانە کە بە شەریەت بگێڕنەوە ژێر سایەی شەریعەت و بەرنامەی خوا، جا چ ئیمانی پێ بێنن چ ئیمانی پێ نەهێنن، شەریعەتی خوا بۆیە هاتوە سایەو سێبەر بێ بۆ خەڵکی سەر زەوی، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی ئیمانی پێ دێنێ و پێیەوە پابەند دەبێ لە دنیاو قیامەت پێی بەختەوەر بێت، ئەوەش کە ئیمانی پێ ناهێنێ و پشتی تێدەکات بەڵام ئامادەیە لە ژێر سایەی دا بژیت بەلای کەمەوە لە دنیادا پێ ی بەختەوەر بێت، چونکە ئەگەر

لەژێر سایەی عەدالەتی ئیسلام دا بژیت زوڵم و ستەمی لێ ناكرێ و نەفس و نامووس و سەروماڵ و كەرامەت و ئابڕووی پارێزراو دەبێت.

خوای پەروەردگار كە باسی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ دەكات، دەفەرموێ:

﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ..﴾ (البقرة -١٤٣)

واتە: (ئێوەمان كردوە بە چاكترین ئوممەت، تاكو بە سەر خەڵكی یەوە چاودێر بن) چاودێر بن بەسەر مرۆڤایەتی یەوە بۆ ئەوەی تووشی لادان (إنحراف) نەبێت و هەندێكی هەندێكی دیكە نەچەوسێنێتەوە، چینایەتی و قڕیی و پڕیی نەبێت، زاڵم و مەزلوومی نەبێت لە نێوانیان دا، هەندێكیان نەبنە پەرستراو و ئەوانی دیكەش پەرستار، هەندێكیان نەبنە ئاغا و كوێخا و ئەوانی دیكەش بكرێنە بەندەو كۆیلە، بەڵكو هەموویان بەندەی خوا بن و بەیەكەوە براو تەبابن، وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:

(وكونوا عباد الله إخواناً) رواه مسلم

بەندەی خوا بن و بەیەكەوە برا بن، یان بەلای كەمەوە بە یەكەوە تەبابن! ئەوكەسەی لە ئیمانیش دا لەگەڵت نەبێتە برا با بە تەبایی لەگەڵت دا بژی لە ژێر شەریعەتی خوا، بەڵێ ئەمانە ئەو ئامانجانەن كە خوای پەروەردگار فەرمووی و پێغەمبەر ﷺ ڕوونی كردوونەوە كە بێگومان بە بێ كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان نایەنە دی.

كەی دەتوانین دینی خوا پیادە (إقامة) بكەین و بە پێی ئەوە كە خوا ناردوویەتی یە خوارەوە حوكم بكەین! كە دەفەرمووێ:

﴿ وأن احكم بينهم بما أنزل الله ولا تتبع اهواءهم﴾ (المائدة - ٤٨)

واتە: بەوە كە خوا ناردویەتی یە خوارەوە حوكمڕانی یان لە نێوان دا بكە، وە بە دوای ئارەزووەكانیان مەكەوە.

بێگومان كاتێك ئەوە «گونجێت كە مسوڵمانان كۆمەڵ بن، بۆیەش ئـەو ئایەتە لە مەدینە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە خـوار. لـە قۆنـاغی مەككـە (مكة) خوای پەروەردگار بە زۆری بە پێغەمبەری ﷺ دەفەرموو: بە خەڵك بڵـێ با ئیمان بێنـن و پەروەردگاری خۆیان بناسن، بـزانن كـە سـەرەنجامێك هەیە و بەهەشت و دۆزەخ وپاداشت و سزایەك هەیە، بەڵام لە مەدینـە دوای ئەوە كە مسوڵمانان كۆمـەڵ بوون كیان و قەوارەو دەستەڵات و دەوڵەتیان پەیدا بوو، ئنجا خوای باڵادەست فەرمووی: حوكمیان لە نێوان دا بكە بەوەی كە خوا ناردوویەتی!

هەروەها خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الحج)دا دەفەرموێ:

﴿ الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَـامُوا الصَّـلَاةَ وَآتَـوُا الزَّكَـاةَ وَأَمَـرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ (٤١)﴾

واتە: ئەوانەی كاتێك دەیانكەینە خاوەن دەسـتەڵات لـە زەوی دا ـ دوای ئەوەی كۆمەڵی مسوڵمانان گەشە دەكەن و دەبن بە كۆمـەڵگای مسـوڵمان، پاشان دەبن بە كیان و قەوارەو دەوڵەتێكی ئیسلامیی، ئەوانە چی دەكەن؟

ـ نوێژ بەرپا دەكەن و (نوێژ گەورەترین عیبادەتی ڕووحی یـە) ـ زەكـات دەدەن (زەكاتیش گەورەترین عیبادەتی ماڵی یە) وە فەرمان بە چاكە دەكەن و قەدەغەی خراپە دەكەن... .

ئا ئەوە ئەرك (وظیفة)ی كۆمەڵی مسوڵمان و كۆمـەڵگای مسـوڵمان و دەوڵەتێكی مسوڵمانە.

كەواتە بە كورتی: هەر كۆمەڵێكی مسوڵمان و ئیسلامیی ئەو ئامانجە ستراتیژی یەی نەبێت كە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەورووبەر و كۆمەڵگاكەی بخاتە ژێر حوكمی خواو جڵەوی حوكم و سیاسەت بەدەستەوە بگری! ئەو كۆمەڵە مسوڵمانە بە كۆمەڵێكی ڕەسەن (أصیل) دانانرێت، بەو كۆمەڵە دانانرێت كە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە سەر ڕاستەكانی و هاوەڵە بەڕێزەكانی و بنەماڵەی بەڕێزی دەڕوات!

پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەكانی و هاوەڵانی بەڕێزی و زانایان و پێشەوایانی ڕەسەنی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ هیچ كاتێك ڕازی نەبوون دینی خوا بە زەلیلی لە گۆشەی مزگەوتێك داو لە پەراوێزی ژیانی كۆمەڵگادا خۆی كوشمەڵە بكات و دەست لە ئەژنۆیان وەربێنێت!!

دینی خوا بە كەمتر لەوە كە خەڵك ئاڕاستەكان (توجیهات)و هیدایەتی لێ وەربگرن و ژیانیان بەپێی شەریعەتی ئەو ڕێكبخەن ڕازی نابێت، هەر كۆمەڵێكی مسوڵمان دەبێ بەرەو ئەو ئامانجە ستراتیژی یە بڕواو هەنگاو بنێ، جا كەی دەیگاتێ؟ ئەوە شتێكی دیكەیە، گرنگ ئەوەیە كار بكەی و بجوڵێی و بە ڕاست و دروستی و بە هۆكاری شەرعی یەوە بكەویە ڕێ، گرنگ ئەوە نیە كەی دەگەی! لەیەكەمین هەنگاویشەوە شەریعەتی خوا چۆنە ئاوای ڕابگەیەنی، لە پێناو ڕەزامەندی خەڵك دا لێی زیاد و كەم نەكەین، تاكو ئەو خەڵكەی كە ئیمان دێنێ و دەبێتە دۆست و پشتگیریت دەكات، بزانێ بۆچی یە! ئەوەش كە دەبێتە دوژمن و ناحەز بزانێ دوژمنایەتی چی دەكات:

﴿ لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ ﴾ (الأنفال ـ ٤٢).

## ٥- بۆچی ئەهلی كوفر، دوژمنانی ئیسلام ڕقیان لە كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان دەبێتەوەو دژایەتی كۆمەڵە ئیسلامییەكان دەكەن؟!

هەمیشە ئەهلی كوفرو نیفاق و شیرك و ئیلحاد (الكافرون، المنافقون، المشركون، الملحدون) قەڵسن بەوە كە مسوڵمانان كۆمەڵ بن، بەڵام بۆچی وەك دژایەتی مسوڵمانان دەكەن لە حاڵەتی كۆمەڵ بوونیان دا، ئاوا دژایەتی یان ناكەن لە حاڵەتی پرش و بڵاویاندا؟! بۆچی دوژمنانی دینی خوا لەو حاڵەتانەدا دژایەتی ئیسلام و مسوڵمانان دەكەن كە لە كیان و قەوارەو دەوڵەت دا خۆیان دەبیننەوە؟حیكمەت و نهێنی ئەوە چی یە؟!

ئەگەر تەماشا بكەین! نەك هەر لەسەر ئاستی دەوڵەتان بەڵكو ئەوەتا ڕۆژئاوا بەگشتی وئەمریكا بەتایبەتی كە ئەمڕۆ دەیەوێ كەڵەگای دنیا بێت و كوێخایەتی دنیا بكات و فەرهەنگ و كلتووری ئاژەڵی یانەی خۆی و قیەمی ماددی یانەی خۆی بەسەر دنیادا فەرز بكات! دەبینین ئەو كیان و قەوارە ئیسلامی یانەی دروست بوون (ئێران، سوودان) كردوونی بە دوژمنی ژمارە یەكی خۆی، لە دوای ئەوان كۆمەڵ و لایەنە ئیسلامیی یەكان، پاشان هەر كەسایەتی یەكی ئیسلامی تەنانەت ئەگەر یەك كەسیش بێ.

ئەمڕۆ ئەمریكا كە سەركردایەتی ڕۆژئاواو (سیستەمی نوێ ی جیهانی) دەكات كە لە ڕاستی دا هەر ناویان لێ گۆڕیوە ئەگەرنا هەر دكتاتۆری یەكەی جارانە! چونكە كە بانگەشە دەكەن دەبێ مرۆڤایەتی هەمووی بێتە ژێر ڕكێفی ئێمەوە! ئەوەی ئێمە بەباشی دەزانین دەبێ خەڵكیش بەباشی بزانن كە ئەمە

دكتاتۆریەتیەكی ئاشكرایە بۆیە ئێمە دەڵێین! نەخێر ئێمە وەك ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بە باش دەزانین كە خوا بۆی بە باش دانـاوین و پێغەمبەر ﷺ بۆی پەسند كردووین، نەك ئەوەی كە (كلنتۆن و بوش و فلان و فیسار) بە باشی دەزانن، ئەوەی ئەوان پێی دەڵێن: مافی مرۆڤ و دیموكراسی و ئازادیی... ئێمە بە دروشمێكی بریقەداری بۆشی دەزانین! دەی ئەگەر ئەوان بڕوایان بە مافی مرۆڤ هەیە، مسوڵمانانیش مرۆڤن! بۆ دەبێ ئەوان قیەمی گەندەڵ و پووچەڵ و ئاژەڵی یانەی خۆیان بە سەر مسوڵمانان دا فەرز بكەن؟! بە ناوی مافی مرۆڤ و ئازادی و دیموكراسی یەوە؟!

كوفری جیهانی و هەر جۆرە كوفرێكی دیكە كە دژایەتی ئیسلامی یەكان دەكەن لە كاتێك دا خۆیان لە كۆمەڵ و جەماعەت دا دەبیننەوە، چ وەك قەوارە و دەوڵەت بن، چ وەك كۆمەڵ و لایەنی سیاسیی وە دژیان دەوەستن لە كاتێك دا باسی جەنگ و جیهادو مقاوەمەو بەرهەڵستی دەكەن لەبەر ئەوەیە: كە دوژمن بەو قسەیەی مسوڵمان قەڵسە كە بۆ ئەو زیانی هەیە، بەو شوێنەی مسوڵمان قەڵسە كە بۆ ئەو مەترسی هەیە! ئەگەر مسوڵمانان پەرش وبڵاو بن، هەر كەسە لەماڵی خۆی بێ وكەس بە ڕەی كەس نەپێوێ و هەركەس دەست بە كڵاوی خۆیەوە بگرێ تا (با)نەی بات، بڵێ: كاكە ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە! ڕێی دووریان نێوان ماڵ و مزگەوت بێ، تەنیا دینداریی شەخسی بكەن و دینداریی لە خۆیان دا گچكە بكەنەوەو لە كۆمەڵگای دابڕێن! بەوە فریو بخۆن كە دین تەنیا لەسەر دوانگە بێ و پەیوەندی بە فەرمانگەوە نەبێ! دین تەنیا لە مزگەوت بێ و پەیوەندی بە بازاڕەوە نەبێت! ئەگەر مسوڵمانان وا بیر بكەنەوەو وابن! بێگومان دەبنە نێچیرێكی دەستەمۆ و

تووك نەرم، كە قــووت دران و هەڵلوشــینیان، بردنــی خێــر و بێــری وڵات و مەملەكەتیان، ملكەچ كرانیان و ژێر دەســت كرانیــان دەبێتــە شــتێكی زۆر سەهل و ئاسان! جا دوژمن بۆچی پێی خۆش نەبێ وابین؟!!

بەڵام لەكاتێك دا مسوڵمانان كۆمەڵ بن، دركیــان پێــوە بێــت، جیهــادو خەبات و فیداكاری و بەرەنگاری لە دڵ و مێشكیاندا هەبێت بڵێن: جگە لــە خوا (الله) كەسی دیكە ناپەرستین و جگە لە پێغەمبــەر خــوا ﷺ كەســی دیكە بە ڕابەرو پێشەوا نازانین، مەگەر ئیجازە لە پێغەمبەر ﷺ وەربگرێ و شوێنكەوتووی ڕاستەقینەی ئەو بێ و بە شوێن پێی ئــەودا هــەنگاو بــنێ وە جگە لە شەریعەتی خوا هیچ شتێكی دیكە بە بەرنامەی ژیانمان نــازانین، وە لەسەر ئەوەش خەبات دەكەین، كۆمەڵ دەبین، وەك دیــوارێكی قورقوشــمیی یەكتــر مەحكەم دەكەین! مسوڵمانان ئەگەر وابن جێگای مەترســی ئــەهلی كوفرن، و هەرچەندە بۆیـــە دژایەتی یان دەكرێ، بەڵام ناتوانن ئیـــــرادەیان كپ كەنەوە.

بۆیە لە حاڵەتی دووەم دا دژیان دەوەستن، بەڵام لە حاڵەتی یەكەم دا (بارك الله)یان بۆ دەگوترێ! جا ئەو كەسانەی بەوە فریو دەخۆن و قەناعەت دەكـەن كە مسوڵمانەتی پەیوەندی بە سیاسەت و حوكمڕانی و بە كۆمــەڵگاوە نیــە، بەڵكو مسوڵمانەتی تەنیا عیبادەتی شەخسی و ڕووحی یە و پەیوەندی نێوان خۆت و خوایەو بەس، ئەو جۆرە بیركردنەوەیە ئەگەر سەرنج بدەین دوژمنــانی دین، ڕەواجی پێدەدەن، بە هەر شێوازێك و لە ژێر هەر ناوونیشــانێك دابێــت ڕەواج بەو جۆرە مسوڵمانەتی یە شەخسی یە دەدرێت، بۆ ئەوەی مســوڵمانان لەبەریەك هەڵوەشێن و بە دینی نەزانن كە پێكەوە بــرابن و دەســتیان لــەنێو

دەستی یەك بێ، بۆ ئەوەی نەبنە دیوار بەڵكو هەر كەرەستەی خاو بن و هەر خشتەی لە لایەك بكەویت!..

تەماشا بكەن هیچ حیزب و لایەنێكی عەلمانی لاریی لەوە نیە كە مسوڵمانێكی دەرەوەی كۆمەڵە ئیسلامیی یەكان وەربگرێت، چونكە ئەو مسوڵمانە وەك كەرەستەی خاو وایە بگرە دەیكەن بە ئەندام و دواتر كادیریش، بەڵام هیچ حیزبێكی عەلمانی ئامادە نیە مسوڵمانێكی ئیسلامیی وەربگرێت و لە حیزبەكەی خۆی دا بیكاتە ئەندام! دەڵێ: بەكەڵك نایەو مەترسیدارە! دوایی خەڵكی دیكەشمان لێ هەڵدەگێڕێتەوە، بۆیە دەبێ بەتەواوی دەست لە بیروباوەڕەكەی هەڵبگرێ و چاك خۆی بشواتەوە، لێی دڵنیابین كە هیچ شوێنەوارو كاریگەری ئیسلامەتیی پێوە نەماوە، ئنجا وەری دەگرین!

چونكە لە حاڵەتی یەكەم دا مسوڵمانەكە وەك هەویری خاو وایە، و كەرەستەی خاوە، خۆیان چۆنیان بوێت ئاوا قاڵبی لێ دادەڕێژن و خشتی لێ دروست دەكەن! بەڵام مسوڵمانێك كە لە قاڵبی ئیسلام دا شكڵ و شێوەی وەرگرت و داڕێژرا، زانی چی یە و كێیە و بەرنامەی چی یە؟ دەڵێن: ئەوە بە كەڵكی ئێمە نایەت و، بڤەو مەترسی یە!

كەواتە ئێمە دەبێ هەر بەوە ڕا بزانین كە عیززەتی ئێمە لەچی دایە و ڕێگەی عیززەت كامەیە، ئێمە ناڵێین كەس بكەینە كۆیلە، ئێمە دەمانەوێ كە ئەوانەی بوونەتە كۆیلەی گەدەو داوێن و گیرفانشیان، ئەوانیش ڕزگار بكەین لە كۆیلایەتی و بیانكەینە بەندەی خوای بەدیهێنەر. بەڵام ئەوان دەیانەوێ ئێمە بكەنە كۆیلەی خۆیان.

بێگومـــان ڕێگـــای شـــەهامەت و جـــوامێری، ڕێگـــەی بەختـــەوەریی و سەرفیرازیی لە دنیاو قیامەت دا ئەو ڕێ یەیە کە دژمنانی دین پێی قەڵسن، کە هەر ئەو ڕێگایەشە کە قورئان و سوننەت زۆر داکـۆکی لەسـەر دەکـەن، (ئیبنو تەیمییە)و باقی زانایانیش ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەڵێن: گەورەترین فەرز لە فەرزە کۆمەڵی یەکانی ئیسلام جەنگ و جیهـادە لـە ڕێ ی خـوادا! ئەوەندەی خوای پەروەردگار مەدحی جیهاد و موجاهیـدانی کـردوە، ئەوەنـدە مەدحی هیچ عیبادەتێکی دیکەی نەکردوە!

عیبادەتە شەخسی یەکان گەورەترینیان نوێژە، عیبادەتە کۆمەڵی یەکانیش گەورەترینیان جیهادی ڕێی خوایە، کە لوتکەی هەرە بەرزی ئیسلامە (و ذِرْوَةُ سَنامِهِ الجِهاد)[1]، بۆچی؟ چونکە ئەگەر مسوڵمانان موجاهیدی ڕێی خوا بن و هێزو پێزو دەستیان هەبێت ناچەوسـێنرێنەوە، وڵات و نیشـتیمانیان داگیر ناکرێت و خێرو بێری وڵاتیان زەوت نا کرێت و بە تاڵان نابردرێت، شەریعەتی خوای باڵا دەستیش جیهادی لەسەر فەرز کردوون کە ئەگەر جێ بەجێی بکەن دینەکەیان لێ ناخرێتە پەراوێزی کۆمەڵگاو پەراوێزی ژیان و گوزەرانەوە.

## ٦- چەند ئامۆژگاری و ئاگادارییەك بۆ خۆمانی ئیسلامی:

یەك- هەر کۆمەڵێکی ئیسلامیی دەبێ خاڵی دەست پێکردنی بۆ گۆڕانکاری و پاکسـازیی و چاکسـازیی دەوروبـەرو کۆمـەڵگا خـاڵی دەسـتپێکردنی پێغەمبەران بێ (علیهم الصلاة والسلام) ئـەوان لـە کـوێ وە دەسـتیان پێکردوە ئێمەش لەوێ وە دەست پێبکەین.

(١) رواه الترمذي و احمد.

لە كاتێك دا ئێمە لەگەڵ میللەت و كۆمەڵگای خۆمان لەسەر پەروەردگاریتی و پەرستراویتی خوا، وە لەسەر حاكمیەت و فەرمانڕەوایەتی خوا ڕێك نەكەوتووین، وە لەسەر بنچینەكانی ئیمان و ئیسلام، ڕێك نەكەوتووین! هیچ ماقووڵ نیە بچین خۆمان بەشەڕی لاوەكی یەوە خەریك بكەین و سەرقاڵی وردە بابەتەكان بین!

من گەلێك جاران بەوێنەی دەهێنمەوەو دەڵێم: كەسێك گیرۆدەی كوفرو بێ بڕوایی و هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)بێت ناكرێ لە گەڵی دا بكەیە مشت و مڕ لەسەر ئەوەی كە بۆچی فلاَن بیدعەتە ئەنجام دەدەیت؟ بۆچی فلاَن سوننەتە ناكەی؟ بۆچی فلاَن گوناحە دەكەی! لە كاتێك دا كە كوفرو شیركی تێدایە، وەك ئەوە وایە: كەسێك كەوتبێتە ئاوێكەوەو خەریكی خنكان بێت، بەلاَم ئەو كابرایە بەر سمێڵی هاتبنە خوارەوە، كەسێكیش بەلای دا بڕواو دەست بەجێ مەقەست و ئاوێنەیەكی بۆ بەرێت بڵێت: كاكە بەرسمێڵت كورت بكەوە چونكە ئەوە سوننەتە تۆ لە سوننەت لات داوە، كابراش فەقیە خەریكی خنكانە! بۆیە زانایان دەڵێن: كاتێك فەڕزو سوننەت تێك دەگیرێن، دەبێ فەڕزەكە پێش بخرێ، تۆ جارێ كابرا لە ئاو دەربهێنە و ژیانەكەی لە خنكان ڕزگار بكە، پاشان كەم و كوڕی یەكانی لێ حاڵی بكە!

بەڕاستی ئەم قۆناغەی ئێستای ئێمەش لەگەڵ میللەتانی خۆمان لە كوردستان و زۆربەی جیهانی ئیسلامیی دا هەر وایە، قۆناغی ئەوەیە كە لەگەڵ خەڵك و میللەتی خۆمان دا لەسەر مەسەلەی ئیمان و ئیسلام دەعوا بكەین، كە تێك دەگیرێین با لەسەر وردە بابەتەكان نەبێت، بۆ وێنە: خوێندنی قورئان بەمردوو دەگات یان ناگات! زۆرینەی زانایان

(جمهور) لەسەر ئەوەن كە قورئان خوێندن و هەموو خێرو چاكەیەك بە مردوو دەگات، بەڵام ئیمام شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) پێی وایە كە قورئان خوێندنی پێ ناگات.

باشە ئەوە كەی كێشەو موشكیلەی ئێمەیە؟ كێشەو گرفتی گەورە ئەوەیە كابرا بڕوای بە قورئانی خوا نیە! نەك ئەوەی دەیخوێنێ و بڕوای پێیەتی و بەڵام دەڵێ: ڕەنگە بە مردوو نەگات، كە ئەوە مەسەلەیەكی خیلافی یە، موشكیلەمان ئەو كەسە نیە كە لە تەحییاتی نوێژ دا پەنجە دەجووڵێنێ یان نای جووڵێنێ، هەردووكی هەر سوننەتە. موشكیلە ئەو كەسەیە كە تەحییات هەر ناخوێنێ، موشكیلەمان ئەو كەسە نیە ڕوو دەكاتە قیبلەی خوا (كعبة الله) و نوێژ دەكات بەڵام دەست بەرز دەگرێت یان نزمی دەگرێت، كێشەمان ئەو كەسەیە كە هەر ئەهلی قیبلە نیەو هەر بڕوای بە پەرستنی خواو پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ نیە!

ئێمە دەبێ بزانین لە كوێ وە دەست پێدەكەین و لە پێشترەكان(أولويات)ی كارەكانمان چین و لە گرنگترینیانەوە دەست پێ بكەین، پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) لەوەوە دەستیان پێ كردوە كە خەڵك بكەن بە عەبدی خوا، وەك خوای پەروەردگار لە سەر زمانی پێغەمبەران(عليهم الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ﴿.. يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُ... ﴾ (الأعراف ـ٥٩،٦٥،٧٣،٨٥) .

واتە: ئەی قەومەكەم خوا بپەرستن جگە لەو پەرستاوێكی دیكەتان نیە. ئا ئەوە بنچینەو بنەمای دینە كە خەڵك بەقەناعەت و دەلیل و بەڵگە بكەین بە عەبدو بەندەی خوا، ئیمان بە شەریعەت وبەرنامەی خوا بێنن و پێی ڕازی بن، ئیمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە سەرجەم

بنچینەکانی ئیمان و ئیسلام بێنن، ئەوە خاڵی سەرەکی و گرنگ و پێویستە لەم قۆناغەی ئیستادا.

هەڵبەتە لەنێو خۆداو لە دائیرەی کاری ئیسلامی و کۆمەڵە ئیسلامیی یەکان دا دەکرێ باس لە هەموو سوونەتەکانیش بکرێت، بەلاَم لەگەڵ خەڵك و جەماوەر دا دەبێ باس لە شتە سەرەکی و بنەڕەتی یەکان بکرێ و گرنگی یان پێ بدەین، واتە هەرچی سوننەت و مەندوویات و وردە بابەتە خیلافیەکانن با بە دەرس بخوێنرێ ووتاری لەسەر بدرێ و لێکۆلینەوەی دەربارە بکرێ، بەلاَم دەبێ بزانین خەڵك و جەماوەر چۆن بدوێنین، کوێ یان زیاتر دێشێ و کوێ یان زیاتر پێویستی بە تیمارو چارەسەر هەیە لەوێوە دەست پێ بکەین.

دوو- حیزب و کۆمەڵی ئیسلامیی وەسیلەیە نەك هەدەف! هەر کۆمەڵ و حیزب و لایەنێکی ئیسلامیی کە لە کوردستان و عێراق و لە هەر شوێنێکی دیکەی جیهانی ئیسلامیی دا هەن، وەسیلەن بۆ خزمەتی ئیسلام نەك هەدەف، لە بیرمان نەچێتەوە کە ئامانج و هەدەفەکە دینی خوایە، بەلاَم کۆمەڵ بوون و ناو لەخۆنان بۆ چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن (تعامل)ە لەگەڵ خەڵك و دەوروبەردا، چونکە ئەگەر کۆمەڵ و حیزب و جەماعەت نەبین پرش و بلاو دەبین و کاری ئیسلامیی مان بۆ ناکرێت و دینی خوامان بۆ پیادە ناکرێت!

لە بیرمان نەچێتەوە ئەو کۆمەڵ بوونەمان وەسیلەیە بۆ هێنانەدی هەدەفێك کە بریتیە لە حوکمڕانێتی و بالاَدەستی ئیسلام و ڕەزامەندی خوای پەروەردگار.

سـێ- لێشمان تێك نەچێت كە كۆمەڵ و لایەنێكی ئیسلامیی كۆمەڵێكن لە مسوڵمانان!

ئێمە بریتی نین لە كۆمەڵی مسوڵمانان، ئەوەش هەڵەیە كە بگـوترێ: مسوڵمانەتی تەنیا كورت هەڵهاتوە و (حصر)بووە لە نێو فلان كۆمەڵ و لایەنە ئیسلامیی یەدا ، نەخێر ئێمە چەندان جار گوتوومانە(هەر كەسێك بیەوێ شەریعەتی خوا حاكم بێ، با لـەنێو كۆمـەڵێكی ئیسـلامییش دا نەبێ ئەوە ئینسانێكی ئیسلامیی یە).

ئێمە دەڵێین: میللەتەكەمان مسوڵمانە مەگەر ئەوەی كوفری ئاشكرا و بێ پێچ و پەنا (بواح)ی لێ بینرا بێت، یان بۆخۆی حاشا لە دیـنی خـوا بكات!ئەگەرنا میللەتەكەمان مسوڵمانەو مسوڵمانەتی لە ئێمەدا قەتیس نەماوەو كورت هەڵاتوو (حصر)نیە، ئێمە كۆمـەڵێكین لـە مسـوڵمانان دەمانەوێ خزمەتی ئیسلامەتیی ومسوڵمانەتی بكەین، دەمانەوێ قەڵغان و پەرژینێك بین بۆ مسوڵمانان، بەرگری لە ئابڕوو و كەرامـەتیان بكـەین، ناڵێین هەر ئێمە مسـوڵمانین! دەڵێین:میللەتەكـەمان سـوپاس بـۆ خـوا مسوڵمانە و داواشی لێ دەكەین لەگەڵمان یەك هەڵوێست و یەك دەنگ و ڕەنگ و یەك دەست بێـت بـۆ ئـەوەی خزمـەتی دیـنی خـوا بكـەین بـە هەموومانەوە .

كەواتە مادام وا بێ دروست نیـە دۆسـتایەتی و دوژمنایـەتی لەسـەر ئەساس و بنچـینەی كۆمـەڵ و لایـەنێكی ئیسـلامیی بكرێـت و نـابێ دۆستایەتی (موالاة) لەگەڵ مسـوڵمانان لـە چوغزی حیزبەكـەمان دا كورت هەڵاتوو (حصر)بێت، هەر خوشك و برایەك، هەر ژن و پیاوێك كە بزانین مسوڵمانەو بە دینی خوا ڕازی یەو ئەهلی ئیمان و ئیسلامە ئـەوە

خوشك و برامانەو حەقی لەسەرمانە، با لە حیــزب و كۆمەڵەكـەشمان دا نەبێت، وە هەر كەسێك دۆستایەتی و دوژمنایەتی لەسەر ئەساسی حیزبی بكات، ئەوە بێگومان ئەو برایەتی یەی كە خوای پەروەردگار زۆر فراوانی كردوە ئەو كەســـە زۆر گچكەی كردۆتــەوە، وەك لــە (صــحیح)ی ئیمـام بوخاری دا هاتوە كە یەكێك لە هاوەڵان هاتە خزمەتی پێغەمبــەر ﷺ و گوتی : (اللهم آرحمني ومحمداً ولاترحم معنا أحداً)

واتە: خوایە رەحم و بەزەییت بە من و(محمد)دا بێتــەوەو بــەزەییت بــە كەسی دیكە دا نەیەتەوە، پێغەمبەریش ﷺ فــەرمووی: (لقــد حجَّـرْتَ واسعاً)

واتە: شتێكی زۆر فراوانت زۆر تەسك كردەوە، رەحمەتی خوا بۆ هــەموو كەسێكە بۆچی هەر من و تۆ بگرێتەوە؟!

بــەڵێ بــراو خوشــكانی مســوڵمان: برایــەتی ئێمــە، دۆســتایەتی و دوژمنایەتی ئێمە لەسەر ئەساس و بنچــینەی ئیمــان و ئیســلامە نــەك لەسەر ئەساس و بنچینەی حیزب و كۆمەڵ.

چــوار- پێویستە لەگەڵ خەڵك و جەماوەری مسوڵمانی خۆمان بــە كــردار و ڕەفتار، بە هەڵس و كــەوت و ڕەوشــتی بــەرزو پەســـند خۆمانیــان پــێ بناسێنین و لە خۆمانیان نزیك بخەینەوە و هەدەفی خۆمانیــان لــێ حــاڵی بكەین.

من زۆر گەڕاوم بە نێو عەشایرو شارو دێهاتی كوردستان دا ئێســتاش خەڵكانێك وادەزانن كە ئێمەی ئیسلامیش وەك حیزبــی عــەلمانین!! بۆیــە دەبێ ئێمە بە عەمەلیی خۆمانیان پێ بناسێنین كــە لــە دینەكەمانــەوە

هەڵقوڵیوین و ئامانج و مەبەست لە بوونمان دینداریی و ڕەزامەندیی خوایە.

من چومەتە نێو خەڵکی عەشایر، دوای ئەوەی کە شتمان بۆ ڕوونکردوونەوە گوتوویانە: وەرن لێمان حاڵی بکەن و تێمان بگەیێنن نەمانزانیوە ئێوە ئاوان! بەڵام مادام بۆمان ڕوون بۆوە کە ئێوە خزمەتی دینی خوا دەکەن ئێمەش بە هەموو شێوەیەك لە خزمەت داین.

پێنج- خاڵێکی دیکە کە بەڕاستی بۆ ئێمەی ئیسلامیی زۆر پێویستە ڕەچاوی بکەین ئەوەیە کە: ئێمە لەسەر خاڵە هاوبەشەکان لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی میللەتە مسوڵمانەکەمان دا ڕەفتار بکەین، بۆ وێنە: ئەهلی طەریقەت کاریان زیاتر ئەوەیە کە کار لە سەر تەزکیەی نەفس و زیکرو فیکرو پەروەردە کردنی لایەنی مەعنەوی و دەروونی دەکەن، جا ئایا هیچ مسوڵمانێك بەبێ تەزکیەی نەفس و بەبێ زیکرو فیکر دەبێتە مسوڵمانێکی تەواو؟ بێگومان نەخێر، چونکە پێغەمبەر ﷺ یەکێك لە چوار ئەرکەکانی ئەوە بوو کە(ويزكيهم) (الجمعة ـ٢). دەی کەواتە با ئێمە حەساسیەتمان بە تەزکیەی نەفس نەبێت لەبەر ئەوەی کە برایەکی صۆفی ئەهلی طەریقەت چ قادری چ نەقشی بە هەڵە دەیکات، یان لەبەر ئەوەی لەگەڵ تەزکیەو زیکرو فیکرەکەی دا تووشی شیرك و بیدعەت و کەم و کوڕی هاتوە، با ئەو شتە باشەی ئەو برا صۆفی یە بکەینە پردێك و بڵێین: ئێمەش بڕوامان بە ئەسڵی تەزکیەی نەفس و زیکرو فیکرو پەروەردەکردنی لایەنی مەعنەویی هەیە، چونکە تەزکیەی نەفس و خۆ ڕازاندنەوە بە خەسڵەتە پەسندەکان (فضائل)و خۆپاك کردنەوە لە خوو و خدە بەدەکان (رذائل)، ئەساسی مسوڵمانەتی یەو ئێمەش ئیمانمان پێیەتی.

پێویستە لەسەر ئەو شتە هاوبەشانە كاربكەین، نەك لە شتە خیلافیەكانەوە دەست پێ بكەین، خوای پەروەردگار بە ئەهلی كیتاب دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ ﴾ (آل عمران ـ٦٤).

واتە: بڵێ: ئەی ئەهلی كیتاب وەرن بۆ شتێك كە هەموومان پێكەوە تێیدا بەشدارین، وەرن باتەنیا خوا بپەرستین و هاوبەشی بۆ دانەنێین، هەندێكمان هەندێكمان نەكەینە پەروەردگار لە جیاتی خوا.. .

ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو ئەهلی كیتابە، واتە بە مسوڵمان و یەهوودی ونەصرانی یەوە، دەبێ خاڵی هاوبەش بكرێتە پەیژە بۆ برایەتی و دۆستایەتی و لێك تێگەیشتن، نەك لە شتە خیلافی یەكانەوە دەست پێ بكەین.

ئێمە لەگەڵ هەر برایەكی مسوڵمان كە هەر ناوێكی لێ بێ چ ئەهلی طەریقەت، چ سەلەفی، وە هەر مسوڵمانێك، سەدان خاڵی هاوبەشمان هەن! هەموومان خوامان خۆش دەوێ، پێغەمبەرمان ﷺ خۆش دەوێ، ئیمانمان پێیانە، ئیسلامان خۆش دەوێ، زۆر كەس لە وانەی كە تۆ بە ئەهلی طەریقەت و بە مسوڵمانی عەوام و سادەی بزانی، ڕەنگە ئەگەر تێبگاو حالی بكرێ ئەوپەڕی فیداكاریی بۆ ئیسلام ئەنجام بدات، لە كاتێك دا كە دوژمنانی ئیسلام دەیانویست سووكایەتی بە یەكێك لە مەڵبەندەكانمان بكەن بۆیان گێڕامەوە كە پیاوێكی ڕیش سپی (٦٠ـ٧٠) ساڵە هاتبوو چەقۆیەكی پێ بوو دەیگوت: خۆ ئەگەر دەستەلاّتی هیچیشم نەبێ دەتوانم

بەم چەقۆیە ورگی دوو سێ دوژمنی دین بدڕم، سوێند بە خوا خۆم لە سەر دینی خوا بە كوشت دەدەم!

بێگومان ئەو مام صۆفی یەش ئەو مام حاجی یەش هەر پێشمەرگەو موجاهیدی ئیسلامە، خاڵی هاوبەشمان لەگەڵ چین و توێژەكانی خەڵك و جەماوەری خۆمان گەلێك زۆرە. بە مەرجێك لە یەك حاڵی بین.

سەبارەت بە ڕێرەوی سەلەفییەت و برایانی(سەلەفی)ش دەڵێین: ئەگەر سەلەفییەت بریتی بێ لە: شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی(خوا لێیان ڕازی بێ)، وە شوێن كەوتووانی هاوەڵان و ئەوانی دوای وان ـ كە لە چەند فەرموودەیەكی (صحیح)دا ئاماژەی پێكراوە ئەو سێ وەچە (جیل)یە ئەو سێ سەدە (قرن)یە باشترین سەدەی مسوڵمانانن لە دینداریی كردنیان داو لە چاك لە دین حاڵی بوونیان[1] ـ ئەگەر سەلەفییەت ئەوە بێت، ئەوە هی هەموومانە و پێویست ناكا كۆمەڵێك لەسەر خۆیانی تاپۆ بكەن! هەروەك چۆن پێویست ناكات ئەهلی طەریقەت و تەصەووف بڵێین: هەر ئێمە تەزكیەی نەفسمان هەیەو هەر ئێمە ئەهلی زیكرو فیكرین، چونكە تەزكیەی نەفس و زیكرو فیكریش هی هەموو مسوڵمانانەو قورئان و سوننەت داكۆكی لەسەر دەكەن.

هەروەها شوێن كەوتنی سەلەفی صالح هی هەموو مسوڵمانانە، خۆ خەڵكی دیكە هەموویان بە دوای هەواو نەفسی خۆیان نەكەوتوون! دەبێ هەموومان بە دوای قورئان و سوننەت بكەوین، فەهم وتێگەیشتنی

---

(١) وەك: (خير القرون القرن الذي بُعِثتُ فيهم ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم) رواه البخاري.

پێغەمبەر ﷺ ـ و هاوەڵانی بەڕێزی و شوێنكەوتووانی ئەوان و شوێنكەوتووانی شوێنكەوتووانیان بكەینە سەنگی مەحەك، جا ئەوەخاڵی هاوبەشی هەموو مسوڵمانانە.

دیارە ئەوانەی لەم ڕۆژگارەی ئێستادا بە خۆیان دەڵێن(سەلەفی) چەند جۆرێكن: هەیانە وەك لایەن وكۆمەڵە ئیسلامیی یەكان دەڵێ: پێویستە ئیسلام سایە و سێبەری بێ و دینی خوا حاكم و فەرمانڕەوابێ، وە ئەوانە هەیانە لە ڕێی خوادا كاری بە كۆمەڵ و جەنگ و جیهادیش دەكەن، كە پێیان دەگوترێ سەلەفیی سیاسی، سەلەفیی جیهادیی.

وە هەیانە بە پێچەوانەوە ئەم قۆناغە بە قۆناغی ئەوە نازانێ و هیچ حاكمێكی ولاَتانی جیهانی ئیسلامیش بە كافر نازانێ هەرچەندە یەكجار طاغووت و ستەمكار و دژ بە ئیسلامیش بێ و، كوفرەكانیشیان بۆ پینەو پەڕۆ و(تأويل) دەكەن! دەشڵێن: ئیشی ئێمە هەر ئەوەیە كە خەریك بین پاڵفتە (تصحيح)ی عەقیدە بكەین، ئەو عەقیدەیەش كە ئەوان مەبەستیانە عەقیدەیەكی شەخسی یە كە زیاتر لە شەخسدا ڕەنگ دەداتەوە، ئەو هاوبەش بۆ خوا دانان(شرك)ەش كە ئەو خەریكیەتی و دژایەتی دەكات، زیاتر شیركی خاوەن (گۆڕ)ان (أصحاب القبور)ە، بەلاَم بە لای خاوەن كۆشكان (أصحاب القصور)دا ناچێت!، كە ئەوەیان شیركی زۆر گەورەیە و هێزو وزەی لە مسوڵمانان بڕیوە! بەڵێ ئەم جۆرە سەلەفی یانەشمان هەن! كە ئەمانەیان لە عەجایبیاتی ئاخر زەمانن!!

هەروەها هەیانە زیاتر سەرقاڵی لێكۆڵینەوە(تحقيق)ی فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ ن، بۆ وێنە: زانای پایە بەرز(ناصر الدين الألباني) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، كە خزمەتی زۆری لە بواری فەرمووودەناسی دا كردوە، هەروەها(عبدالله بن عبدالعزيز ابن باز) ڕەحمەتی خوای لێ بێ،

لە ڕێیەکی دیکەوە خزمەتی کردوە، هەروەها چەندین زانای دیکـە، کـە فەرمایشت و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەپارێزن و ڕاست(صحیح)و بێ هێز(ضعیف)ی لێك جیا دەکەنەوە.

هەندێکی دیکەشیان هەن لە سەلەفی یەکان کە بـە داخـەوە کۆمـەڵ بوونی مسوڵمانان بە خراپ و بە بیدعەت دەزانن، هەندێکی دیکەشـیان بە پێویستیان زانیوە کە مسوڵمانان کۆمـەڵیان هـەبێ و جەماعـەت و کۆمەڵ بن،وەکۆمەڵە ئیسلامیی یەکان دەبێ هەبن وهاوکاری یان بکرێت و هاوکاری یان لە نێوان دا هەبێت، بەڵام پێویستە پابەند بن بە شەرعەوە و لە سنووری قورئان وسوننەت دەرنەچن، کە بێگومان سەرجەم ئیسلامیی و کۆمەڵە ئیسلامیی یەکانیش هەروا دەڵێن.

جا وشـــەی (سەلەفـــی) ئەگـەر مەبەسـت شـوێن پـێ هـەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی و پێشینەی صالحی ئەم ئوممەتە بێـت، ئـەوە خاڵی هاوبەشی هەموومانە و بەو مەفهوومە هەمووومان (سەلەفـی)ین، کە بە دوای پێشینە چاکەکان (السلف الصالح) بکەوین وەك ئەوان لە دین تێبگەین و دینداریی بکەین بەشێوەیەکی ڕاست و ساغ و هەمەلایەنـە و گشتگیـر.

بەڵام ئەگەر (سەلەفـی)[1] بوون ئەو شتانەی دیکە بێت کە کۆمەڵ بوونی مسوڵمانان و هەبوونی براگەورە و ئەمیر بۆ مسوڵمانان بە بیدعەت بزانێ، جگە لەوەش حاکم و طاغووتەکانی وڵاتانی جیهانی ئیسلامیی بە

(١) گرفتی هەندێك لە سەلەفی یەکان ئەوەیە کە دەرماگیریی (تعصّب) یەکی خراپیان بۆ وشەو ناوی سەلەف هەیە و پێشیان وایە هەر کەسێك ناوی لە خۆی نا سەلەفیی ئەوە مسوڵمانی تەواو عەیارە، بێخەبەر لەوە کە عیبرەت بە نێوەڕۆکە نەك (ناو) !!

حاكمی مســــــولمانان بزانن و دژیان نەوەستن بەبیانووی ئەوەی كە كاربەدەستی مسولمانانن! ئەم ئایەتەشیان لە بارەوە بخوێننەوە: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُــواْ أَطِيعُــواْ اللّهَ وَأَطِيعُــواْ الرَّسُــولَ وَأُوْلِــي الأَمْــرِ مِنكُــمْ ﴾ (النساء ـ٥٩)،!! ئەوە بەڕاستی حیسابێكی دیكەیە، وە لەگەڵ ئەوەش دا دەبێ هەر مسولمانێك ڕووی لە قیبلەی خوا (كعبة الله) بكاتو بە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بڕوات، با كەم و كووڕیی و هەڵەشی هەبێ هەر بە خوشك و برای خۆمانی بزانین، هەر خۆشــمان بوێ بایی ئەوەندەی كە حەقی تێدایە، ئەگەر هەڵەو كەم و كووڕی و ناتەواویشی هەبێت، ڕقمان لە كەم وكووڕیەكانیەتی، وە هەوڵی ڕاســت كردنەوە و هێنانە ســەر خەتی لەگەڵ بدەین و بمانەوێ چارەسەری نەخۆشی یەكانی بكەین، كە دیارە پێویستە ئەویش لەگەڵ ئێمەو كۆمەڵە ئیسلامیی یەكان دا هەر وابێت! دیارە ئێمەش وەك كۆمەڵە ئیسلامیی یەكان حەقە برایانی سەلەفــی، صۆفــی، زانایانی ئایینی،شێخانی طەریقەت، بنەماڵەو كەسایەتی یەكان، بێن لەو شــتانەدا كە حەقیــن، هــاوكاری و پشــتگیری مان بكــەن! لە كەم وكووڕی یەكانشمان دا با دەستمان بگرن و بەرچاومان ڕۆشن بكەنەوە! ئێمەش وەك ئیسلامیی و كۆمەڵە ئیســــــلامیی یەكان دەبێ دڵســۆزیی (نصیحة)ی هەموو مسولمانێك وەربگرین و نابێ هیچ كات خۆمان پێ لە سەرووی ئامۆژگاری كرانەوە بێت.

شــەش- خاڵی كۆتایی، ئەوەیە كە دەبێ ئێمەی ئیسلامیی هــەوڵ بدەین (خوا پشتیوان بێ) ئەوەی كە بە قسە دەیلێین،لە بنكەو بارەگاكانمان داو لە دامو دەزگاكانی ڕاگەیاندنمان دا ڕایدەگەیەنین و قسەی لە بارەوە دەكەین، وە لە ڕۆژنامەكانمان دا دەینووسین، هەمووی ئــەنجام بــدەین و لــە خۆمــانی دا

بەرجەستە بكەین و لە ژیانی ڕۆژانەمان دا بیدرەوشێنینەوە، ئەگەر نا كە هەر قسەمان لە خەڵك زیاتر بێت بەكەڵك نایە!! وە بێگومان پێویستە ئیسلامیی یەكان ئەندازەی پابەندیی و دینداریی یان لە خەڵكی دیكە باشتر بێ قەناعەتیشم وایە ئەوانەمان كە خۆمان بە ئیسلامیی دەبینین بەڕاستی ئەگەر ڕێك و ڕاست و چاك بین، وەك شەرع دەڵێ ئاوا ڕەفتار بكەین لەگەڵ خەڵك و لە خودی خۆشمان دا، ئەوە گۆڕانكاری یەكی زۆر گەورە لەم میللەتەی ئێمە دا ڕوو دەدات و چراوشكە و فتیلەی عەلمانی یەت بەجێ دێڵێ و لە دەوری چراو گڵۆپی ئیسلام كۆدەبێتەوە!

خوای پەروەردگار بەلوتف و كەرەمی خۆی تەوفیقمان بدات ئەوەی دەیڵێین بیكەین.

(أقول قولي هذا واستغفر الله لي ولكم فاستغفروه)

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله محمـدٍ وآلـه و صـحبه المهتـدين بهداه الـى يوم اللّقاء.

بەڕێزان!

لەم دەرسەمان دا هەوڵ دەدەین ڕوونی بکەینەوە کە دین و دەوڵەت لە ئیسلامدا دووشتی تێکهەڵکێشن و دوو دیوی یەك سـکەن و دوو ڕووی حەقیقەتێکن بە پێچەوانەی ئەوەوە کە پڕوپاگەندە و بانگەشە دەکرێ کە دەبێ دەوڵەت لە دین جیا بێ، یان سیاسەت لە شەریعەت جیابێ، وە بەڕێوە نەچوونی ئیسلام ـ بە مانای ڕاستەقینەی خۆی ـ بە بێ کیان و دەوڵەت شتێکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ هەر کەسێك هەر بڕێك لە ئیسلام شارەزا بێت، چونکە ئێمە پێشتـر باسمان کرد کە شەریعەتی ئیسلام بە گشتی دوویەشە: بەشێکی پەیوەندی بە ئینسانەوە هەیە وەك تاك، بەشێکیشیان پەیوەندی بە کۆمەڵگاوە هەیە. جا ئەو بەشەی شەریعەتی خوای پەروەردگار کە پەیوەندی بە تاکەوە هەیە لە تێڕوانین (سەبارەت بە بوون و ژیان و ئینسان) و ئیمان و عیبادەت (بە چەمکە ڕووحی وتایبەتی یەکەی)وئەخلاق و... هتددا بەرجەستە دەبێ، چونکە ئەوانە هەموویان بەتاك جێبەجێ دەکرێن و ئینسان دەتوانێ بە تەنیا ئیمانیان پێ بێنـێ،وە دەتوانێ لە خودی خۆی دا تێڕوانینێکی ڕاست و دروستی دەربارەی بوون و دەربارەی خوای پەروەردگار و دەربارەی ژیانی دنیاو دوارۆژ، هەبێ، وە بەتەنیا دەتوانێ خواپەرستی(عبادة)یە شەخسییەکانی خۆی ئەنجام بدات، وە لە خودی خۆی داو وەك تاکێك خۆی بڕازێنێتەوە بە ئاکارو ئەخلاقی بەرزو جوان و خۆی دوور بخاتەوە لە خوو و خدەی دزێوو ناڕێك، ئەوانە

هەموویان بەتاك جێ بەجێ دەكرێن، بەڵام بەشی دووەم لە شەریعەت كە بەشی هەرە زۆریەتی و زۆربەی هەرە زۆری یاساكان( أحكام)ی شەریعەت پەیوەستن بە كۆمەڵگاوەو بە تاك جێبەجێ ناكرێن، بەڵكو دەبێ كۆمەڵگایەك هەبێ و كیان وقەوارەیەكی هەبێ ئنجا دەتوانێ بە یاساو حوكمە گشتییەكانی شەریعەتەوە پابەندبێ و جێبەجێیان بكات، كە پەیوەستن بە سەرجەم لایەكانی ژیان و گوزەرانەوە: سیاسیی و ئابووریی و كۆمەڵایەتی و جەنگ و ئاشتیی و پەیوەندی نێوان دەوڵەتان و....هتد.

ئێستاش تاكو ئەوەی كە بە كورتی گوتمان زیاتر ڕوون بێتەوەبا سەرنجی ئەو چەند خاڵە بدەین بەڵام پێش ڕیزكردنی خاڵەكان دەمەوێ ئەوە بخەمەڕوو كە ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەكی زۆر گرنگە بەڵام ئێستا لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا لەزۆر لاوە مشت ومڕی زۆری لەسەر دەكرێ، بەڵام مشت ومڕێكی بەناهەق و دوور لەشێوازی مەنتیقی یانەو زانستییانە.

چونكە ئەوانە كە لەو بارەوە قسەدەكەن بەزۆری كەسانی نەشارەزان لە ئیسلام وێڕای ئەوەی كە كەسانێكن بڕوایان بە ئیسلام نیە وەك بەرنامەی ژیان بەڵكو بڕوایان بە عەلمانیەت هەیە كەبێگومان ئەوەش شتێكی زۆر بێجێیە كە كەسانێكی نەشارەزا لە ئیسلام كە بڕوایان بە ئیسلام نیە، وەك دین و بەرنامەی ژین، قسەی لە بارەوە بكەن! چونكە لە ڕاستییدا تەنها كەسانێك بۆیان هەیە قسە دەربارەی ئیسلام بكەن، جا سیاسەتی ئیسلامی بێت یان جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا، یان دەربارەی ڕاگەیاندن لە ئیسلامدا، یان ئەخلاق لە ئیسلامدا... هتد كە پسپۆڕو شارەزا بن لە ئیسلامدا، وەك چۆن تەنها كەسانێك بۆیان هەیە كە قسە دەربارەی پزیشكی گەریی بكەن كە پسپۆڕبن لەو بوارەدا . وە كەسانێك بۆیان هەیە لە بارەی گەردوون ناسییەوە

قسە بكەن كە بەڕاستیی پسپۆڕ بن لەو بوارەدا، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئەوانەی كە ئێستا قسە دەكەن دەربارەی ئیسلام كەسانێكن شارەزای ئیسلام نین!، ماوەی یەك دوو سەعات قسە لەبارەی ئیسلامەوە دەكەن بەڵام ناتوانن ئایەتێك یان فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ بە بەڵگە بێننەوە، یان سەرچاوەیەكی ئیسلامیی بە نموونە بێننەوە!! ئنجا بە تەئكید كەسێكیش بە نەشارەزایی قسە بكات دەربارەی مەسەلەو بابەتێك هەڵوێستەكەی بە تفەنگ بە تاریكییەوەنان و شێوازەكەیشی بە شێوازێكی نازانستی یانە دادەنرێ.

ئێستاش با سەرنجی ئەم حەوت خاڵەی خوارێ بدەین كە هەر كامێكیان بەڵگەیەكی بەهێزە بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە كە: (ئیسلام بێ كیان و دەوڵەت بەڕێوە ناچێ):

**یەكەم: جیاوازی نێوان قورئانی مەككی و مەدەنیی:**

ئەو پانتایی یەی كە هەر كام لە سوورەتە مەككی و مەدەنییەكانی قورئانی بەڕێز دایانگرتوە بەم شێوەیەیە:

(٨٦) سوورەت كە نزیكەی (٢/٣)ی قورئان پێك دێنن لە قۆناغی مەككی دا هاتوونەتە خوارێ وە (٢٨) سوورەتیش كە دەوری (١/٣)ی قورئان پێك دێنن لە قۆناغی مەدەنیی دا دابەزیون جا هەرچی قورئانی مەككی یە ـ وەك پێشتریش باسمان كردوە ـ بە زۆری لە بازنەی: (جیهانبینی و تێڕوانین دەربارەی خوای بەدیهێنەر و دروستكراوەكانی و ئینسان و ژیان)و (ئیمان و عەقیدە) و (عیبادەت) بە چەمكە تەسكەكەی و (ئەخلاق و تەزكیە) و بەسەر هاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵ كۆمەڵگاكانیان دا دەخولێتەوە، كە بێگومان هەر كام لە دنیا بینی و ئیمان وعیبادەت

وئەخلاق و دەرس و پەند وەرگرتن لە بەسەرهاتی پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة و السلام) وكۆمەڵگاكانیان، زیاتر پەیوەستن بە تاكەوەو ئینسان وەك تاكێك و لە خودی خۆیدا ئەنجامیان دەدات، هەر بۆیەش دەبینین خـــوای كاربەجێ لە قۆناغی مەككـــی و ســـوورەتە مەككی یەكاندا بەم شـــێوە تەعبیرانە ئینسان دەدوێنێ :

١- ﴿ يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ ..﴾ (الأنشقاق ـ٦) .
٢- ﴿ يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ !﴾ (الأنفطار ـ٦) .
٣- ﴿ يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ..﴾ (الأعراف ـ٣١) .
٤- ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِ شَيْئًا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴾ (لقمان ـ٣٣).

هۆی ئەوەش وەك جاری دیكەش خستوومانەتە ڕوو ئەوەیە كە لە قۆناغی مەككی دا كۆمەڵگایەكی ئیسلامیی دروست نەبووە، كە مسوڵمانان بوون و كیانێكی سەربەخۆ و خاكێكی ئازادیان هەبێ و بتوانن یاساكانی شەریعەت لە بوارەكانی سیاسیی و ئابووریی و كۆمەڵایەتیی و جەنگ و ئاشتی و پەیوەندی نێوان خۆیان و كیانەكانی دیكەدا جێ بەجێ بكەن. بۆیە خوای كار بەجێ لەو قۆناغەدا تەنها ئەو جۆرە ئەركانەی پێ سپاردوون كە هەركامێكیان وەك تاك دەتوانێ جێبەجێیان بكات و پەكیان لەسەر كیان و قەوارەی سیاسی نەكەوتوە.

بەڵام پاش ئەوەی لە قۆناغی مەدەنیی دا مسوڵمانان كۆمەڵگاو دەوڵەتیان پەیدا دەبێ و دەبنە خاوەنی ئیدارەو ئیرادەی سەربەخۆی خۆیان و تواناوبڕستی ئەوەیان بۆ دەرەخسێ كە سەرجەم لایەن و بوارەكانی ژیان و

گوزەرانیان بەپێ ی یاساكان(أحكام)ی شەریعەتی دادگەرانەو گشتگیری خوا (عزَّوجلّ) ڕێك بخەن، خوای پەنهانبین هەموو ئەو یاساو تەعلیماتانـەیان بـۆ دەنێرێتە خوار كە پەیوەندییان بە لایەنەكانی: حوكم و سیاسەت و ئابووری و كۆمەڵایەتی و دادوەریی و خێزانیی و جەنگ و ئاشتی و... هتدەوە هەیە.

كەواتە:

ئەگەر ئەو بەشەی ئیسلام كە قۆناغی مەككی دەیگرێتە خۆی بگونجێ بە (تاك) جێ بەجێ بكرێت، ئەوە بێگومـان بەشـەكەی دیكـەی كـە قورئـانی مەدەنیی دەیگرێتە خۆی و بـۆ مسـوڵمانانێك هـاتوە كـە خـاوەنی كیـان و دەسەڵاتی سیاسی خۆیان بوون بە كۆمەڵ(جماعة)بگرە كۆمەڵگا(مجتمع)یەكی خاوەن كیان و قەوارە نەبێ ناگونجێ بەڕێوە ببرێ!

دووەم: پاراسـتنی ژیـان و ئاسـایش و وەچـەو كەرامـەت و مـاڵ و سـامانی خـەڵكی، ئـەركی كۆمـەڵگای ئیسـلامییەو ئـەوەش بـە كیـان و دەسـتەڵات نەبێ، نایەتە دی:

بەڵگەیەكی دیكە لەسەر ئەوە كە ئیسلام بەبێ كیان و دەوڵـەت بـەڕێوە ناچێ، ئەوەیە كە لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا ژیانی خەڵك و وەچە و هێمنی و ئاسایشی وڵات و كەرامەت و ئابڕووی خەڵك و ماڵ و سامانی خەڵك پارێزراو دەبێ، وە شەریعەت پێنج جۆرە سزای داناون بۆ هەر كەسێك كە دەست درێژی بكاتە سەر هەر كام لەم پێنج شتانە، وەك لەدەرسەكانی ڕابردووش دا باسمان كردوە.

جا لێرەدا دەپرسین: ئایا چۆن دەكرێ كەئەو پێنج سزا شـەرعییانەی كـە شەریعەت دایناون بۆ پاراستنی ئەو (پێنج) بەرژەوەندییە گشتی یە كە پێیان دەگوترێ پێنج شتە پێویستەكان (الضروريات الخمس) چۆن دەگونجێ ئەو سزا

شەرعییانە جێبەجێ بكەین لەسەر كەسانێك كە لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا دەست درێژی دەكەنە سەر ئەو پێنج شتە بنەڕەتییانە، ئەگەر مسولّمانان كیان و دەوڵەتیان نەبێ ودەسەلاتی شەرعییان نەبێ!!

ئنجا شایانی باسیشە كە خوای دادگەرو كار بەجێ (سبحانە و تعالی) بۆ جێبەجێكردنی هەر كام لەو پێنج سزا شەرعییانە فەرمانی بە كۆمەڵگای ئیسلامیی كردوە كە جێبەجێیان بكەن، بۆ وێنە خوای پەروەردگار لە بارەی سزای تۆڵە(قصاص)وە فەرموویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ﴾ (البقرة-١٧٨).

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ـ كۆمەڵگای مسولّمان ـ تۆڵەتان لەسەر پێویست كراوە لە كوژراوەكاندا) واتە: لەسەرتان پێویستەكە تۆڵە بستێننەوە لە كەسێك كە كەسێك بەناهەق دەكوژێت، كەواتە: كۆمەڵگای ئیسلامی(مكلّف)ە بەوەی كە سزای تۆڵە جێ بەجێ بكات، هەروەها خوای پەروەردگار لە بارەی سزای داوێن پیسی یەوە فەرموویەتی:

﴿ الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ ﴾ (النور-٢)

واتە: (ئەی مسولّمانینە! ئافرەتی داوێن پیس و پیاوی داوێن پیس هەریەكەیان ـ كە پیاو ژنی نەبێ و ژن مێردی نەكردبوو[١] ـ سەد قەمچیان لێ بدەن، دیارە ئەم سزایەش دیسان دەبێ مسولّمانان پێی هەڵسن، بۆ ئەوەی نەسل و وەچەی مسولّمانان پاك بێ و خێزانەكان هەڵنەوەشێن و وەچەی خەڵك تێكەڵ نەبێ و هەر كەسە دایك و بابی خۆی بناسێ و هەر دایك و باوكەش ڕۆڵەی خۆیان بناسن، نەك وەك وڵاتانی ڕۆژئاوا! ـ من كە لە

(١) بە پێی ڕای زۆربەی زانایان لە بارەی تەفسیری ئایەتەكەوە..

زیندانیی ئەمریکایی یەکان بووم، یەکێك لە پاسەوانەکان زۆر بەشێوەیەکی ئاسایی دەیگوت: من نازانم بابم کێیە؟ دەزانم لە چ ئافرەتێك بووم، بەڵام نازانم بابم کێیە!، دەشیان گوت هی وەك ئێمە زۆر زۆرن ...!؟ ـ بەڵێ لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا دەبێ منداڵ دایك و بابی دیاربن وە دایك و بابیش منداڵی خۆیان بناسنەوە، دەجا ئەوەش بەوە دەکرێ کە داوێن پیسیی نەبێ و هەرکەسێك چاوی لە بێناموسیی بوو سزا بدرێ ودیارە ئەمەش کاتێك دەکرێ کە مسوڵمانان دەسەلاتێکی شەرعییان هەبێت. هەروەها خوای دادگەرو زاڵ دەربارەی سزای کەسانێك کە هەڕەشە دەکەن لە هێمنیی و ئاسایشی کۆمەڵگاو نەفس و ماڵیان دەخەنە مەترسییەوە، فەرموویەتی:

﴿ إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٣٣) إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾

دیارە لێرەش دا دیسان خوای پەروەردگار ڕوو لە ئەهلی ئیمان دەکات وپێیان دەفەرموێ: بێ گومان سزای ئەو کەسانەی کە دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن و خراپە و ئاشووب بلاو دەکەنەوە لە زەوی دا ئەوەیە کە بکوژرێن، یان هەڵبواسرێن، یان دەست و پێیان ڕاست و چەپ ببڕرێ، یان لە ولات دەربکرێن... شایانی باسیشە کە شەرعزانان (الفقهاء) ئەو تاوانەیان کە خوای کاربەجێ بە(جەنگ کردن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی و بلاوکردەنەوەی خراپە) پێناسەی کردوە، ناوناوە، ڕێگریی یان ڕێ بڕین (قطع الطريق، الحرابة). بەلام لە ڕاستیی دا ئەو تاوانە کە چەندان تاوانی گرتوونە خۆی لەوە گەورەترە کە پێناسەی ڕێگریی تەعبیری لێ بکات، چونکە دەگونجێ

لە شارو ئاوەدانییەکانیش دا ڕوو بدات! جا لێرەدا بۆمان هەیە بپرسین: ئایا مسوڵمانان چۆن دەتوانن کەسانێك کە هەڕەشە لەنەفس و ناමووس و لە ئاسایش و ماڵیان دەکەن، سزا بدەن و ئەو سزایەیان بەسەردا بسەپێنن، ئەگەر کیان و دەسەڵاتیان نەبێ..؟!

وە دەربارەی سزای دزیی خوای زاڵ و کار بەجێ فەرموویەتی:

﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (المائدة ـ٣٨) .

لێرەش دا ئاشکرایە کە ڕووی دواندن (خطاب) لە مسوڵمانان و کۆمەڵگای ئیسلامییەو دەفەرموێ: ئەی ئەهلی ئیمان! پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن بۆ ئەوەی سزای کردەوەکەیان ببینن و ئەوەش ترساندن و تەمێ کردنێکە لە خواوە ، وە خوا زاڵ و کاربەجێیە.

بەڵێ سزای دزیی بۆ ئەوەیە کە: خەڵك لەماڵ و سامانی خۆی دڵنیا بێ و دزو جەردەکان ڕەنجی خەڵکی بە بەلاش نەبەن و بەفیڕۆ نەدەن، وە ئەوەی کە خەڵك بە ئارەقەی نێو چەوانی خۆی پەیدای کردوە بە بێ بەرانبەر لێی زەوت نەکەن! جا بێگومان ئەو سزایەش هەرگیز جێبەجێ ناکرێت بە تایبەت بەسەر خەڵکی دەستڕۆیشتوودا ئەگەر کیان و دەسەڵاتێکی شەرعی نەبێت.

هەروەها دەربارەی کەسانێك کە دەیانەوێ بەزمان پیسیان ئابڕووی خەڵك و کەرامەتیان بڕووشێنن چ پیاو بن چ ئافرەت، وە تۆمەتی داوێن پیسییان بۆ هەڵدەبەستن خوای تۆڵەسێن فەرموویەتی:

﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً ﴾ (النور ـ٤)

جا ئایا چۆن مسوڵمانان دەتوانن سزای بابای بوختانچی بە هەشتا قەمچی بدەن، لە كاتێك دا كە تۆمەتی داوێن پیسیی دەخاتە پاڵ ئافرەتێك یان پیاوێكی پاك بێ ئەوەی بەڵگەی بەدەستەوە هەبێ، ئەگەر دەسەڵاتێكی شەرعی نەبێ!!

كەواتە: زۆر ڕوونە كە بۆ پارێزگاری لێ كردنی ژینی خەڵك و ماڵ و سامان و وەچەو ئابڕوو و هێمنی و ئاسایشیان دەبێ كیان و دەسەڵاتێكی شەرعیی هەبێت كە بتوانێ سزا شەرعییەكان بچەسپێنێ بەسەر ئەو كەسانەدا كە ئەو پێنج بەرژەوەندی یە گشتی و گەورەیەی خەڵك دەخەنە مەترسییەوە.

**سێیەم: دروشمەكانی خوا پەرستیی و فەرمان بە چاكە و ڕێگریی لە خراپە بە بێ كیان و دەستەڵات وەك پێویست ئەنجام نادرێن:**

بەڵگەیەكی دیكەش لەسەر ئەوە كە ئیسلام بێ كیان و دەوڵەت بەڕێوە ناچێ ئەوەیە كە دروشمەكانی خوا پەرستیی و فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپە بە بێ دەسەڵاتی شەرعیی وەك پێویست بەڕێوە ناچن چونكە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ ﴾ (الحج-٤١)

واتە: (ئەوانەی كاتێك دەسەڵاتمان پێدان لە زەوی دا كردمانن بە خاوەن كیان و دەسەڵات و دەوڵەت - نوێژ بەرپا دەكەن و زەكات دەدەن و فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێ لە خراپە دەگرن وە سەرەنجامی كارەكانیش بۆ لای خوا دەچێتەوە). بەڵێ نوێژ بەرپا كردن (إقامة الصلاة) ئەركێكی زۆر سەرەكی

گەورەو پێشەوای مسوڵمانانەو لە چەند فەرمایشتێکی ڕاست (صحیح)دا کە بوخاری و موسلیم گێڕاویاننەوە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی کاربەدەستانێك کە هەندێك کەم و کووڕی یان هەیە و جارویار لە شەرع لادەدەن و زوڵم دەکـەن، ئایا دروستە چەکیان لە دژ بەکاربهێنرێ؟

فەرموویەتی: (لا ما أقاموا فيكم الصلاة) رواه المسلم برقم:١٨٥٥

واتە: نەخێر دروست نیە مادام نوێژتان بۆ بکەن! لە ڕیوایەتێك دا یەکێك لە هاوەڵان هەر لەو بارەوە دەپرسێ: (أفلا نُنابِذهُمْ عند ذلـك؟!) رواه مسـلم برقم:١٨٥٥ ، ئایا بەچەك ڕوو بەڕوویان نەبینەوە لە حاڵێکی وادا؟!

واتە: کاربەدەستێك حوکم بە شەریعەت دەکات بەڵام جـار جـار لادەدات، ئایا لەسەر ئەو لادانەی بە شمشێر بەرەنگاری ببینەوە؟!

وەڵامی پێغەمبەرﷺ ئەوەیە کە دەفەرموێ : (نەخێر هەتا نوێژتان بـۆ بکەن[1] ) چونکە کار بەدەست و حوکمڕانان هەتا پێش نوێژی بۆ مسوڵمانان بکەن مانای وایە هەر خۆیـــــان بـە بەنـدەی خـوا دەزانـن و خۆشـیان بـە شوێنکەوتووی شەریعەتی خوا دەزانن!

کەواتە: کەم وکورتییەکانیان لە جیاتی لادان و جەنگ لە دژ بەرپاکردن و بەرەنگاربوونەوە بە شێوازی دیکە ڕاست بکەنەوە.

کەواتە: پێش نوێژی کردن بۆ مسـوڵمانان، یەکێکە لە ئەرکەکانی کەسێك کە خۆی بە سەرکردەی مسوڵمانان دەزانێ، وەك پێغەمبـەر ﷺ و خەلیفـە ڕاشیدەکان وەك هەموو دەسەڵاتدارەکان کە ئیمامەتی و نوێژیان بۆ مسوڵمانان

---

(١) لە یەکێك لە فەرمایشتەکاندا. هاتوە: (الاّ أنْ تروا كفراً بواحاً عندكم من الله عليه بُرْهان) رواه البخاري برقم : ٠٧٠٥٥ ومسلم برقم : ١٨٤٠ واتە: ـ دروست نیە چەکیان لە دژ بەکاربێ ـ مەگەر کوفرێکی ئاشکرای بەڵگەداریان لێ ببینن!

كردووە خوتبەیان داوە، كەواتە نوێژ مادام گەورەی مسوڵمانان بەرپای بكات ئەگەر مسوڵمانان گەورەیەكیان نەبێت چۆن دەتوانن كۆببنـەوە لەسـەر ئـەو دروشمە گەورەیە كە نوێژە؟!

ئینجا زەكات، كە زۆر كەس وەك سـوالّ و سـەدەقە تەماشای دەكـات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (... فأذا عرفوا الله، فـأخبرهم أن الله قـد فـرض عليهم زكاةً تؤخذ من أغنيائهم فَتُرَدُّ على فقرائهم ) رواه مسلم بـرقم:٣١، والبخاري برقم: ١٤٥٨.

كەواتە: زەكات لە دەوڵەمەندان وەردەگیرێ و بەسەر هـەژارو نـەداران دا دابەش دەكرێت. بەڵێ زەكات لە ئەسڵدا لـە لایـەن دەسـتەڵات و دەوڵـەتی ئیسلامییەوە وەردەگـیرێ و دابـەش دەكـرێ، وە یـەكێك لـەو هەشـت جـۆرە كەسانەی كە بەشێكی زەكاتیان بۆ دانراوە وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّمَـا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَـابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِـيمٌ حَكِـيمٌ ﴾ (التوبة ـ ٦٠)، بریتیـیـە لە: (الْعَامِلِينَ عَلَيْهَا)

واتە: (كار بەدەستانێك كە زەكات كۆدەكەنەوە).

كەواتە: دەبێ دەوڵەتێكی ئیسلامی هەبێت زەكات كـۆ بكاتـەوە وە ئـەو كاربەدەستانەی كە تەرخان كراون بۆ كۆ كردنەوەی زەكات و سەرژمێر كردن و پاشان دابەش كردنی، ئەوانەش بەشیان هەیە لە زەكاتدا و مووچەی خۆیان لە خودی ماڵی زەكات وەردەگرن، بەڵێ زەكـات دروشمێكی(ئـابووری) دەوڵـەتی ئیسلامی یە وەك چۆن نوێژ دروشمێكی ڕووحییەتی.

هەروەها ئەركی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەش لە ڕاسـتیدا وەك پێویست ئەنجام نادرێ ئەگەر كیان و دەسەڵاتێكی شـەرعی نـەبێت، چـونكە

فەرمان بە چاكە (الأمر بالمعروف) یانی چی؟، (أمر)بریتیە لە قسەیەك كە دەبێ ئاڕاستە بكرێ لە لایەنێكی باڵادەست و سەروو بۆ لایەنێكی ژێر دەست و خواروو، بەڵێ ئەمر ئەوەیە كە لە فەرمانـدە(آمِـرْ)ێكـەوە دەرچـوو بـێ بـۆ فەرمانپێكراو (مأمور)ێك، وە قەدەغە كردن (نهي)یش بریتیە لە نەهێشتنی كەسێك یا لایەنێك كە شتێك ئەنجام بدات.

كەواتە: بابای ئامیر ناهی دەبێ دەسەڵاتی هەبێ، وە ئەوە كە دەڵێین یەك یەكی مسوڵمانان دەبێ ئەمر بەچاكەو ڕێگریی لە خراپـە بكـەن، ئـەوە لای كەمی فـەرمان بەچـاكەو ڕێگریـی لـە خراپەیـەو پلەیەكـەو جۆرێكـە لـە جۆرەكانی، ئەگەر نا پلەی هەرە بەرزی فەرمان بە چـاكەو نـەهی لەخراپـەو جێبەجێكردنی ئەو ئەركە گرنگ و گەورەیە وەك پێویست، ئەوەیـە كـە بـە دەســەڵاتی شـەرعی دەكرێ و دەبێ مسوڵمانان كیان و قەوارەیەكیان هەبێ كە هەرچی شـتی چـاكە بیچەسـپێنێ لـە وڵات دا لـە گشـت بـوارو لایەنەكانی و عەقیدەیـی و فیكریـی و ئەخلاقیی و ئادابی كۆمەڵایەتی و سیاسیی ئابووری و.. هتددا وە هەرچی شتی خراپیشە لەهـەموو بوارەكانـدا لایبـەرێ.

چـوارەم: بەڵگەیـەكی دیكـەش لـەو بـارەوە ئەوەیـە كـە مسـوڵمانان فەرمانیان پێكـراوە كـە دادگـەریی(العدالـة) لـە نێـو خۆیانـدا بچەسـپێنن و بەر قەراری بكەن:

ئنجـا بێگومـان دادگـەرییش بـەبێ هـەبوونی هێـزو دەسـتەڵات و قەوارەیەكی سیاسی ناچەسپێت، هەر بۆیەش خوای كاربەجێ (عزَّوجـل) لـە ئایەتی ژمارە (٢٥)ی (الحدید)دا پاش ئەوەی باسی ڕەوانەكردنی پێغەمبەرانی

خۆی (علیهم الصلاة والسلام) بە تەرازوو و بەڵگە گەلی ئاشكراوە دەكـات، ڕای دەگەیەنێ كە ئامانج لەڕەوانەكردنیاندا چەسپاندنی دادگەرییە:

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ..﴾.

دوای ئەوە یەكسەر دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ ﴾.

واتە: ئاسنیشمان ناردۆتە خوارێ كە هێزێكـی زۆری تێدایـە، وە سـوودو بەرژەوەندی گەلێكی زۆر بـۆ خـەڵكی، وە تـاوەكو خـوا بزانـێ كـێ خـۆی و پێغەمبەرانی سەردەخات لە حاڵێكدا كە نایانبینێ و پەنهانن.

شتێكی ڕوونیشە كە(بأس شدید) و (منافع للنّاس) لێرەدا ئامـاژەن بـۆ تەكنـەلۆژیای جـەنگی و تەكنـەلۆژیای مـەدەنی، چـونكە ئاسـن بناغـەی تەكنەلۆژیایە بە هەردووك جۆرەكەیەوە، كەواتە: ڕاستە بـۆ چەسـپاندنی داد پێویستیمان بە دەسەڵات و هێز هەیە، هێزو دەسەڵاتی ئیسلامیش لە كیان و دەوڵەت دا بەرجەستە دەبێ.

**پێنجەم: بەڵگەیەكی دیكەش لەسەر ئەوە كە ئیسلام بە بێ كیان و دەوڵـەت بـەڕێوە ناچـێ حـوكم كردنـە بـەو شـێوە كـە خـواو پێغەمبەری ﷺ فەرموویانە:**

(ئیسلام بە مانای فراوانی، ئەگەر نا ئینسان وەك خودی خۆی ئەگەر لـە كونجی بەندیخانەشدا بێت دەتوانێ خوای پەروەردگار لە خـۆی ڕازی بكـات و بەندایەتی بۆ خوا بكات بەلاّم وەك دین و بەرنامەی ژیان و سیستەمێك كـە خوا ناردوویەتی بۆ ئەوەی ژینی خـەڵكی ڕێـك بخـات، دیـارە بـەبێ كیـان و

دەسەلاَت بەڕێوە نابرێ). ئەوەیە كە خوا (تبارك وتعالى) فەرمانی كردوە بە پێغەمبەر ﷺ و بەهەر دەسەلاَتدارێكی دیكەی ئوممەتی محمد ﷺ كە خۆی بە جێنشینی وی دەزانێ كە لە نێوان كەسانێكدا كە كێشەو مشت و مڕیان دەبێ یان ناكۆكی و دووبەرەكییان دەبێ، بەو شێوەیە حوكم بكات كە خواو پێغەمبەری خوا فەرموویانەو بەو شەریعەتە حوكم بكات كە خوا ناردوویەتی:

﴿ إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا﴾ (النساء ـ ١٠٥) .

واتە: ئێمە كتێبمان بۆ تۆ ناردۆتە خوار بە حەق (ئەی محمد) تاكو لە نێوان خەڵكی دا بەو شێوەیە دادوەریی بكەی كە خوا (لە شەریعەتی خۆیدا) پیشانی داوی و بەرگری و داكۆكی لە ناپاكان مەكە، شایانی باسیشە ئەم ئایەتە یەكێكە لەو (٩) ئایەتـــانە كە دەربارەی ڕووداوێك هاتنەخوار، كە كورتەكەی ئەوەیە: كابرایەكی بە ڕواڵەت مســـوڵمان دزیی یەك دەكات و پاشان دزییەكە بەســـەر جوولەكەیەك دا دەهێنێت و كەسوكاری مسوڵمانە مونافیقەكە دەچـــن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ كە قەناعەتی پێ بكەن ئەو جوولەكەیە ئەو دزییەی كردوە نەك ئەو مســـوڵمانە و پێغەمبەریش خەریك دەبێ كە حوكمەكە بەسەر جوولەكەكە دا بدات چونكە ڕواڵەتی حاڵەكەش لە بەرژەوەندی جوولەكەكە دا نابێ، بەلاَم خوای پەروەردگار ئەو ئایەتانە ئایەتی

(١٠٥ تا ١١٣) دەنێرێتە خوارێ، بۆ بەرگری كردن لە جوولەكەیەكی بێ تاوان و ئیدانەكردنی مسوڵمانیكی تاوان بار[1] و دەفەرمویٚ:

ئێمە قورئانمان بەحەق ناردوە بۆ سەر تۆ تاكو لەنێو خەڵكیدا دادوەریی بكەی بەو شێوەیەی كە خوا پیشانت دەدات) كەواتە: دادوەریی كردن لە نێوان خەڵكی دا ئەركی ئیمام و براگەورەی مسوڵمانانە جا دیارە ئەوەش ناكرێت هەتا مسوڵمانان برا گەورەیەكی یان نەبێت و قەوارە و كیانێكیان نەبێت كە شەریعەتی خوایان بە سەردا بچەسپێنێت.




شەشەم: بەڵگەیەكی دیكەش لەو بارەوە ئەوەیە كە خوای تاك و پاك (عزَّ وجلَّ) لەسەر مسوڵمانانی فەرزكردوە كە دەبێ برا گەورە و مشوور خۆریان هەبێ و بە قسەشی بكەن لە سنووری شەرعدا:

---

(١) بڕوانە: (تفسیر الطبري) ج٦ ص٣١٠ تا ٣١٦، كە مسوڵمانە موناڤیقەكە ناوی (طعمة ابن أبيرق) و جوولەكەكەش ناوی (زید بن السمین) بووە.

ـ وەك پێشتریش باسمان كرد ـ خوای بەرز و مەزن فەرمویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ ﴾ (النساء ـ٥٩)

واتە: (ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! فەرمانبـەریی خـوا بكـەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر بكەن و هی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن) كەواتە لەسـەر مسـوڵمانان پێویسـتە كـە سـوڵتەیەكی شـەرعییان هـەبێت و فەرمانبەریی بكەن و بە قسەی بكەن، سوڵتەیەك كەبۆ خۆیان هەڵیان بژاردوە چونكە خوای كاربەجێ لە پێناسەی مسوڵمانان دا فەرمویەتی:

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ ﴾ (الشورى ـ٣٨) .

واتە: وە كاروباریان بە ڕاوێژە، جا مادام هەموو كاروباری مسوڵمانان بە ڕاوێژ بێ دیارە گرنگترین و گەورەترین كاریان كە بریتی‌یە لە دیاری كـردن و هەڵبژاردنی كاربەدەستان، هەردەبێ بەڕاوێژ بێ! ئاشكراشە كە بەدیلی ڕاوێژ (شوری) لە بواری دیاری كردنـی كاربەدەسـت و حوكمڕانـان دا بریتیـە لـە خۆسەپاندن و دیكتاتۆریەت و تاكڕەویی، كە حوكمی میراتی یەكێكە لە جۆرو شێوەكانی.

لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بە مەسەلەیەك بكەم ــ كە پێشتریش لە دەرسێكی دیكە دا باسم كردوە ــ ئەویش ئەوەیە هەندێك كەس كە بەداخەوە لە بەرگی زانایانی ئیسلامیش دان ڕستەی: (وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ) وا تەفسیر دەكەن كـە هـەر كەسـێكی دەسـتەلاتدارو حـوكمڕان بەسـەر مسـوڵمانانەوە بگرێتـەوە مسوڵمان بێ یان نا، وە حوكم بەشەریعەت بكات یان نا!!

واتە: ئەو جۆرە كەسانە دەڵێن: مادام خوا گوێڕایـەڵیی و فەرمانبـەریی كاربەدەستانی لەسەر پێویسـت كـردووین، كەواتـە هـەر كەسـێك حـوكم و دەستەلاتی بەسەر مسوڵمانان دا كەوتە دەست پێویستە فەرمانبەریی بكرێ!

بەڵاّم بێگومان ئەو جۆرە تێگەیشتنە هەڵەو لەگەڵ ڕاستە مانای ئاشكرای ڕستەكەش دا ناگونجێ: چونكە ئایەتەكە دەفەرمویێ:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ ﴾

واتە: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە فەرمانبـەریی خـوا بكـەن، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر بكەن، وە هی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن، كەواتە قەیدی(منكم) ـ لە خۆتانن ـ، ڕێی ئەو مانـا هەڵـەولارە نـادات، چـونكە بێگومـان ئەو كاربەدەست و حوكمڕانانە لە ڕیـزی ئـەهلی ئیسـلام و ئیمـان دەژمێرێن كە یەكەم پابەندی شـەریعەت بـن، دووەم بـە پێـی شـەریعەتیش هاتبنە سەر حوكم.

ئنجا ئەگـەر بـە پێـی ئـەو لۆژیـك (مَنطـق)ەی ئـەوان بـێ نەدەبوایـە (ئیبـراهیم)یش لە (نەمروود) ڕاپەڕێت، چونكە نەمروودیش هەر لە قەومی ئیبڕاهیم (علیه السلام) بوو. هەروەها(موسى)ش (علیه السلام) نەدەبوایـە لە فیرعەون ڕاپەڕێ، چونكە فیـرعەونیش هەرلەو خەڵكە بوو كە مووسا لە نێویان دادەژیـا، هەروەها(عیسـى)ش (علیـه السـلام) نەدەبوایـە لـە دژی جوولەكەكان (بنی إســرائیل) ڕاپەڕێ كە هەر لە خۆیان بـوو! وە هــەروەها محمد ﷺ نەدەبوو لە دژی قـوڕەیش و كافرەكـانی مەككـە ڕاپـەڕێ چـونكە هەموو زلەزلەكانی مـەككە وەك، ئەبووجەهل و وەلیـدی كـوڕی موغـەیرە و عوتبە و شەیبە..هتد هەر لە عەشیرەتی پێغەمبەر ﷺ بوون كە(قوڕەیش)ە !! بەڵێ مەبەست لە پاڵدرانەلا (نِسبة)ی نێو وشـەی (لـە خۆتـان) (مـنكم)، نیسـبەتی ئیمـانیی و عەقیـدەیی و دیـنی یـە نـەك نیسـبەتی نـەژادیی و كۆمەڵگایی و نەتەوەیی، ئەگەر نا هـەر پێغەمبـەرێك كـە هـاتوە لـەكاتی دواندنی خەڵك و كۆمەڵگایەكەی دا فەرموویەتی: ئەی گەلەكـەم! (یـاقوم)

چونكە هەموویان لە قەومی خۆیان هاتوون هەروەها كاربەدەست و زلەزلەكانیش هەر لە قەومی خۆیان بوون وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ ﴾ (الأعراف ـ٨٨) .

ئنجا لە ڕاستی دا ئەگەر ئەو ڕستە قورئانی یە وا تەفسیر بكریّ كە هەر كەسیّك حوكمڕان و دەسەلاّتداربوو بەسەر مسوڵمانان دا لەسەریان فەرزە بە قسەی بكەن!، ئەوە بیّگومان لۆژیك (منطق)یّكی فیرعەونیی و طاغووتییەوە هیچ پەیوەندییەكی بە ئیسلامەوە نیە.

حەوتەم: بەڵگەی حەوتەم و كۆتایی مان لەسەر ئەوە كە ئیسلام بە بیّ كیان و دەوڵەت وەك پیّویست بەڕیّوە نابریّ ئەوەیە كە مسوڵمانان لەسەریان فەرزە پاریّزگاریی لە نەفس و نامووس و ماڵ و ولاّت و كیانیان بكەن و بە بیّ كیان و دەسەلاّتیش ئەوەیان بۆ ناكریّ:

خوای زاڵ و كار بەجیّ لەو بارەیەوە فەرموویەتی:

﴿.. لاتَظْلِمون ولا تُظْلمون﴾ (البقرة ـ ٢٧٩)

واتە: زوڵم مەكەن و با زوڵمیشتان لیّنەكریّ.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ﴾ (البقرة ـ١٩٠) .

واتە: وە لە پیّناوی خوادا جەنگ لە دژی ئەوانە بكەن كە جەنگتان لەگەڵ دەكەن. بەلاّم دەستدریّژیی مەكەن چونكە بیّگومان خوا دەستدریّژكارانی خۆش ناویّن.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ قُتِلَ دون مَظْلمته فهو شهيد) رواه أبو داودواتە: هەر کەسێك لەسەر ئەوە بکوژرێ کەستەم قبووڵ ناکات ئەوە شەهیدە. هەروەها فەرموویەتی: (مَنْ قُتِلَ دون ماله فهو شهيد) رواه البخاري، واتە هەر کەسێك لە سەر ماڵ و سامانی بکوژرێ شەهیدە.

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکە دا باسی هەر کام لە: (خوێن و ماڵ و ناموس و دین) کراوەو ئەو کەسەی کە لەکاتی بەرگریی لێ کردنیان دا دەکوژرێ بە شەهید دانراوە! وەك فەرموویەتی:

(مَنْ قُتِلَ دون مالِهِ فهو شهيدٌ و مَنْ قُتِلَ دون دينه فهو شَهيدٌ، و مَنْ قُتِلَ دون دَمِهِ فهو شَهيدٌ، و مَنْ قُتِلَ دون أهْلِهِ فهو شَهيدٌ ) رواه أحمد و أبو داود والترمذي والنسائي وابن ماجه بأسناد صحيح.

وە خوای پەروەردگار (جلّ وعلا) لەسەر مسوڵمانانی فەرز کردوە کە بەر پەچی دەستدرێژیی دەستدرێژکاران بدەنەوە:

﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ ﴾ (البقرة ـ ١٩٤)

واتە: جا هەر کەسێك دەستدرێژیی کردنە سەر، وەك خۆی دەستدرێژیی بکەنەوە سەر. هەروەها فەرموویەتی:

﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴾ (البقرة ـ١٩٣)

واتە: (وە لەگەڵ دوژمناندا بجەنگن تاکو توانای ئازاردانی مسوڵمانانیان نامێنێ وەمل کەچی تەنها بۆ خوا دەبێ (واتە کەس ناتوانێ تاغایەتی و کوێخایەتی بەسەر خەڵکی دا بکات) جا ئەگەر کافرەکانیش وازیان هێناو چی دی دەست درێژییان نەکرد، ئەوە ئێوەش وازبێنن چونکە دەست درێژیی ناکرێ تەنیا بۆ سەر زاڵمان نەبێ) دیارە ئەویش بەس بۆ ئەوەیە کە

زوڵمەكەیان نەمێنێ. ئنجا ئاشكراشە ئەگەر بێت و مسـوڵمانان دەوڵـەت و قەوارەیەكیان نەبێ بەرگرییان بۆ ناكرێ لە خۆیان و ماڵ وڵات و نـاموس و بەرژەوەندییەكانیان، كەواتە: پێویستە مسوڵمانان كیان و قەوارەیان هەبێ بۆ ئەوەی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا جێ بەجێ بكەن، هەر بۆیەش جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا بەپلەی یەكەم ئەركی كیان و قەوارەی ئیسلامی یەو هەر بۆیەش خوای كاربەجێ جەنگ و جیهادی فەرز نەكرد لەسەر پێغەمبەری خواو هاوەڵانی بەڕێزی مەگەر دوای ئەوەی كە بوونە خاوەنی كیان و دەوڵەتی خۆیان.

بەڵێ كاتێك مسوڵمانانی یەكەم بە سەرۆكایەتی پێغەمبەری خـوا ﷺ كۆچیان كرد بۆ مەدینە و دەوڵـەتی ئیسـلامییان دامەزرانـد ئـەوجا خـوای كاربەجێ مۆڵەتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەی دان و فەرمووی:

﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا ﴾ (الحج ـ٣٩) ، چونكە لـە ئەسـڵدا جەنگ و جیهاد كردن ئەرك و وەزیفەی كیان و دەوڵەتی ئیسلامییە، بەڵام لە كاتیكدا مسوڵمانان كیان و سوڵتەی شەرعیی و دەوڵەتیان نامێنێ، جەنگ و جیهادیان لەسەر هەڵناگیـرێ، بەڵكو هەر لە جێی خۆیەتی و ئەگەر دەوڵەت هەبێ دەبێ دەوڵەت ئەو ئەركە شەرعییە جێبەجێ بكات و بەرگریی بكـات لە وڵاتی مسوڵمانان لە نەفس وناموس و ماڵ و سـامانیان، بـەڵام ئەگـەر كیان و دەوڵەتیشیان نەما، مانـای وانیـە كـە دەسـتە و ئـەژنۆ دابنیشـن!! بەڵگەش بۆ ئەوە ئەو ئایەتانەن كە بە گشتی فەرمان بەمسوڵمانان دەكەن كە جەنگ و جیهاد بكەن، وە فەرمایشتەكانی پێغەمبەرن كە باسی ئەو كۆمەڵ (طائفة)ە دەكەن كە بەردەوام دەبن و لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ دەمێننەوە هەتاكو ڕۆژی دوایی. كەواتە: كەسانێك هەردەمێنن كە جەنگ وجیهاد بكەن

لە ڕێ ی خوادا وە سەرو ماڵی خۆیان بەخت بکەن، بۆ نموونە: یەکێك لە فەرمایشتەکان ئەوەیە کە دەفەرموێ:

(لَنْ يَبْرَحَ هذا الدِّين قائِماً يُقاتِلُ عليه عِصابةٌ من المسلمين حتى تقوم الساعة) رواه مسلم عن جابر بن سُمرة، برقم:١٩٢٢.

واتە: ئەم دینە هەر بەڕاوەستاویی دەمێنێتەوە هەتا ڕۆژی دوایی کۆمەڵێك لە مسوڵمانان لە پێناوی دا دەجەنگن.

وەیەکی دیکەیان دەفەرموێ:

(لَن يَزالَ قومٌ مِن أُمَّتي ظاهرين على الناس حتى يأتيهم أمْـر الله وهم ظاهرون) رواه مسلم عن مُغيرة بن شعبة برقم:١٩٢١. و رواه البخاري برقم : ٣٦٤ .

واتە: کۆمەڵێك لە ئوممەتم بەردەوام بە دەستەڵاتەوە بەسەر خەڵکەوە دەمێننەوە تاکو فەرمانی خوایان دێتە سەر(مەبەست کۆتایی هاتنی ژیانی دنیایە) وە لەو حاڵەدا ئەوان باڵادەستن.

یەکی دیکەشیان دەفەرموێ:

(لا تزالُ طائفة من أُمَّتي يقاتلون على الحق ظاهرين الى يوم القيامة) رواه مسلم عن جابر بن عبدالله برقم: ١٩٢٣.

واتە: هەتا ڕۆژی قیامەتێ بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتم لەسەر هەق دەجەنگن وە بە باڵادەستی دەمێننەوە. وەیەکی دیکەیان دەفەرموێ:

(لا تزال طائفة من أُمَّتي قائمة بأمر الله لايضرّهم مَنْ خالفهم ولا من خذلهم حتى يأتي أمر الله وهم ظاهرون على الناس) رواه مسلم عن معاوية برقم: ١٠٣٧ . و رواه البخاري برقم : ٣٦٤٠.

واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتم دینی خوا بەڕێوەدەبەن نە ئەوانەی کە پشتیان بەردەدەن وە نە ئەوانەش کە دژایەتی یان دەکەن زیانیان لێ نادەن.

هەتا فەرمانی خوا ـ بە تێكچوونی دنیا ـ دێ و ئەوان لەوكاتە دا باڵادەستن بەسەر خەڵكەوە.

كەواتە: ئیسلام وەك بەرنامەیەكی هەمەلایەنە و سەرتاسەری ژیان و گوزەرانی تاك و كۆمەڵ بەبێ كیان و دەوڵەت بەڕێوە ناچێ. هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو كاتە كە لە مەككە بوو هەوڵ و كۆششێكی زۆری كرد بۆ ئەوەی سەرزەمینێك پەیدا بكات كە بگونجێ كیان و دەوڵەتێكی ئیسلامیی لەسەر بنیات بنێ ـ وەك لە دەرسی حەوتەم دا باسی دەكەین ـ.

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ كە ئەوانەی لە كوردستان و عێراق و وڵاتانی دیكەی مسوڵمانیش دا بانگەشەی لەیەك جیاكردنەوەی دین و دەوڵەت دەكەن، مەبەستیان لە(دین) بەس ئیسلامە! جا لە هەمووش سەیرتر ئەوەیە كە عەلمانییەكانی كوردستان و عێراق لە هەموو شتێك دا تەقلیدی ئەورووپایی ورۆژئاوایی یەكان دەكەن كەچی لە مەسەلەی بوار پێدانی دین دا بۆ كارتێكردنی حوكم وسیاسەت ولایەنەكانی دیكەی ژیان وگوزەران، لاسایان ناكەنەوە ئەگەر نا ئێستا لەم ڕۆژگارەدا لە ڕۆژئاوا ـ ئەورووپا و ئەمریكا ـ دا چەندان حیزب و ڕێكخراوی سیاسی هەن كە لەسەر بناغەی جوولەکایەتی (الیهودیة)و دیانەتی (النصـــــــرانیة) بنیات نراون! هەروەها لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتیش دا بەهەمان شێوەیە و دینەكانی وەك: بووذایی وكۆنفشیوسی و هیندۆسی لەیابان و چین و هیندستان كاریگەریی زۆریان لەسەر حوكم و سیاسەت ولایەنە سیاسییەكان هەیە وبۆیان دەبنە هەوێن وسەرچاوەی ئیلهام و سیكۆلاریستەكانیشیان وەك ئەوانەی لە مەڕ خۆمان نەمان بیستوە هاواریان لێ بەرز بووبێتەوە و گوتبێتیان: نابێ حیزب لەسەر بناغەی نەسرانیەت و یەهودییەت و بووذایی وهیندۆسی هەبێ! بەڵام سیكۆلاریستە لاساكەرەوەكانی

لە مەڕ ئێمە[1] هەڵوێستیان لە بەرامبەر ئیسلامدا شتێكی دیكەیە! لە حاڵەتێك دا كە هەركام لەو ڕێچكە و دینانەی ئاماژەمان پێدان لە سۆنگەی ئەوەوە كە مرۆڤ لە ئەسڵ دا دایناون وستەم و نەفامیی یەكەی ئاوێتەیان بووە، یان دەستكاریی كردوون و شێواندوونی و گۆڕیونی، هیچیان وانین كە ژیانی ئینسان ڕێكبخەن وەك ئیسلام، چونكە لە نێو شەریعەتە خوایی یەكان دا هەر ئیسلام وەك خۆی ماوەتەوە، واتە هەر ئیسلام دەتوانێ دەوڵەت پێك بێنێ، دەتوانێ كیان دروست بكات، دەتوانێ سیاسەتێكی وای لێ هەڵبهێنجرێ كە ژیانی تاك وكۆمەڵ ڕێك بخات و ئەوانی دیكە هیچیان ئەوەیان لە توانادا نیە، كە چی هەر ئیسلامیش قەدەغە دەكرێ كە تێكەڵاوی حوكم و سیاسەت بێ!!

كۆتایی ئەم بابەتەش بەم سێ سەرنجە دێنم:

١- مەسەلەی جیاكردنەوەی دین لە دەوڵەت لەڕاستیدا مەسەلەیەكی ڕۆژئاواییە و لە ئەسڵدا لەوێ سەری هەڵداوە، ئەویش بەسەرهاتێكی دوورو درێژی هەیە و دەتوانین زۆر بە كورتی و گوشراوی بڵێین: دوای ئەوەی كە دام ودەزگاكانی كڵێسا شەریعەتی عیسای مەسیحیان (علیە السلام) گۆڕی و كردیانە نەصرانیەتێكی ئاوێتە بەشیرك و پڕیان كرد لە شتی پڕو پووچ و ئەفسانەو وایان لێكرد كە بوو بوویە ملۆزم و كابووسێك لەسەر سنگی خەڵكی و وای لێكرابوو بوو بوویە لەمپەرێك و كۆسپێك لە ڕێی بەرەوپێش چوونی ژیانداو، دژی زانست بوو، دژی پێشكەوتن و دژی ئازادیی خەڵك بوو، وە دژی عەقڵ و بیركردنەوەبوو، وە

(١) دیارە لە نێو لائیك و سیكۆلارستەكانیش دا خەڵكی بە ویژدان و دانا كەم و زۆر هەیە و هەموویان یەك بابەت نین.

دژو پێچەوانەی مافەکانی ئینسان بوو، وە دژی خەڵکی چەوساوەو جەماوەر بوو، وە لە بەرژەوەندی دەوڵەمەندو دەسەڵاتداراندا بوو، جا کاتێك خەڵکی ئەورووپا دینی نەسرانیەتیان ئاوا بینی و پیاوانی کڵێساش ئەو سێکوچکە شوومەیان پێکهێنا کە بریتی بوو لە: پاپا و دەرەبەگ و پادشاو هەرسێکیان تەگبیرو کەین و بەینیان پێکەوە کرد دژی بەرژەوەندی و مافەکانی خەڵك و جەماوەر، بەڵێ کاتێك جەماوەری ئەورووپا ئەوەیان بینی لە نەصرانییەت ڕاپەرین و بڕیاریان دا کە ئەو دینە نابێ پەیوەندی بە ژیانەوە بمێنێ و ئا لەوێ دا و لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا مەسەلەی لێك جیاکردنەوەی دین و دەوڵەت سەری هەڵدا، بۆچی؟! چونکە دینەکەیان بە کەڵکی ژین نەدەهات و گۆڕرا بوو و پڕکرابوو لە ئەفسانەو ئەو دینە نەبوو کە خوا ناردبووی.

بەڵام ئێمە سوپاس بۆ خوا لە وڵاتی مسوڵمانان دا دینێکی وامان نیە کە ناچار بین بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵ دا بکەین و وەك خەڵکی ڕۆژئاوا لەبەری ڕابکەین! چونکە دینی ئێمە هەر ئەو دینەیە کە خوا ناردوویەتی و دەستکاریی نەکراوە، وە دینی ئێمە سەرجەم لایەنەکانی ژیان ڕێکدەخات و لەگەڵ زانست و دۆزینەوەی نهێنیەکانی بوونەوەرو، بەرەو پێشبردنی ژیان و گوزەران و لەگەڵ ماف و ئازادییەکانی خەڵکیدایەو لەگەڵ چینی چەوساوەیەو دژی زوڵم و چەوساندنەوەیە و، لەگەڵ دادگەری یە و دژی قڕیی و پڕیی و چینایەتی یەو، بەکورتی: دژی هەموو شتێکی خراپەو لەگەڵ هەموو شتێکی باشدایە، کەواتە ئێمە کە دینەکەمان هیچ کەم و کوڕییەکی نیە بۆچی دەبێ جیای بکەینەوە لە ژینی خۆمان؟!

٢- بێگومان قیاس کردنی جیهانی ئیسلامی لەگەڵ جیهانی ڕۆژئاوادا شتێکی نابەجێ و هەڵەیەو وەك کوردەواری خۆمان دەڵێن: ((هەموو سمێڵ سوورێك هەمزاغا نیە))، عالەمی ئیسلامی و عالەمی ڕۆژئاوا دوو شتی لێك جیان و هەریەکەیان جیهانێکی سەربەخۆیە، چونکە شارستانێتی و کلتووری ڕۆژئاوا و هەموو کیانە سیاسیەکانیشی و لەژێر کاریگەریی فیکری ئیغریقی و یۆنانی و ڕۆمانی دا سەریان هەڵداوە، بەڵام عالەمی ئیسلامی و شارستانێتی کلتوورەکەی لەو کاتەوە کە خۆری پڕشنگداری ئیسلامی تێدا هەڵهات و بانگــی زوڵاڵی ئیسلامی تێدا درا، لەژێر کاریگەریی ئیسلام دابووەو کەم و زۆر جەماوەر و کۆمەڵگایەکانی لەژێر کاریگەری ئیسلام دان و پاشینەی فیکریی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییان هەموو دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، نەك بۆ بیرو کلتووری مادده پەرستیی و بتپەرستیی وەك خەڵکی ڕۆژئاوا. بۆیە ئەگەر بێدینایەتیی (سیکۆلاریزم) بە ناچاری بڕوێ گونجا بێ لێرە ناگونجێ و ناڕوێ و سەوز نا بێت، وەك چۆن کاتی خۆی مارکسیزم و کۆمۆنیزمی لێ سەوز نەبوو!!

٣- جیاکردنەوەی ئیسلام لە ژیان جا چ لە بواری حوکم و سیاسەت دا خۆی ببینێتەوە، چ لە هەر لایەنێکی دیکەدا، بریتیە لە یەك پچڕاندنی خودی ئیسلام و لێك ترازاندنی پێکهێنەرەکانی ! بۆچی؟!، چونکە لە ئیسلام دا دین و دەوڵەت دوو دیوی یەك شتن، وە سیاسەت و عیبادەت لەیەك جیا نین، وە مزگەوت و بازاڕ پێکەوە پەیوەستن، وە حوکم و حیکمەت پێکەوە جۆشدراون، وە ڕووح و جەستە دوو شتی تەواوکەری یەکدین، وە دنیاو قیامەت دوو شتی پێکەوە بەستراون، وە عیلم و وەحی دوو شتی لە یەك نەترازاون. کەواتە:. کەسێك کەدەیەوێ ئیسلام لە ژیان دابڕێ، ئەوە ئیسلام

پارچە پارچە دەكات، هەر بۆیەش خوای كاربەجێ لەو بارەوە فەرموویەتی:
﴿ إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ﴾ (الأنعام-١٥٩) . واتە (بێگومان ئەوانە كە دینەكەیانیان بەش بەش كردوەو بوونە تاقم تاقم تۆ هیچ پەیوەندیت پێیانەوە نیە ئەی محمد ﷺ .
ئەدی موحەممەد ﷺ پەیوەندی بە كێوە هەیە و پێغەمبەری كێیە؟! بێ گومان، پەیوەندی بەو كەسانەوە هەیە كە دینی خوایان بە هەموو لایەنەكانییەوە قبووڵە، چونكە هیچ ڕەوانیە كە بڵێی: خوایە من ڕۆژو نوێژەكەت لێ قبووڵ دەكەم بەلاّم حوكم و سیاسەتەكەت بە كەڵك نایەت! یان مزگەوتەكەت باشە بەلاّم بازارەكەت نا!، خوایە با دینەكەت تێكەڵی ئیشی مزگەوت بكات، بەلاّم ئیشی بازار خۆمان ڕێكی دەخەین! یان خوایە بواری عیبادەت بۆ تۆ بەلاّم لایەنی سیاسی تۆ نابێ قسەی لە بارەوە بكەی!
جا ئایا دەگونجێ مسوڵمان شتی وا بڵێ؟!
نەخێر بەڵكو ئەو قسانە تەنها كەسانی كافر دەیكەن، ئەوانەی كە خوا ناناسن و ئیمانیان بە خواو پێغەمبەری خوا نیە، بۆیەش خوای زاناو پەنهانبین لە بارەیانەوە فەرموویەتی:
﴿ إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ﴾ (الأنعام-١٥٩)
بێگومان ئەوانەی كە دینەكەیانیان بەش بەش كردوە (وە بە هەندێكی ڕازی و پابەندن و بە هەندێكی دیكەی ڕازی و پابەند نین) تۆ هیچ پەیوەندیت پێیانەوە نیە!
واتە: ئەوانە شوێنكەوتووی تۆ نین و بە پێغەمبەری خۆیانت نازانن!
هەروەها خوای بێ هاوتا و هاوەڵ (سبحانه وتعالى) ئەو جۆرە هەڵوێستەی بە هی هاوبەش دانەران (مشركین) داناوە، وەك فەرموویەتی:

﴿.... وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ (٣١) مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ (٣٢)﴾ (الروم)

واتە: وە ئێوە (ئەی ئۆممەتی موحەممەد!) لە هاوبەش بۆ خوا دانەران مەبن، ئەوانەی كە دینەكەیانیان پچرپچڕ كردوە و بوونەتە تاقم تاقم و هەر تاقمە بەوە كە لە لایەتی دڵخۆشە (و پێی وایە دینداریی و مسوڵمانەتیی ڕاستەقینە تەنها ئەوەیە كە خۆی ئەنجامی دەدات!).

بەڵێ بەڕێزان!

بەش بەش كردنی دین و پارچە پارچەكردنی بناغە و ماك و میكرۆبی پەرتەوازە بوونی نەصرانییەكان بووە، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَمِنَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّا نَصَارَى أَخَذْنَا مِيثَاقَهُمْ فَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ اللّهُ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ ﴾ (المائدة ـ ١٤).

واتە: وە پەیمانی پتەومان لەوانە وەرگرت كە گوتیان ئێمە نەصرانین بەڵام بەشێك لەوەی كە پێی ڕاسپێرابوون ـ لەدین ـ فەرامۆشیان كرد بۆیە دوژمنایەتی و ڕق و قینەمان لە نێو دا پەیدا كردن هەتا ڕۆژی قیامەت، وە لە دواییش دا خوا هەواڵیان پێ دەدا بەوەی كە بەوەستایی دەیانكرد.

بەڵێ كاتێك بەشێك لە مسوڵمانان تەنیا لایەنی پەروەردە لە دینەكەیان دەگرن، بەشێكی دیكەیان تەنها لایەنی فیكریی و. هەندێكی دیكەیان بەس لایەنی سیاسەت و..هتد ئەوە بێگومان دووچاری دەردی پەرتەوازەیی و هەر كەسە ئیعتیراف بەشتی خۆكردن دەبن و بەمەرەدی خاوەن كتێبەكانی پێش خۆیان بە تایبەت نەصرانییەكان دەچن، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ داوە و فەرموویەتی:

﴿(( لَتَتَبِعُنَّ سَنَنَ الذين مِنْ قبلكم شِبْراً بِشِبْرٍ و ذراعاً بِذراعٍ، حتَّى لودخلوا في جُحْرِ ضَبٍّ لاتَّبعْتُموهم) قلنا يارسول الله اليهود و النَصّارى؟ قال: (فَمَنْ اذاً؟! ))﴾ رواه البخاري ومسلم عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه، البخاري برقم:٧٣٢٠، ومسلم برقم:٢٦٦٩.

واتە: بەتەئكید دەكەونە شوێن ڕچە و شوێنپێ ی ئەوانەی پێش خۆتان بست بە بست و باسك بە باسك[1] ، تەنانەت ئەگەر ئەوان كاتی خۆی خۆیان خزانبێتە كونە بزن مژەیەكیشەوە ئێوەش شوێنیان دەكەون، (أبو سعيد)دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا: جوولەكەو نەصرانییەكانت مەبەستە؟! فەرمووی: ئەدی كێ؟!

پوختەی قسان: داڕنین و لابردنی حوكم و سیاسەت لە ئیسلام، واتە لەیەك پچڕاندن و ترازاندنی خودی ئیسلام و پارچە پارچەكردنی!

دیارە ئەوەش گەورەترین هەڵە و تاوانە و پیشەی هاوبەش بۆ خوا دانەرانەو پێغەمبەری خواش ﷺ هەواڵی پێداوەو فەرموویەتی:

(( لَتُنْقَضُنَّ عُرى الأسلامِ عُرْوَةً عُرْوَةً فكلّما آنتقَضتْ عُروةً تَشَبَّث الناسُ بالّتي تليها وأولهنَّ نقضاً الحُكْمُ وآوخرِهُنَّ الصَّلاة)) رواه أحمد و الطبراني وابن حبّان والحاكم عن أبي أمامة.

واتە: قوڵفە و گرێیەكانی ئیسلام یەك لەدوای یەك هەڵدەوەشێنرێنەوە، جا هەركە قوڵفەیەكیان هەڵوەشایەوە خەڵكی دەست بەوی دوایەوە دەگرن، یەكەمینیشیان كە هەڵدەوەشێتەوە حوكمەو دوا هەمینیشیان نوێژە.

(١) واتە لە كاتێك دا كە لە ئیسلام دووردەكەونەوە و لە جادەی شەریعەت لادەدەن.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرمایشتەی دا پرۆسەی هەڵوەشێنرانەوەی ئیسلامان بۆ باس دەكات كە لە لایەن دوژمن و ناحەزانی خواو پێغەمبەر و دین و شەریعەتی خواوە بەڕێوە دەبرێ و هەواڵیشمان دەداتێ كە یەكەمین سەنگەر كەلە ئیسلام و ئەهلی ئیسلام دەگیرێ بریتی یە لە سەنگەری حوكم و سیاسەت و دواین سەنگەریش نوێژە!

كەواتە: كاتێك كە مسوڵمانان پێشگیریی یان لێ دەكرێ لەوە كە نوێژەكەیان بەو شێوەیە بكەن كە خوا دەیەوێ و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی كردۆتەوە. مانای وایە پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی ئیسلام لە لایەن دوژمن و ناحەزانی یەوە گەیشتۆتە كۆتا قۆناغی!

شایانی باسیشە كە لابران و دوورخرانەوەی حوكم و سیاسەت لە ئیسلام بە یەك جار و یەك قۆناغ ئەنجام نەدراوە. بەڵكو پلە پلە دەستی پێكردوە و یەكەم جار لە سەردەمی حوكمی بنەماڵەیی ئەمەوییەكان داو لەسەر دەستی موعاویەی كوڕی ئەبو سوفییان سەرەتای ئەو لادان (انحراف)ە دەستی پێكرد كە بەزۆر بەیعەتی لە مسوڵمانان وەرگرت بۆ یەزیدی كوڕی كە پاش خۆی بكرێتە (خەلیفە)ی مسوڵمانان!!

واتە: موعاویە یەكەمین دەستەڵات دار بوو كە حوكمی ئیسلامیی لە ڕاوێژەوە گۆڕی بۆ میراتی! هەر بۆیەش هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوە بە توندی ڕەخنەیان لێ گرت، بۆ نموونە: (عبدالرحمن بن أبی بكر) خوا لێیان ڕازی بێ پێی گوت: (( جعلتموها والله هِرقْلِيةً وكِسْروية )) [1]

واتە: سوێند بەخوا حوكمڕانی ئیسلامی تان كردە ڕێ و ڕەسمی فارس و ڕۆم كە سەركردەكانیان هەڵدەبژێرن لەسەر بناغەی میراتی!

---

(١) بڕوانە: (البداية و النهاية) لأبن كثير، ج٨ ص٩٢.

ئنجا پێغەمبەریش ﷺ هەواڵی بەو لادان وگۆڕینە داوە كە لـە ڕێبـازی وی دا دادەهێنرێ، وەك لە فەرمایشتێكی دا فەرموویەتی:

(أوّلُ مَنْ يُغَيِّر سُنَّتِي رجلٌ من بني أمية)[1]

واتە: یەكەمین كەس كە ڕێبازی من دەگۆڕێ پیاوێكە لە تیرەی بەنی ئومەییە.

وە لە فەرمودەیەكی دیكەی دا ئاماژەی كردوە بەسەرجەم قۆناغـەكانی حوكمڕانی ئیسلامی و فەرموویەتی :

(( تكون النبُّوة فيكم ما شاء الله أن تكون ، ثم تكون خلافةً على منهاج النبُّوة ، فتكون ما شاء الله أن تكون ثم يرفعها إذا شاء أنْ يرفعها، ثم تكون مُلْكاً عاضّاً، فيكون ما شاء الله أن يكون ثم يرفعها اذا شاء أن ثـمَّ تكـون مُلْكاً جبرية، فتكون ما شاءالله أن تكون ثم يرفعها اذا شاء أن يرفعهـا ثـم تكون خلافةً على منهاج النبُّوة)) رواه أحمد في مسنده وصحَّحه الألبـاني في (سلسلة الأحاديث) رقم:٥.

واتە: حوكمڕانیی پێغەمبەرایەتی تان لە نێودا دەبێ تا ئەو كاتەی خوا بیەوێ بەردەوام بێ، پاشان حوكمڕانیی جێنشینایەتی بە پێ ی بەرنامەی پێغەمبەرایەتی دەبێ، بەردەوام دەبێ تا ئەو كاتەی خوا بیەوێ پاشان هەر كات ویستی لایدەبات. دوایی حوكمڕانێتی پادشایەتیی بەچنگ و ددان گیـراو دەبێ تا ئەو كاتەی كە خوا بیەوێ بەردەوام بێ، پاشان هەر كات ویستی كۆتایی پێ بێنێ لایدەبات. ئنجا حوكمڕانیی پادشایەتیی بەزەبرو زۆرو

---

(١) بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة) للأباني رحمه الله. رقم:١٧٤٩، وە (ئەلبانی) گوتوویەتی: ( لعـلّ المرا بالحديث تغييـر نظام آختيار الخليفة وجعلـه وراثة وهو الظاهر) واتە: ڕەنگە مەبەست لەم فەرموودە گۆڕینی سیسـتەمی هەڵبژاردنی خەلیفەو گێڕانی بە میراتی بێ، هەر ئەوەش دەردەكەوێ.

سەپاندن دەبێ وە بەردەوام دەبێ هەتا خوا بیەوێ، پاشان هەر كات ویستی لایدەبات، دوایی حوكمڕانیی جێنشینایەتی بە گوێرەی بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەرایەتی دێتەوە كایە!

دیارە هیچ گومانیشی تێدا نیە كە حوكمڕانیی لەجۆری جێنشینایەتیی بەگوێرەی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بە شەهید بوونی (علي بن أبي طالب)خوا لێی ڕازی بێ خەلیفەی چوارەمی سەر ڕاست(راشد)كۆتایی پێ هات و، لەو كاتەوە حوكمڕانێتی مسوڵمانان بوو بە جۆری پادشایەتی بە چنگ و ددان گیراو (ملك عاضّ)و ئەویش درێژەی كێشاوە هەتا ساڵی (١٩٢٤)ی زایینی كە حوكمڕانیەتی ئیسلامی بە ڕەسمی و بە یەكجارەكی[1] لەسەر دەستی كەمال ئەتاتورك هەڵگیراو لابراو ئۆناغی پادشایەتی بەزەبرو زۆرو دیكتاتۆری (ملك جبري) دەستی پێ كردوە كە هەتا ئێستاش لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی مسوڵمان نشین دا هەر بەردەوامە. ئێستاش پێم وایە بەم برە توێژینەوەیەی كە لەم دەرسی شەشەمەدا كردمان وەك مانگی چواردە ڕوون بۆوە كە: ڕاستە ئیسلام بەبێ كیان و دەوڵەت ناگونجێ بەڕێوە ببرێ، وەك بەرنامە و پەیڕەوێكی گشتگیر هەمە لایەنیی ژیان وگوزەرانی تاك و كۆمەڵ.

بەڵام : ئایا ڕێگاو شێوازی شەرعییانەو ڕاست و دروستی بنیاد نان و پێكهێنانی كۆمەڵگاو كیان و دەوڵەتێكی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟!

ئەوە پێویستە لەدەرسی حەوتەمدا ڕوونی بكەینەوەو تیشكی قورئان و سوننەت و عەقڵ و ئەزموونی بخەینە سەر.

ئیدی ئێوەو دەرسی حەوتەم لەم زنجیرە دەرسە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لاإله إلاّ أنت أستغفرك وأتوب اليك.

---

(١) چونكە ▪ ئەو كاتە حوكمڕانیی ئیسلام هەر بەردەوام بوو و مسوڵمانان كیان و دەوڵەتێكی خۆیانیان هەر هەبوو هەر چەندە نەخۆشیی و كەم و كووڕیشی زۆر بوو.




**الحمدالله وكفى وصلاته وسلامه على عبـاده الـذين آصـطفى خصوصـاً سيِّدهم محمد وآله أجمعين من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بأحسان الـى يوم اللقاء.**

**بەڕێزان!**

**بۆ ڕوونكردنەوەی چۆنیەتی سەرهەڵدان و بنیات نانی كۆمەڵگاو كیان و دەوڵەتی ئیسلامیی لە هەر كات و شوێنێكدا سەرەتا بە كورتی دەڵێین:**

**( كۆمەڵگا و كیان و دەوڵەتی ئیسلامی هەڵقوڵاوی ئیرادەو واقیعی ئیماندارانـەی خـەڵكێكی مسـوڵمانی لـە ئیسـلام تێگەیشـتوو وە لـە مسوڵمانەتی دا پێگەیشتووە كە لە خـاكێكی ئـازاد دا نیشـتەجێیە و دەیەوێ ژینی بەپێی دینی حەقی خـوای پـەروەردگار ڕێـك بخـات و بیگوزەرێنێ بۆ ئەوەی بەختەوەری دنیاو سەر فرازی دواڕۆژ بێت ).**

ئێستاش ئەم پێناسەیەی كە كردمان شی دەكەینەوە و دەڵێین: كۆمەڵگاو كیان و دەوڵەتی ئیسلامی دەبێ لە ئیرادەو واقیعی خـەڵكێكی مسـوڵمانەوە هەڵقوڵێ، واتە هەتا خـەڵكێك نـەبێت كـە ئیمـانی هـەبێت و واقیعێكـی مسوڵمانانەو ئیماندارانەشی هەبێت، نـاتوانین كیـان و دەوڵـەتی ئیسـلامی بنیات بنێین، چونكە جاری وا هەیە چەند تـاكێكی مسـوڵمان هـەن، بـەڵام چونكە واقیعێكی ئیماندارانەیان نیە و نەبوون بە كۆمەڵ و كۆمەڵگایـەك، ناتوانن كیان و دەوڵەت پێك بێنن، وەك ئەو مسوڵمانانەی كە پێغەمبەر ﷺ لە مەككە پەروەردەی كردن، كە دیارە مسوڵمانانی زۆر نایاب بـوون، بـەڵام ئەوەیان بۆ مەیسەر نەبوو كە كیان و دەوڵەتێكی ئیسـلامی بنیـات بنـێن، بۆچی؟ چونكە واقیعێكی ئیماندارانەیان نەبوو، واتە هەل و مەرج و واقیعێك نەبوو كە خۆیان بە پێی ئیمانەكەیان ڕەخساندبیان، بەڵكو واقیعەكە لـەوێ واتە لە مەككە واقیعێكی نەفامیی (جاهلي)و كوفریی بوو، نەك واقیعێكی ئیسلامی.

بەڵێ مسوڵمانان تەنیا كاتێك بۆیان دەلوێ و دەتوانن كیـان و دەوڵـەت پێكبهێنن، كە كۆمەڵێك و خەڵكێك هـەبێ وە هـەل و مـەرج و واقیعێكـی ئیمانییشیان هەبێ ولە ئیسلام تێگەیشتبن و لە مسوڵمانەتیی دا پێگەیشتبن و

قۆناغەكانی مسوڵمانەتی و دینداریییان بڕیبێ و خاوەنی خاكێكی ئازادیش بن كە تێیدا نیشتەجێ بن و ئیرادەی ئەوەش بكەن كە بە مسوڵمانانە بژین و ژیانیان بەپێی دینیان ڕێك بخەن و بەڕێوەی بەرن، كە بێ گومان كیان و قەوارەیەكی ئاواش مایەی بەختەوەریی دونیاو سەرفرازیی دوارۆژیشە.

جا دیارە ئێمە لە باسەكانی پێشوودا ڕوونمان كردۆتەوە كە هەمیشە و لە هەموو حاڵاندا مسوڵمانان لەسەریان فەرزە كە دەوڵەت وسوڵتەی شەرعیی و قەوارەی سیاسییان هەبێ، بۆ ئەوەی بتوانن دینی خوا لە ژینی خۆیاندا پیادە بكەن، بە واتایەكی دیكە:

مسوڵمانان لەسەریان فەرزە كە بە مسوڵمانەتی بژین و ناشتوانن وا بن تاكو كیان و قەوارەیەكیان نەبێت، جا ئایا مسوڵمانان چۆن دەتوانن دەوڵەتێكی وا بنیات بنێن؟!

لە وەڵامی ئەم پرسیارە دا دەڵێین: لەڕاستی دا شێوازو چۆنیەتی بنیاتنانی كۆمەڵگاو كیان و دەوڵەتی ئیسلامیی زۆر ڕوونە، ئەگەر سەرنجی سیرە و ژیاننامەی پێغەمبەری خوا بدەین، دیارە پێغەمبەری خواش سەرمەشقی مسوڵمانانە لە هەموو بوارەكان دا وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (الأحزاب-٢١).

بەڵێ: هەر كەس خۆی بە ئیماندار دەزانێ و بەتەمای دیداری خوا و پاداشتی بەهەشتە، ئەوە تەنها محمد ﷺ سەر مەشق و چاو ساغیەتی، بەڵام نەك هەر بۆ نوێژ كردن و ڕۆژوو گرتن! ﴿ بەڵكو بۆ دینداریی و مسوڵمانەتی كردن بە گشتی و فراوانی و بۆ كاریی ئیسلامی و بۆ پێكهێنانی كیان و قەوارەی ئیسلامی، وە بۆ جەنگ و جیهاد و بۆ هەڵس و كەوت لەگەڵ

خەڵكدا، بۆ هەموو لایەنەكانی ژیـــان و گوزەران محمد المصطفى ﷺ تاكـە سەر مەشقی ڕوون و بێ چەند و چوونی مســوڵمانانە، غــەیری ئــەو چــەندو چوونی لەسەر دەكرێ، بۆ نموونە: (أبوبكر) خوا لێی ڕازی بــێ هــەر چــەندە خەلیفەی ڕاشیدە بەڵام دەگونجێ لە شتێكدا هەڵەی كردبێ، هەروەها (عمــر) خوالێی ڕازی بێ دەگونجێ لە شتێكدا هەڵەی كردبــێ، بــەكورتی جگــە لــە پێغەمبەر كەس لە هەڵە پارێزراو(معصوم) نیەو تەنها ئــەو بــەرزو بــەرێزە سەرمەشقی بێ چەندو چوونی ئێمەیە، سەر مەشقێكە كە بەبێ خەمی سەری خۆتی تەسلیم بكەو دڵنیابە كە مایەی بەختەوەریی دنیاو دوارۆژە، پێویســتە ئەوەش بگوترێ كە زۆرێك لە مسوڵمانان ڕستەی: ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ..﴾ تەنها لە مەقامی ڕەوشتی جوان و بەرز دا بەكاردێنن، وای لێ تێدەگەن كە پێغەمبەر ﷺ سەرمەشقی ئێمەیە بۆ خوو ڕەوشتی بەرز و جوان!! بەڵام نەخێر بەڵكو مانای ئایەتەكە فراوان و گشــتگیرە و تایبــەت نیە بە شتێك و دووانەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((صلّوا كمارأيتموني أُصلي)) رواه البخاري

واتە: (نوێژ بكەن وەك چۆنتان بینی من نوێژ دەكەم)

لە كاتێكدا ئەمەی فەرموو كە كۆمەڵە گەنجێك چووبوونە خزمــەتی بــۆ شارەزابوونی ئیسلام و چەند ڕۆژێك لە خزمــەتی دا مانــەوە جــا دوای ئــەوە قورئانی فێركردن و شارەزای كردن لە زۆر شت، هەستی پێكردن كە غەریبــی نێو ماڵ و كەسی خۆیان كردوە، بۆیە دوایین ڕۆژ هەڵسا لەسەر مینبەر نوێژی بۆ كردن تاكو بە كردەوە فێریان بكــات جــا دوای ئــەوەی ســەلامەی دایــەوە فەرمووی:. چۆن بینیتان نوێژم كرد ئاوا نوێژ بكەن، ئنجا وەك چۆن بۆ نوێــژ ئاوای فەرموو بە هەمان شێوە بۆ حەجیش فەرموویــەتی. وەك لــە (صــحیح

مسلم) داهاتوه كه لەحەجی ماڵئاواییدا فەرمویەتی: (لِتَـأْخُذوا مناسككم فأنّي لاأدري لَعليَّ لاأحجُّ بعد حَجَّتي هذه) برقم : ١٢٩٧ عن جابر بن عبدالله.

(مناسك) كۆی (منْسك)ە، بەمانای خوا پەرستی(عبادة)و درووشمی حەج دێ، واته (دوورشمەكانی حەجم لیٚ وەرگرن، چونكە نازانم ڕەنگە جگە لەم ساڵ لە حەج دا پێتان نەگەمەوە) . كه دیارە ئەوە ئاماژەیە بە وەفات و كۆچی دوایی. جا وەك چۆن بۆ نوێژ و بۆ حەج پێویستە پێغەمبەری خوا بكرێتە سەر مەشق و پێشڕەو، بۆ هەر شتێكی دیكەش پێغەمبەر ﷺ سەرمەشقی ئێمەیە، جا یەكێك لەو لایەنانە كە زۆر گرنگە بۆ ئێمەی ئیسلامیی كە دەمانەوێ كیان و قەوارەیەكی سیاسی بۆ میللەتەكەمان بنیات بنێین تاكو بتوانین شەریعەتی خوا لە ژیانی خەڵكە مسوڵمانەكەمان دا پیادە بكەین بۆ ئەوەی بەختەوەری ژیانی دنیا و سەرفرازی ڕۆژی دوایی بین. بریتیە لە كار و چالاكی ئیسلامیی.

ئێستاش بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕوون بێتەوەو بزانین دەبێ چۆن چۆنی كیان و كۆمەڵگای ئیسلامیی لە وڵاتی خۆمان دا بنیات بنێین، با سەرنجی ئەو چەند خاڵە بدەین كە لە ژیان و سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرم گرتوون، تاكو بزانین ئەو پێشەواو سەرمەشقە موتڵەق و ڕوون و بێ چەند و چوونەمان چۆن چۆنی بەو كارە گرنگ و گەورەیە هەڵساوەو كۆمەڵگاو كیانی ئیسلامیی یەكەمی بنیات ناوە:

## یەكەم: وەرگرتنی هیدایەتی خوا عزّوجلّ بە هۆی وەحی یەوە:

یەكەمین هەنگاوی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بنیاتنانی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی بەوەرگرتنی ئەو هیدایەتە دەستی پێكرد كە لە خواوە بۆی هات و بەم ئایەتانە دەستی پێكرد:

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥)﴾ (العلق).

كە لە شەوی(٢١)ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی(٤١)ەمی تەمەنی پێغەمبەردا و یەكەمین ساڵی ڕەوانەكرانی دا بۆی هاتە خوارێ بە هۆی (جبریل)ەوە وەك هەر كام لە (بخاري و مسلم) لە كتێبی (صحیح)ی خۆیان دا هێناویانە.

مانای ئەو پێنج ئایەتەش بە كورتی ئاوایە:

بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەت كە ـ هەموو شتێكی ـ دروست كردوە، ئینسانی لە خوێنپارە دروست كردوە. بخوێنە وە پەروەردگارت بەخشندە ترە. ئەو كەسەی كە بەهۆی قەڵەمەوە غەیری خۆی فێركردوە. ئینسانی فێری ئەوە كردوە كە نەیدەزانی و نایزانێ.

وەك دەبینین خوای كار بەجێ (سبحانه وتعالى) لەم ئایەتە دا گەلێك ڕاستیی گەورەگەورەو گرنگ بۆ (محمد) پێغەمبەری كۆتایی خۆی ڕوون دەكاتەوە، كە گەورەترین و گرنگترینیان ئەوەیە كە:

ئەو پەیوەندییەی لەگەڵت كراوە و دەكرێ لە لایەن خوای پەروەردگارتەوەیە ئەو پەروەردگارەی كە بەدیهێنەر و خاوەن و كارسازی هەموو دروستكراوەكانە و خاوەنی ئەو پەری كەرەم و بەخشش و بە زەییشە و دەیەوێ ئینسان لە ڕێی وەحی و پەیامی خۆیەوە فێری زانیارییەك بكات كە نایزانێ و لە سنووری عەقڵ و پەی پێبردنی وی بەدەرە!

بەڵێ بەڕێزان!

تا ئەوە سەرەتای دەستپێکردنی ئەو وەرچەرخان وگۆڕانکاریی وپاکسازیی و چاکسازیی یە بوو کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا لە ژیانی خۆی و دەوروبەری دا پێ ی هەڵسا، پاش ئەوەی خوای پەروەردگاری کاربەجێ (عزَّوجلَّ) پەیوەستی کرد بەسەرچاوەی نوورو هیدایەتی خۆیەوە. وەك لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ (الشورى-٥٢).

واتە: جا ئاوا بەو شێوەیە ڕووحێکمان لە ئایینی خۆمان بۆ ناردی کە تۆ پێشتر نەتدەزانی نەکتێب چی یە و نەئیمان چی یە! بەڵام ئێمە ئایین و هیدایەتی خۆمانمان گێڕا بە ڕووناکییەك کە هەر کەسێك بمانەوێ لە بەندەکانمان پێی ڕێڕوونیی دەکەین. وە بێگومان تۆ - خەڵکی - ڕێنمایی دەکەی بەرەو ڕاستە شەقام.

جا ڕەنگە هەندێك کەس پێی سەیر بێ کە بگوترێ: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا بەر لەوەی خوای بەخشەر لە پلەی پێغەمبەرایەتی (نبوَّة) بەهرەمەندی بکات نەشارەزا بووە و بەڕێگەی نەزانیوە! بەڵام ئەوە دەقی قورئان فەرموویەتی، وەك خوای بە بەزەیی لە کاتی دواندنی دا پێ ی فەرمووە:

﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَى (٦) وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى (٧) ﴾(الضحى).

واتە: ئایا - ئەی موحەممەد! - تۆ هەتیو نەبووی و (خوا) حاواندیەوە! وە ئایا سەرگەردان نەبووی و ڕێنمایی کردی!

بەڵام پێویستە بزانرێ کە مەبەست لەو سەرگەردانیی (ضلال)یەی کە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ پێش وەحی و پەیامی خوا بۆ هاتنی تێیدا بووە

ئەوەیە كە نەیزانیوە چۆن چۆنی خوا بپەرستێ و كۆمەڵگاو دەوروبەرەكەی لەو سەرگەردانیی و نەفامێتی یە گشتگیرە دەرباز بكات، ئەگەر نا فیطـــرەت و مەعدەنی پاك و چاك و بێگەردی ڕێ ی لێ گرتوە لە سەرجەم ئەو شتانەی كە عەقڵی سەلیم و سروشت و فیطـــرەتی ساغ پێیان ڕازی نین وەك: بتپەرستیی و زوڵم و ستەم و خوو وخدەی بەد و ئاكارو هەڵس وكەوتی دزێو و نا قۆڵاً، هەر بۆیەش بەر لە پێغەمبەراتیش بە خەسڵەت و ئاكاری بەرزو پەسند ناسراوەو نازناوی ڕاستگۆی ئەمیندار (الصادق الأمين)ی پێ بەخشراوە!

كەواتە: یەكەمین هەنگاو و قۆناغی كارو چالاكی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ گۆڕین و پاكسازیی و چاكسازیی كۆمەڵگاو دەورو بەرەكەی و بنیاتنانی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی ئەوە بووە كە سەرەتا خۆی هیدایەتی وەرگرتوەو پەیامی خوای بەبەزەیی پێ گەیشتوە، بۆیە پێویستە كاری ئیسلامیی (العمل الأسلامي) هەمیشە لەو نوختەیەوە دەست پێ بكات، ئەوانەی پێی هەڵدەستن لە پێش دا خۆیان هیدایەتی خوای ڕێ پیشـاندەر (الهادي)یان وەرگرتبـــێ و بووبنە (مُهْتدي) ئەگەر نا بێگومان (فاقد الشيء لايُعطيه) كەسێك بۆ خۆی شتێكی نەبێ ناتوانێ بیبەخشێ!

بۆیە پێویستە وریابین و دڵنیابین كە حەماسەت و دڵگەرمیی بەس نیە بۆ كارو چالاكی ئیسلامیی، بەڵكو پێش حەماسەت و دڵگەرمیی پێویستی مان بە بەرچاو ڕوونیی و شارەزایی و زانیاریی و تێگەیشتن هەیە، وەك خوای زاناو توانا (تبارك وتعالى) فەرموویەتی:

﴿ وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَآفَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴾ (التوبة ـ ١٢٢)

واتە: وە نابێ بڕواداران تێكڕا بڕۆن بۆ جەنگ و جیهاد. بەڵكو دەبێ لـە هەر كۆمەڵێكیان دەستەیەك بڕۆن بۆ ئەوەی لە ئایین دا شارەزابن و پاشان كە

گەڕانەوە لای كۆمەڵەكەیان هۆشیاریان بكەنەوە ـ بەرچاویان ڕۆشن بكەنەوە ـ بەڵكو وریابن (و لە دینداریی و دنیاداریی یان دا دووچاری هەڵەوپەڵە نەبن).

هەروەها هەر لەو بارەوە پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (( مَنْ يرد الله به خيراً يفقهه في الدِّين) رواه البخاري. واتە: هەر كەسێك خوا بیەوێ چاكەی بێنیتە ڕێ لە دین دا شارەزای دەكات.

دیارە لێرە دا مەبەستمان ئەوە نیە كە كارو جم وجۆڵی ئیسلامیی پێویستی بە حەماسەت و دڵگەرمیی نیە! با، حەماسەت و بوێریی و دڵگەرمیش زۆر پێویستە چونكە دەوری پاڵنەر و بزوێنەرو داینەمۆ دەبینێ و گەلێك كەسیش هەیە دەزانێ بەلاَم ناتوانێ، فێرە بەلاَم ترسنۆك و نەوێرە!

بەلاَم مەبەستمان ئەوەیە كە بەبێ بەرچاو ڕوونی وشارەزایی، دڵگەرمیی و بوێریی هیچی لێ هەڵناوەرێ، چونكە با حەماسەت هەر ئینسان بجووڵێنێ مادام شارەزا و بەرچاو ڕوون نەبێ نازانێ چی بكات و چۆن بكات و بگرە ئەوەی كە دەشی كات زۆر جاران زۆریش لەسەری قەرزدار دەبێتەوە.

**دووەم: ئاگاداركردنەوەو هۆشیاركردنەوەی خەڵك:**

قۆناغی دووەمی كاری ئیسلامیی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بنیاتنانی كۆمەڵ و كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی ئەوە بوو كە یەكسەر پاش وەرگرتنی هیدایەت، دەستی كرد بە بانگ كردن وهۆشیاركردنەوەو تێگەیاندنی خەڵك‌و پێگەیاندنیان لەبەر ڕۆشنایی وەحی و پەیامی خوادا.

بەڵێ وەك زۆرێك لە زاناو پسپۆڕانی مێژووی ژیان (سيرة)ی پێغەمبەری خوا گوتوویانە دەتوانین بڵێین:

پێغەمبەرایەتی (نبوّة)ی و ڕەوانەكراو (رسول)یتی (محمد) ﷺ تەنیا ◆◆ (١٠) ڕۆژیان كەوتۆتە بەین، چونكە (محمد) بە: ﴿إقرأ بآسم ربك الذي

خلق ﴾ كراوەتە پێغەمبەر (نبـيّ) و بە: ﴿ ياأيها المـدثر، قـم فأنـذر﴾يـش كراوەتە ڕەوانەكراو (رســول).

بۆ زیاتر و چاكتر ڕوونكردنەوەی مەبەستیش دەڵێین:

لە سەرچاوەكانی ژیاننامە و(سیرة)ی پێغەمبەری خوا ﷺ دا هاتوە كە (محمد) عادەتی وا بووە، پێش هەڵبژاردنی بە پێغەمبەر بـە چـەند سـاڵێك، هەموو ساڵێك .. شـەو و ڕۆژی كۆتـایی مـانگی ڕەمـەزان لـە ئەشـكەوتی (حیـرا)دا دەچووە خەڵوەوە، واتە لە شـەوی (٢١)ەوە تـاكو شـەوی كۆتـایی مانگ كە (٢٩) یان (٣٠)یە، جا بۆجاری یەكەم و یەكەمین جار (جبـریل) علیه السلام لە شەوی (٢١)ی ڕەمــەزان دابـەزی و بـە (محمـد)ی فـەرموو: (إقرأ..) ئەویش پاش وەرگرتنی ئەو پێنج ئایەتەی سەرەتای سوورەتی(العلق) ترسی ڕێ نیشت و یەكسەر گەڕایەوە ماڵ بۆ لای (خدیجة)ی هاوسەری خوالێی ڕازی بێ . وەك بەسەرهاتەكەی لە هەركام لە (صحیح البخاري) و (صـحیح مسلم)دا بە ڕوونی باس كراوە، وێڕای (سیـرة ابن هشام)، پاشـان بـۆ جـاری دووەم پاش تەواوكردنی خەڵوەو ئیعتیكافەكەی لە كۆتایی مانگی ڕەمەزان و لە یەك (١)ی مانگی (شوّال)داو لە كاتێك دا كە لە ئەشكەوتی (حیــراء) دابەزیوە و بەرەو مەككە چۆتەوە، دیسان (جبریل) هاتۆتەوە لای و ئەم جارەیان لەسەر شێوەی ئاسایی خۆی خۆی پیشانداوە كە هەموو ئاسۆ(أفق)ی پڕكردووەو شەش سەد (٦٠٠) باڵی هەبووە. وەك لە (صحیح البخاري)دا هاتوە[1] بۆیە

(١) لە زنجیرە دەرس: ( پوختەی ژیانامەی پێغەمبەری خوا ﷺ) دا وردترو ڕوونتر باسی ئەم مەسەلەیە كراوەو دەقی فەرمایشتەكانیش هێنراون.

زۆر لێی ترساوە چۆتەوە لای خەدیجەو فەرموویەتی: (دثروني دثّروني)و خۆی لە نوێن و پێخەفەوە پێچاوە!

بەڵێ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ پاش دابەزینی ئایەتەکانی سەرەتای (المدثّر) دەستی کرد بە هۆشیار کردنەوەو ئاگادار کردنەوەی خەڵکی، ئایەتەکانیش ئەمانەن:

﴿ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١) قُمْ فَأَنذِرْ (٢) وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤) وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ (٥) وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ (٦) وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ (٧)﴾ .

واتە: ئەی خۆ لەنوێن وەرپێچ! هەڵسەو ـ خەڵکی ـ ئاگادار بکەوەو بترسێنە. وە پەروەردگارت بە گەورەبگرە. وە پۆشاکت پاك ڕاگرە. وە واز لە گوناهو پیسی بێنە. وەکاتێك چاکەیەك دەکەی ـ لەگەڵ خەڵکی ـ بەزۆری مەزانە. وە بۆ پەروەردگارت ئارام بگرە.

شایانی باسیشە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەی سێ(٣) ساڵان بەشێوەی پەنهان کاری ئیسلامیی و بانگەوازی خۆی کرد، هەربۆیەش پسپۆڕانی مێژووی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ ناویان لەو قۆناغە ناوە: بانگەوازی نهێنی(الدّعوة السرِّية).

بەڵام پاش تێپەڕینی ئەو سێ ساڵە خوای کار بەجێ (تبارك وتعالى) فەرمانی پێ کرد کە کارو بانگەوازی ئیسلامیی خۆی ئاشکرا بکات و ئەم ئایەتەی بۆ ناردە خوارێ:

﴿ فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ ﴾ (الحجر-٩٤).

واتە: دەجا ئەوەی فەرمانت پێکراوە ـ ڕایبگەیەنی ـ بە دەنگی بەرز ڕایبگەیەنە و گوێ مەدە هاوبەش پەیداکەرەکان ـ و هەڕەشەو گوڕەشەو فشاریان ـ .

وشەی (فَٱصْدَعْ)یش کە لە (صَدَعَ)ەوە هاتوە بەدەنگی بەرزی شکێنرانی شتێکی ڕەق ـ وەك بەردو شوشە ـ دەگوترێ. ئەوە دەگەیەنێ کە پێویستە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو قۆناغەدا بەدەنگێکی بەرزو بڵندو زوڵاڵ پەیامی خوا ڕابگەیەنێ و خەڵکی بەڕاستییەکانی ئاشنا بکات و تێ بگەیەنێ.

**سێیەم: هۆنینەوەو ڕێکخستن و تێگەیاندن و پێگەیاندنی مسوڵمانانی بەدەنگەوە هاتوو:**

قۆناغ و هەنگاوی سێیەمی کاروخەباتی ئیسلامیی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو کە ئەو مسوڵمانانەی وردە وردە بەدەنگییەوە هاتبوون دەستی کرد بە ڕێکخستن و هۆنینەوەو تێگەیاندن و پێگەیاندنیان، شایانی باسیشە کە لە پیاوان(أبوبکر الصدیق)و لە ئافرەتان (خدیجة بنت خولید)و لە کۆیلان (زید بن الحارثة) و لە منداڵان (علي بن أبي طالب) یەکەمین کەسانێك بوون کە ئیمانیان بە پێغەمبەری خوا هێناو مسوڵمان بوون، خوالێیان ڕازی بێ، وە ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێ پاش مسوڵمان بونی هەرکام لە: (عثمان بن عفّانو زبیر بن عوّام و طلحة بن عبیدالله و سعد بن أبي وقّاص و عبدالرحمن بن عوف)یشی هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئیمانیان هێنا. واتە ئەبووبەکر خوا لێی ڕازی بێ یەکەمین کەس بووە کە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی بۆلای خوا کردوە و خەڵکی بە دەنگەوە هاتوە.

هەروەها ماڵ و خێزانی پێغەمبەریش (صلی الله تعالی علیه وآله وسلم) یەکەمین شانە(خلیة)ی ڕێکخستنی کۆمەڵی ئیسلامیی یەکەم (تنظیم الجماعة الأسلامیة الأولی)و یەکەمین خشت(لَبِنَة)ی کۆمەڵگای ئیسلامیی یەکەم بوو، چونکە خۆی ﷺ و هاوسەری بەڕێزی(خدیجة)و کچەکانی (زینب و

رقية وأم كلثوم وفاطمة)و (زيد بن الحارثة)ی كۆیلەو بە كوڕكراو (مُتَبَنّى)ی و (علي بن أبي طالب)ی ئامۆزای ـ كە لە ماڵی وی دا بوو بەخێوی دەكرد وەك هاوكارییەكی مامی ـ تێكڕا مسولّمان بوون خوا لێیان ڕازی بێ و ڕازیشیان بكات. خوای كاربەجێ لە بارەی ئەو قۆناغ و هەل و مەرجەوە و لە بارەی چۆنیەتی تێگەیاندن و پێگەیاندن و پەروەردەكردنی ئەو كۆمەلە مسولّمانە هەلّبژاردەیەوە بە پێغەمبەری خۆی ﷺ فەرمووە:

﴿ وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ .... ﴾ (الكهف ـ٢٨) .

واتە: وە ـ ئەی موحەممەد ـ ئارام بگرە لەگەلّ ئەوانەدا كە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و تەنیا ڕەزامەندیی وییان مەبەستە وە چاوتیان لێ هەلّمەنگێوە و ڕوویان لێ وەرمەگێڕە (واتە بەردەوام ئاگات لێیان بێ و لێیان بێ ئاگا نەبی و بەجیددی سەرگەرمی پەروەردەكردنیان بە).

بەلێ بێگومان ئەو كەمە مسولّمانانەی كە دواتر دەبنە پێشەنگی كار و كاروانی ئیسلامیی و ئێستاش ڕێگا شكێنن پێویستە پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێكی زۆر بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندنیان تەرخان بكات و زۆر پێیانەوە خەریك بێت و باش بە پەروەردەكردنیانەوە سەرگەرم بێت، تاكو بتوانن هەلّگری ئەو كۆلّ و بارە قورس و گەورە و گرنگە بن كە پێغەمبەری خوا شانی داوەتە بەرو شایستەی ئەوە بن كە هاوكار و دەستبارگر و یاریدەدەری بن!

هەر بۆیەش پێغەمبەری كۆتایی ﷺ سێزدە(١٣) سالّی ڕەبەق لەگەلّ ئەو كۆمەلّە مسولّمانە كەم و پوخت و هەلّبژاردەیەدا خەریك بوو، كەدواتر

بوونە پێشەنگ و سەرقافڵەی سەدان و هەزاران مسوڵمانی دیکە و پاشان تێکڕای ئۆممەتیش.

بەڵێ ئەو سێزدە ساڵە کە نیوەی تەمەنی پێغەمبەرێتی (محمد) زیاتر بوو، زۆر نەبوو بۆ تێگەیاندن و پێگەیاندنی ئەو کۆمەڵە مسوڵمانە پێشەنگ و هەڵبژاردەیە کە فێری ڕاستییەکانی ئیسلامیان بکات و لەسەر بەندایەتی ڕاستەقینە بۆ خوا پەروەردەیان بکات و هەموو ڕەوشت و ئاکارێکی بەرزو پەسەندیان فێر بکات، چونکە بناغە دەبێ لە قەدەر ئەو دیوارو بینایە بێت کە لەسەری هەڵدەچنرێ و، ئەو کۆمەڵە پوخت و ڕەختەش هەم لەڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ هاوکارو دەستبارگری بوون و شان بەشانی وی لە هەموو مەیدانەکان دا ئامادەبوون و، هەم دوای خۆشی درێژەپێدەری کارو کاروانی ئیسلامیی بوون.

جا دیارە ئەو کۆمەڵە مسوڵمانە وێڕای پەروەردەکران بە قورئان و وەحی بەشێوەیەکی هاوسەنگ (متوازن)و هەمەلایەنە، لەبۆتەی تاقیکرانەوە (إبتلاء)ی سەخت و دژواریش دا بەردەوام قاڵ دەبوونەوە و ساغ دەبوونەوە، هەر لە پڕو پاگەندەو بانگەشەی خراپ بۆ کران و قسەو قسەلۆك بەدواخران و جنێوو قسەی ناشیرین پێگوترانەوە بگرە، هەتا جەنگی دەروونیی و ئازارو ئەشکەنجەی جەستەیی و زیندانی کران و برسیی تینوو کران و پەیوەندی کۆمەڵایەتیی و خزمایەتی لەگەڵ پچڕێنران!

بە جۆرێك کە ئێستا لێرەوە سەرنجی ئەو ڕۆژگارە دەدەین دەبینین کە هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی ئازارو ئەشکەنجەی ماددی و مەعنەویی نیە کە لەم ڕۆژگارەدا مسوڵمانان بەدەستی ئەهلی کوفرو نیفاق دەیچێژین. هاوەڵە بەڕێزو

دڵسۆزەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، درشت و ورد و پیاو و ئافرەت و پیر و گـەنجیان پێ ی ئازار نەدرابن!

بۆیە هەركاتێك مسوڵمانان تووشی ئازارو ناڕەحەتیی و گرفتاریی بوون، با تەماشـــای ئەو هاوەڵە بەڕێز و دڵسۆزانە و ئەو پێشینە یەكەمانە بكەن و دڵخۆشیی خۆیان بەوە بدەنەوە بڵێن:

لە پێش ئێمەش دا پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵـە بـەڕێزەكانی ئـازارو ئەشكەنجە دران.

لەسەرچاوەكانی ژیاننامە (سيرة)ی پێغەمبەر ﷺ دا هاتوە[1] كە:

١- هەركام لە (یاسر)و (سُمیَّە)ی هاوســەری لـەژێر ئـازارو ئەشـكەنجە دا شەهید كران!

٢- وە (بلال الحبشي) لە چرقەی گەرمای هاوین دا لەسەر لمی گەرمی بیابان ڕادەخراو گاشە بەردێكی زلیش دەخرایە سەر زگ و سینگی!.

٣- وە ڕۆژێكیان كە كافرەكان پێغەمبەری خوایـان زۆر ئەزیـەت دا بەقسـە پێكوتن و دواییش عەبایەكەیان زۆر لەملی موبارەكی توند كـرد هـەتا پشووی ســـواربوو، (أبوبكرالصدیق) هەڵسا پاڵی بە كافرەكانەوە ناو لە پێغەمبەری دوور خستنەوەو گوتی:

(أتقتلون رجلاً أن یقول ربِّي الله؟!) ئایـا پیاوێـك هـەر لەسـەر ئـەوە دەكوژن كە دەڵـێ: پـەروەردگارم خوایـە؟! ئیـدی دوای ئـەوە كافرەكـان وەرسووڕانەوە بۆ ئەبووبەكـر و زۆریان لێـدا بـەجۆرێك كـە دەم وچـاوی نەدەناسرایەوە، ئنجا خزمەكانی هاتن دەربازیان كردو بە چوار دەسـتەكی

(١) بۆ وێنە بڕوانە (سيرة ابن هشام) بەرگی یەكەم.

هەڵیان گرت و بردیانەوە ماڵ بە لە هۆش خۆچوویی. جا کاتێك هاتەوە هۆش و وەگۆهات یەکەمین قسەی ئەوەبوو: (ماذا فَعَل رسول الله؟!) پێغەمبەری خوا چی کرد؟ ـ واتە چی لێ بەسەرهات؟.

٤- هەروەها هەرکام لە (عمر بن الخطاب)و (عثمان بن عفّان)و غەیری وانیش هەریەکە بە جۆرێك ئازارو ئەشکەنجە دراون، سەرەڕای جەنگی دەروونیی و ئازارو مەینەتیی و خەفەت و پەژارەی زۆرو جۆراو جۆر، بەلاّم هاوەلاّنی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك کێوی پتەوو نەلەخشاو لەسەر ئیمان و ڕێبازی خۆیان بەردەوام بوون و پشتی پێغەمبەریان چۆڵ نەکردو بەرگەی ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجە و دەردەسەرییەیان گرت.

پاشان کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ زانی لەگەڵ خەڵکی کەللە ڕەق و نەسەلمێنی شاری مەککەدا گەیشتۆتە بنبەست و خۆماندووکردنی زیاترو چاوەڕوان کردنی پتری لەگەڵیان بێ سوودە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّى عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ..﴾ (النجم ـ٢٩)

واتە: دەجا ڕوو لەو کەسە وەرگێڕەو پشت گوێ ی بخە کە پشتی کردۆتە کتێبی ئێمە و تەنیا ژیانی دنیای دەوێ ..

بەڵێ دوای ئەوە کەوتە بیرو خولیای دۆزینەوەو پەیداکردنی زەمینەو شوێنێکی گونجاوو لەبار بۆ تێدا خەملاّندن و بنیاتنانی کۆمەڵگای ئیسلامیی و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیی و بۆ ئەو مەبەستەش دەستی کرد بە گەڕان و سووڕان بەسەر تیرەو هۆزەکان دا لە هەوارگەو مەنزڵگاکانی خۆیان دا وێڕای خۆ ڕانواندنی بەردەوامی لەسەر نوێنەرانی ئەو تیرە و هۆزانەی کە لە مەوسمیی حەج دا دەهاتنە مەککە و دەوروبەری. ئنجا پێویستە ئەوەش

بگوترێ كە هەر لە زووەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی بە ژمارەیەك لە هاوەڵانی دا كە كۆچ بكەن بۆ حەبەشە و پێی فەرموون: پادشایەكی لێیە كەس لە پەنای دا ستەمی لێ ناكرێ: (( لو خرجتم الى أرض الحبشة فأن بها مَلِكاً لايظلم عندهُ أحدٌ )) ، پێ دەچێ ئەم تەگبیرەی پێغەمبەر ﷺ جۆرێك بوو بێ لە دووربینی (إحتياط) تاكو ئەگەر مسوڵمانان لە شاری مەككەش قەلاچۆ كران لەوێ ڕیشە و بنەما هێزێكی یەدەكیان بمێنێ!

ئێستاش بۆ ئەوەی دیمەنی گەڕان و سووڕانی پێغەمبەری خوا و هەوڵدانی بۆ دۆزینەوەی جێگاو ڕێگاو پێگەیەكی گونجاو بۆ پەیام و بانگەوازەكەی و بنیاتنانی كۆمەڵگاو كیانی ئیسلامیی مان لەبەرچاو ڕوونتر بێت باگوێ بۆ (جابر بن عبدالله الأنصاري) خوا لێی ڕازی بێ بگرین داخۆ لەو بارەوە چی دەڵێ: (مكث رسول الله ﷺ بمكة عشر سنين، يتَّبِعُ الناسَ في منازلهم بِعُكاظ ومَجَنَّة وفي المواسم بِمِنى، يقول:

(مَنْ يُؤْوِيني، مَنْ يَنْصُرني حتَّى أَبَلِّغَ رسالةَ ربِّي، و لَهُ الجَنَّةَ؟.).

حتى الرجل ليخرج مِنَ اليَمَنِ أومصر فيأتيه قومُهُ فيقولون: إحذر غُلامَ قُرَيْشٍ لايَفْتِنكَ!، ويَمْشي بين رجالهم وهم يُشيرون اليه بالأصابِع، حتى بَعَثنا اللهُ اليه مِنْ يَثْرِبَ فآوَيْناهُ وصَدَّقْناهُ. فَيَخْرُجُ الرجُلِ منّا فَيُؤْمِنْ بهِ ويُقْرِئُهُ القرآن. فَيَنْقَلِبُ الى أهله فَيُسْلِمون بِإسلامِهِ حتَّى لم يَبْقَ دارٌ من الأنصار الاّ و فيها رَهْطٌ من المسلمين يُظهِرون الأسلام) رواه احمد واسناده صحيح على شرط مسلم.

واتە: (پێغەمبەری خوا ﷺ دە ساڵان لە مەككە مایەوە بەدوای خەڵك دەكەوت لە هەوارگەو مەنزڵگاكانیان دا لە (عوكاظ) و (مەجەننە) وە لە كاتەكانی حەج و عومرەدا لە مینا. دەیفەرموو:

(کێ هەیە بمگرێتە خۆی، کێ پشتم دەگرێ تاکو پەیامی پەروەردگارم ڕابگەیەنم و لەبەرانبەر دا بەهەشتی هەبێ؟!)

هەتا کابرای وا هەبوو لە یەمەن یان میسرەوە دەهات بەڵام خزمەکانی دەهاتنە لای و پێیان دەگوت: و ریابە گەنجەکەی قورەیش هەڵت نەخەڵەتێنێ! وە کاتێك ـ پێغەمبەر ﷺ ـ بەنێو پیاوەکانیان دا ڕەت دەبوو بەپەنجەکانیان ئاماژەیان بۆ دەکرد!

تاکو خوا ئێمەی لە(یَثْرِبْ)ەوە بۆ نارد، جا ئێمە پشتمان گرت و بەراستمان زانی و ئیمانمان پێ هێنا، پیاوێك لە ئێمە دەچووە لای ئیمانی پێ دەهێناو ئەویش قورئانی بەسەردا دەخوێند و فێری دەکرد و پاشان کە دەگەڕایەوە لای کەس وکاری بە هۆی مسوڵمان بوونی ویەوە مسوڵمان دەبوون، هەتا وای لێ هات هیچ بنەماڵەیەك لە پشتیوانان (واتە دوو تیرەی خەزرەج و ئەوس چونکە دوایی نازناوی پشتیوانان(الأنصار)یان وەرگرت) نەما کە کۆمەڵێك لە مسوڵمانان ئیسلامەتی تێدا ئاشکرا نەکەن).

شایانی باسیشە کە(جابر) خوا لێی ڕازی بێ بۆیە گوتوویەتی:

پێغەمبەری خوا ﷺ دە (١٠) ساڵان لە مەککە مایەوە بەدوای جێگاو ڕێگایەکی گونجاو و پشتیوانێکی متمانە پێکراودا گەڕاوە، هەرچەندە قۆناغی مەککە سێزدە (١٣) ساڵ بووە، چونکە یەکەمین دیداری پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ژمارەیەك لە خەڵکی (یثرب)دا لە ساڵی یازدە(١١) دا بوو[١] .

(١) ئەو نەفەرانە شەش کەس بوون ئەمەش ناوەکانیانە : (ابو امامة اسعد بن زرارة ، و عوف بن الحارث ، و رافع بن مالك ، قطبة بن عامر، و عقبة بن عامر، وجابر بن عبدالله) وەك لە (البداية والنهاية)ی (ابن كثير)داهاتوە، ج٣ ص١٤٧.

## چوارەم: پەیمان وەرگرتن لە نوێنەرانی هەردوك هۆزی ئەوس و خەزرەج:

قۆناغی چوارەمی كارو چالاكی ئیسلامییانەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەوڵ و تێكۆشانی بۆ بنیاتنانی كۆمەڵگاو كیانی ئیسلامیی بریتی بوو لە بەڵێن و پەیمان وەرگرتنی لە نوێنەرانی هەردووك هۆزی ناوداری (خزرج)و(أوس) كە پێك هێنەری سەرەكی و بنەڕەتی دانیشتوانی شاری(يَثْرِبْ) بوون.

دیارە ئەو پەیمان وەرگرتنەش بەدوو قۆناغ دا تێپەریوە كە لە ساڵانی دوازدەو سێزدە (١٢، ١٣) بوون بەناوی پەیمانی یەكەمی عەقەبە وپەیمانی دووەمی عەقەبە.

ئێستاش با تیشك بخەینە سەر هەر كام لەو دوو بەڵێن و پەیمانە گەورە و گرنگە كە چارەنووسی كارو چالاكی ئیسلامیی پێغەمبەری خوایان پێوە بەسترا:

١- پەیمانی یەكەمی عەقەبە :

(عبادة بن الصامت) خوا لێی ڕازی بێ كە خۆی یەكێك بووە لە بەشداربووانی پەیمانی یەكەمی عەقەبە بەم جۆرە بۆمان باسی ئەو بەڵێن و پەیمانە مێژوویی یە دەكات:

(كنتُ ممن حضر العقبة الأولى وكنّا اثني عشر رجلاً فَبَايْعنا رسولَ الله ﷺ على بيعة النساءِ وذلك قبل أن تُفْتَرضَ علينا الحَرْبُ: على أن لانُشرِك بالله ولاتَسْرِق ولاتَزْني ولانقتل أولادنا ولانأتي بِبُهْتَانٍ نَفْتَريه بَيْن أيدينا وأَرْجُلِنا ولانَعصيه في مَعْروفٍ. وقال: فأنْ وفيتم فلكم الجَنَّة وَإنْ غشيتم

من ذلك شيئاً فأمركم الى الله عزَّوجل إنْ شاءَ عذّبكم وإنْ شــاءَ غَفَرَ لَكُم) رواه مسلم برقم: ١٧٠٩. ورواه أحمد بأسناد حسنٍ، برقم: ٢٢٧٥٤.

واتە: من لەو كەسانە بووم كە ئامادەی ـ پـەیمانی ـ یەكـەمی عەقەبـە بوون، وە ئێمە دوازدە (١٢) پیاو بووین و پەیمانمان دایە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێی پەیمانی ئافرەتانە چونكە بەرلەوە بوو كە جەنگمان لەسەر پێویست بكرێ: پەیمان پێدانەكە بەم شـێوە بوو كە:

١- هاوبەش بۆ خوا دانەنێین

٢- دزیی نەكەین

٣- زینا نەكەین

٤- منداڵەكانمان نە كوژین

٥- بوختانێك نەكەین كە لە نێوان دەست و پێمان دا هەڵی بەستین

٦- لە هیچ شتێكی چاك دا سەر پێچی لـێ نەكەین.

ـ وە پێی فەرمووین: ـ جا ئەگەر پەیمانتان بردە سەرێ ئەوە بەهەشـتتان هەیە، بەڵام ئەگەر گوناحێكتان لەوانەكرد ئەوە كارتان حەواڵەی خوایە ئەگەر ویســـــتی سزاتان دەدات لەسەری، وە ئەگەر ویســـــتی ـ بتانبەخشـــــێ ـ دەتانبەخشێ.

پێویستە ئەوەش بگـوترێ كـە ئـەو دوازدە كەسـەی پـەیمانی یەكـەمی عەقەبەیان بە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دا نـۆ(٩)یـان لـە هـۆزی (خَـزْرَج)و سێ(٣)شیان لە هۆزی (أوْس) بوون، چونكە هۆزی خەزرەج لە هۆزی ئـەوس زیاتر بوون،

ئنجا هۆی ناونرانی پەیمانی یەكەمی عەقەبـەش بـە پـەیمانی ئافرەتـان ئەوەیە كە لەو پەیمانەدا باسی جەنگ و جیهاد نەكراوە و جەنگ و جیهادیش

لەسەر ئافرەتان ـ لەحاڵەتی ئاسایی دا ـ فەرز نیە و وێرای ئـەوەش ئایـەتی ژمارە(١٢)ی سوورەتی (الممتحنة)ش كە دەربارەی پەیمان وەرگرتنی پێغەمبەرە لە ئافرەتان لە هەمان ئەو بڕگانە پێكهاتوە كە پەیمانی یەكەمی عەقەبەیان لێ پێكهاتوە كە ئەمە دەقەكەیەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ .

واتە: ئەی پێغەمبەر هەركات ئافرەتانی بڕوادار هاتنە لات پەیمانت پـێ دەدەن كە هیچ شتێك نەكەنە هاوبەشی خوا، وەدزیی نەكەن، وەزینا نەكەن، وە منداڵەكانیان نەكوژن، وە بوختانێك نەكەن كە لە نێوان دەسـت و پێیـان دا هەڵی بەستن، وە لە هیچ چاكەیەك دا سـەرپێچیت لێ نەكەن، دە جا تـۆش پەیمانیان لێ وەربگرە و داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بكە بێگومـان خـوا لێبوردەی بەبەزەیی یە.

پێشم وایە حیكمەتی ـ یان یەكێك لـە حیكمەتـەكانی ئـەو پەیمانـەی یەكەمی عەقەبە، كە دواتر پەیمانی دووەمیشی بەدوادا هاتوە ئەوە بـووە كـە ببێتە زەمینە خۆشكەر بـۆ پـەیمانی دووەم و بێگومـان كەسـانێكیش جێـی متمانە پێكردن و دڵ پێ خۆشكردنن بۆ كاتی جـەنگ و جیهـاد و ڕۆژگـاری لێقەومان، كە لە شێنەیی و كاتی ئاسایی دا خاوەنی ئیمان و عەقیدەی ساغ و فەرمانبەریی و چاكەكاریی بن و خۆپارێز بن لە گوناح و تاوان و شكاندنی قەدەغەكانی خوا!

**٢- پەیمانی دووەمـــــی عەقەبــە :**

دەربارەی چۆنیەتی پەیمانی دووەمی عەقەبەش كە(عبادة بـن الصــامت) خوا لێی ڕازی بێ بە پەیمانی جەنگ (بيعة الحرب)ی ناویردوە وەك لە (مُسْنَد الأمام أحمد)دا هاتوە بە ژمـارە(٢٢٧٠٠) بــە (سَـنَد)ێكـی (صـحيح)، بـا جارێكی دیكەش گوێ بۆ (جابر بن عبدالله الأنصاري) خـوا لێـی ڕازی بـێ بگرین كە خۆی یەكێك بووە لە بەشدار بووانی ئەو پەیمانەش، دەڵێ:

(.. فَقُلْنا: حتى متى نتـرك رسول الله ﷺ يُطْرَد في جبال مكة ويُخـافُ! فَرَحَلَ اليه مِنّا سبعون رجلاً، حتى قَدِموا عليه في الموسـم فواعـدناه شـعب العقبة فاجتمعنا عليه من رجلٍ ورجلين حتى توافَينا. فقلنا: يارسول الله على مَ نُبايعك؟! قال: تُبايعوني على :

١- السمع و الطاعة في النَّشاط و الكسَلِ

٢- والنفقة في العسر واليسر

٣- وعلى الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر

٤- وأن تقولوا في الله لا تخافون في الله لومة لائم

٥- وعلى أن تَنْصروني فتمنعوني إذا قدمْتُ عليكم مِمّا تمنعـون منـه أنفسكم وأزواجكم وأبناءكم، ولكم الجنَّةُ)رواه أحمد برقم : ١٤٤٥٦، و سنده صحيح.

واتە: ..گوتمان: هەتاكەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بگەڕێین لە چیاوچۆڵی مەككە دەربكرێ و بترسێنرێ! بۆیە حەفتا(٧٠) پیاومان بـەرەو لای ڕۆیشـتن هەتا لە كاتی بەجێ هێنانی حەج دا چووینە لای و شیوی لای(عەقەبە)مان بە بەڵێنگە(موعد)بۆدانا. جا یەك یەك و دوو دوو لەلای خڕ بووینەوە تـاكو

هەموومان ئامادەبووین، ئنجا پێمان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر چی پەیمانت لەگەڵدا ببەستین و بەڵێنت پێ بدەین؟!

فەرمووی: پەیمانم پێ بدەن لەسەر:

١- بیستن و فەرمانبەری كردن لەكاتی پێخۆشبوون و پێناخۆشبوون دا.

٢- وە ماڵ و سامان سەرف كردن(بۆ كارو باری ئیسلام)لەكاتی تەنگدەستیی و ئاسانیی دا .

٣- وە لەسەر فەرمان بە چاكەكردن و ڕێ لەخراپە گرتن.

٤- وە كە لەپێناوی خوادا چی ڕاست و هەقە بیڵێن و لەبەر خوا ترسی لۆمەی لۆمەكارانتان نەبێ.

٥- وە كە پشتم بگرن و بەرگریم لێ بكەن هەر كات هاتمە لاتان، وەك چۆن بەرگری لەخۆتان و هاوسەرانتان و كوڕانتان دەكەن . وە لە بەرامبەریشدا بەهەشتتان دەبێ.

كەواتە: لەم پەیمانەی دووەمی عەقەبەدا هەر كام لە :

گوێ گرتن و بەقسەكردن و، ماڵ و سامان خەرج كردن و، فەرمان بە چاكە و ڕێگریی لە خراپەو، هەقگوتن و گوێ بە ڕەخنەو گلەیی وگازاندە نەدان و، پشتگیریی لێ كردن و سەرخستنی پێغەمبەر ﷺ و بەرگری لێ كردنی لەلایەن پێغەمبەری خواوە بەمەرج گیراون لەسەر هاوەڵاتی بەڕێزی (یثرب)ی كە لەمەودوا ناویان لێ دەنرێ پشتیوانان(الأنصار)چونكە بە پێی ئەم پەیمانە دەبێ پشتگیریی پێغەمبەری خوا ﷺ و پەیام و بەرنامەكەی بكەن!

لە لایەن پێغەمبەری خواشەوە وەك پەیمانی یەكەم بەهەشت(الجنّة) لە بەرانبەر دا هەیە !

ئێستاش بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەچەند مەسەلەیەكی دیكەی پەیوەست بەم پەیمانی دووەمی عەقەبەوە بكەین:

یەكەم: ژمارەی بەشداربووان:

هەرچەندە لە ڕیوایەتەكەی (جابر)دا هاتوە كە ژمارەی بەشداربووان حەفتا (٧٠) كەس بووە، بەڵام (كعب بن مالك الأنصاري) گوتوویەتی: (.. حتى آجتمعنا في الشّعب عند العقبة ونحن ثلاثة وسبعون رجلاً، و معنا آمرأتان من نسائنا: نُسَيبة بنت كعب وأسماء بنت عمرو..)[1]

واتە: هەتا لە شیوەكەی لای عەقەبە خڕبووینەوەو ئێمە حەفتاو سێ(٧٣) پیاو بووین و دوو ئافرەتیشمان لە ژنەكانمان لەگەڵ بوون: نوسەیبەی كچی كەعب و ئەسمائی كچی عەمر.

دیارە ڕیوایەتەكەی(كعب)یش ڕاستترو وردترەو (جابر) هەر بە گشتی قسەی كردوەو نەیویستوە بچێتە نێو وردەكاریەكان (تفاصیل)ەوە .

دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵێن بە پشتیوانان دەدات كە هەرگیز بە جێیان ناهێڵێ:

چونكە كاتێك (أبو الهيثم بن التّيهان) پرسیاری لێكرد كە ئایا كاتێك خوا سەری خستی دەگەڕێیەوە لای گەلەكەت و بەجێمان دێڵی؟! بەزەردەخەنەوە فەرمووی: (بل الدّمُ الدّمُ والهَدْمُ الهَدْمُ أنا منكم وأنتم منّي أُحارب مَنْ حاربتم و أُسالِمُ مَنْ سالَمتُمْ )[1]

(١) بڕوانە: (سيرة ابن هشام) ج٢ ص٦١، وە (السيرة النبوية الصحيحة) للعمري ، ج١ ص٢٠١.

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو و بەرگ و لاپەڕە.

واتە: بەڵكو خوێن یەك خوێنە و مەرگ یەك مەرگە، مـن لـە ئێـوەم و ئێوەش لە منن، هەر كەسێك ئێـوە لەگـەڵی بجـەنگن منـیش لەگـەڵی دەجەنگم و لەگەڵ كێش ئاشتی و صوڵح بكەن منیش دەیكەم.

سێیەم: پێغەمبەر ﷺ فەرمان دەكات كە پشتیوانانی پەیماندەر بەرپرس و مشوور خۆرانی خۆیان دیاری بكەن:

چونكە پاش پەیمان دانیان پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون:

((أخرجوا اليّ منكم اثني عشر نقيباً ليكونوا على قومهم بما فـيهم)، فأخرجوا منهم اثني عشر نقيباً تسعة من الخزرج وثلاثة من الأوس)[٢]

واتە: لەنێو خۆتان دا دوازدە نەقیبم بۆ دیاری بكەن تاكو سەر پەرشتی كاروباری خەڵكەكەیان بكەن، ئەوانیش دوازدە نەقیبیان هەڵبژاردن نۆ لە خەزرەج و سێش لە ئەوس، وشەی (نقيب)یش زاراوەیـەك بـووە بـەمانای بەرپرس و مشوور خۆر.

چوارەم: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پشـتیوانان نادات لە دژی ئەهلی كوفر دەست بۆ چەك بەرن:

وەك لەم وتووێژەی نێوان یەكێك لە پشتیوانان و پێغەمبەری خوا ﷺ دا دەردەكەوێ[٣]:

(.. فقال العباس بن عبادة بن نَضْلة : والذي بعثك بالحق إنْ شئت لَنميلنَّ على أهل مِنى غداً بأسيافنا!

فقال رسول الله ﷺ : لم نُؤْمَرْ بذلك ولكن آرجعوا الى رحالكم).

---

(٢) بڕوانە: (سيرة ابن هشام) ج٢ ص٦١، و( السيرة النبوية الصحيحة ) للضياء العمري، ج١ ص٢٠١.

(٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕەی پێشوو.

واتە: عەبباسی كوڕی عوبادەی كوڕی نەضلە گوتی:

سوێند بەو خوایەی كەتۆی بەهەق ڕەوانە كردوە ئەگەر بتەوێ بەیانی بە شمشێرەكانمان هەڵدەكوتینە سەر خەڵكی(كافری) مینا!

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەوە فەرمانمان پێنەكراوە، بەڵكو بگەڕێنەوە مەنزڵگاكانی خۆتان.

ئێستاش بەڕێزان:

بە پێویستی دەزانم بەر لەوەی كۆتای بە توێژینەوەمان دەربارەی ئەم قۆناغی چوارەمە بێنین كە گرنگترین قۆناغی كارو چالاكی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە بۆ بنیاتنانی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامی، چەند هەڵوەستەیەكی خێرا لەبەردەم هەندێك مەسەلەدا بكەین:

یەك: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەردووك پەیمانەكەی عەقەبە دا بێجگە لە بەهەشت بەڵێنی هیچ شتێكی دیكەی بەنوێنەرانی ئەوس و خەزرەج نەدا، بۆچی؟! چونكە لە ڕاستی دا كارو چالاكی ئیسلامیی بە سەرجەم قۆناغ و شێوازەكانی یەوە عیبادەت و طاعەتێكەو بۆ خوا ئەنجام دەدرێ. دیارە لەبەرانبەر خوا پەرستیی و فەرمانبەرییش دا بێجگە لە پاداشتی خوا لە ڕۆژی دوایی دا ئینسان نابێ هیچ چاوەڕوانییەكی دیكەی هەبێ. وەك خوا (جلّ وعلا) لەسەر زمانی بەندە چاكەكانی كە هاوكاری هەژارو هەتیوو دیلیان كردوە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاء وَلَا شُكُورًا﴾ (الانسان ـ٩).

ئەوە لە لایەك و لە لایەكی دیكەشەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ناكرێ

گفت و بەڵێنی شتێك بە خەڵكی بدات كە نیەتی و نازانێ سەرەنجامی چی و چۆن دەبێ!

دیارە ئەمەش دەرس و پەندێكی گەورەی تێدایە بۆ بەرپرس و مشوورخۆرانی كاری ئیسلامیی!

دوو: لە كاتی باسكردنی (السمع و الطاعة)دا باسی (المنشط و المكره)كراوەو، لە كاتی باسكردنی(إنفاق)یش دا باسی(العُسر واليُسْر)كراوە، تاكو بزانرێ كە:

گوێ بۆ گرتن و بەقسە كردن دەبێ ـ بەگوێرەی توانا ـ لە هەموو حاڵان دابێ كابرا چ پێی خۆش بێ، چ پێی ناخۆش بێ، چونكە بەقسە كردنی برا گەورە تەنها لە حاڵەتی پێخۆشبوون دا بە پێ ی ئارەزووی خۆ كردنە نەك بەقسەی برا گەورە كردن! هەروەها ماڵ بەخشینیش لە ڕێ ی خوادا و بۆ بەرەو پێش بردنی كارو جم وجۆڵی ئیسلامیی پێویستە ـ لە قەدەر حاڵ و ماڵ ـ لە تەنگانە و فەرحانی یان دا بێ، ئەگەرنا حاڵەتی سەغڵەتیی و تەنگانە دەكرێتە بیانووی نەبەخشین لەكاتی ئاسانیی و فەرحانییش دا!

سێ: هەڵوێستەكەی(العبّاس بن عبادة بن نَضْلة)ش خوا لێی ڕازی بێ هەڵوێستی بابای موجاهیدی ئازاو بوێرو هەمیشە گیان لەسەر دەست و دایە ئامادەیە بۆ بەرگریی ئیسلام و مسوڵمانان و، لە هەمان كاتیش دا خۆ كۆنتڕۆڵ كەر بەفەرمان و ئاڕاستەكان (توجیهات)ی سەرووەوە! وە هەڵوێستی پێغەمبەریش ﷺ هەڵوێستی قیادەی ڕەشیدو سەرڕاست و دووربین و ورد بین و واقع بینە!

## پێنجەم: فەرمانكردنی پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی كە كۆچ بكەن بۆ (یَثرب) و پاشان كۆچ كردنی خۆی و ڕاگەیاندنی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی:

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەنجامی پەیمان وەرگرتن دا لە نوێنەرانی شاری(یَثرب) بنكەی جەماوەری ئیماندار (القاعدة الجماهیریة المؤمنة)ی بۆ خۆی و پەیام و بانگەواز و پرۆژە ئیسلامییەكەی دابین و مسۆگەر كرد، ئەو جا كەوتە بیری ئەوە كە سەرەتا هاوەڵانی و پاشان خۆشیی بچنە ئەو شوێنە پیرۆزە كە بە ڕووناكی ئیمان وئیسلام ڕۆشن بۆتەوەو وەك كێڵگەیەكی هەموار كراوو خۆش كراو ئامادەیە بۆ تێدا ناشتنی نەمامی كۆمەڵگاو كیانی ئیسلامیی و تێدا ڕاگەیەندرانی دەوڵەتی ئیسلامیی، بەو جۆرە مۆڵەتی بە هاوەڵانی مەككەیی دا كە بەرەو(یثرب) كۆچ بكەن، وەك(ابن سعد) گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرمووە[1] :

(قد أُخبِرتُ بدار هجرتكم وهي یثرب فمن أراد الخروج فیخرج الیها)

واتە: ئەوە هەواڵم پێدرا بەو شوێنەی كە كۆچی بۆ دەكەن ئەویش(یَثرب)ە، جا كێ دەیەوێ بۆی بڕوات با بچێ.

ئیدی مسوڵمانان پاش مۆڵەت دانی پێغەمبەری خوا ﷺ وردە وردە كەوتنە كۆچ و كۆچبار بەرەو شاری(یَثرِب)و خۆشی ﷺ دوای ئەوەی هەموویانی بەڕێ كرد ئەوجار بە هاوەڵیی(أبو بكر الصدیق) خوا لێی ڕازی بێ یەكەمین و نیزكترین و خۆشەویستترین هاوەڵی كۆچی كرد وەك لە سەرجەم

---

(١) بڕوانە: (الطبقات الكبرى) ج١ ص١٣٥.

کتێب و سەرچاوەکانی(سيرة)دا هاتوە، جا لێرە دا ـ واتە لە کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ پاش سەرجەم هاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ ـ دوو حیکمەت و دەرس و پەندی گەورە وەردەگیرێن:

یەکەم: پێشەواو گەورەی مسوڵمانان و قیادەی کارو چالاکی ئیسلامیی دەبێ هەوڵبدات هەمیشە لە شوێنکەوتووانی لە مەترسیی و ناخۆشیی یەوە نیزیکتر بێت! کاتێك ترس و سەغڵەتیی لەلای دواوە بێت خۆی بخاتە دوایەو خەڵکەکە پێش خۆی بخات. وەکاتێك هەست بکات بە مەترسیی و سەغڵەتیی لەلای پێشەوەیە خۆی ڕەپێش بخات و خەڵکەکە بخاتە پشت خۆیەوە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچکردنی خۆی بۆ شاری (يثرب) خستۆتە پاش کۆچکردن و بەڕێ کردنی تێکڕای هاوەڵانی یەوە!

دووەم: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ کۆچ و سەفەری خۆی پێش خستبایە زۆر نیزیك بوو کە کافرە کینە لە دڵ و کەللە ڕەقەکان بە هۆی نائومێد بوونیانەوە کە (محمد)یان لە دەست دەرباز بووە زۆرێك لەو مسوڵمانانەی دەکەوتنە بەرپەلیان بیانکوژن وەك تۆڵەو داخی دڵی خۆ ڕشتن!

**شەشەم: بناغە دانانی دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەر سێ پایەی:**

**دروست کردنی مزگەوت، بڕیاردانی برایەتی و هاوکاری لە نێوان کۆچکەران و پشتیوانان دا، نوسینی دەستوور (الصحيفة):**

پێغەمبەری خوا ﷺ پاش نیشتەجێ بوونی خۆی و هاوەڵە بەڕێز و دڵسۆزەکانی لە شاری (يثرب) دا کە دواتر ناوەکەی گۆڕا بۆ شاری پێغەمبەر

(مدينة الرسول) یەكەمین كارێك كە ئەنجامی دا بۆ بناغـە دانـانی كیـان و كۆمەڵگای ئیسلامیی ئەم سێ كارە بوون:

یەكەم: دروستكردنی مزگەوت:

كە سەرەتا مزگەوتی(قُبـاء) و پاشـان مزگـەوتی خـۆی[1] كـە بـە مزگەوتی پێغەمبەر (مسجد الرسـول) ناسـراوە دروسـت كـردو خۆشـی بەكردەوە ـ نـەك بەشـێوەیەكی ڕەمزیـی و بـۆ پڕوپاگەنـدەی سیاسـی و ڕاگەیاندن ـ بەشداری تێدا كردن.

بەڵێ بەڕێزان!

یەكەمین پایەی سێ پایە گـرنگ و گەورەكـەی كۆمـەڵگاو دەوڵـەتی ئیسلامیی یەكەم، بریتی بوو لە دروستكردنی مزگەوت(بنـاء المسـجد)! بەلاّم مزگەوتێك و چۆن مزگەوتێك! مزگەوتێك كـەوێڕای نوێـژ تێـدا بـەرپا كـران ـ پێـنج فـەڕزە و سـوننەتەكان ـ مەڵبەنـدی فێركـردن و پەروەردە(التعليم والتربية) و تێگەیاندن و پێگەیاندن بوو لە هەموو بوارو ڕەهەندەكانی دین و ژین و دینداریی داو، شوێنی كۆبوونەوەو ئاڕاستەكان (توجيهات) بوو بۆ سەرجەم كاروبارەكانی بواری سیاسیی و ئـابووریی و كۆمەلاّیەتی و سـەربازی كلتووریی و.. هتد!

بە كورتی: مزگەوتێك كە پێغەمبەری خوا ﷺ كـردی بەیەكـەمین و گرنگترین پایە و كۆڵەكەی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی یەكەم، جێگای خوا پەرستیـی تێدا كردن بوو بە مانای ڕاستەقینە و فراوان و گشتگیری وشەی خواپەرستیی(عبادة) كە دەروون و دەر(باطن و ظاهر)ی ئینسان و،

---

(١) بڕوانە: (سيرة ابن هشام) ج١ ص١٠٢.

تاك و خێزان و کۆمەڵگاو سەرجەم بـوارو لایەنـەکانی ژیـان و گـوزەران دەگرێتەوە، بۆیە هەموو ئەو کەسانەی کە بە پاساو و بیانووی جۆراو جۆرە وە دەیانەوێ ڕۆڵی مزگەوت تەسك بکەنـەوە و تـەنگ بـە ماڵـە بـەرزو پیـرۆزەکانی خوا هەڵبچـنن و نـەهێڵن ئـەهلی مزگـەوت بەندایـەتی و خواپەرستی ڕاست و تەواویان تێدا ئەنجام بدەن، وە بەر ئـەو هەڕەشـەیەی خوای دادگەرو تۆڵەستێن دەکەون کە دەفەرموێ:

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا..!!﴾ (البقرة ـ ١١٤)

واتە: جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە مـاڵ و مزگەوتـەکانی خـوا قەدەغە دەکات لەوە کە یادی ویان تێدا بکرێ و ناوی ویان تێدا بهێنرێ وە هەوڵی وێرانکردنیان دەدات!!

ئاشکراشە، وێرانکردنی مزگەوتەکان هەم شێوەی ماددی و هەم شێوەی مەعنەویشی هەیە و کاولکردنی مەعنەوییش بۆ ماڵەکانی خوا (جلَّ و علا) بریتیە لەڕێگا گـرتن لـە تێـدا ئـەنجام دانـی ئـەو ئـەرك و خـوا پەرستیـیانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ تێیان دا ئەنجام دراون. ئنجا لە هەمووی سەیرتر و نامەنتیقی تر ئەوەیە کە ئەو سیکۆلاریسـت (عَلْماني)انەی بە بیـانووی جـۆراو جـۆرەوە ماڵـەکانی خـوای لـە تێـدا ئەنجامدرانی خواپەرستیی یەکان قەدەغەدەکەن، دەیانەوێ خۆشیان پیـاو چاك بکەن ودەڵێن:

مزگەوت شوێنێکی یەکجار بەرزو پیرۆزەو نابێ بێجگە لە نوێژ هیچی دیکەی تێدا ئەنجام بدرێ، بە تایبەت کـاری سیاسـیی وەك وتـارو کـۆڕو کۆبوونەوەو دەرس و دەورا!! ئاشکراشە کە بێجگە لە خەڵکی ئیسلامیی ـ لە لایەنە سیاسییەکان ـ هیچ کەس نە ئەهلی مزگەوتە و نە پێویستیشی

بە مزگەوتە. چونكە ماشەڵلاّ برادەرانی دیكە چ زۆرە هۆڵ (قاعـة)ـیـان زۆرە كە چەندان جۆرە چالاكی خۆیان بە ئاسانی تێدا ئەنجام دەدەن!

كەواتە: مەسـەلەكە جگە لە ڕێ گرتن لە تەوژمی ئیسلامیی و كۆسپ و لەمپەرو تەگەرە خستنە بەردەمی هیچی دیكە نیە و فێڵی برادەرانی عەلمانییش لەو بارەوە هێندە زەقە با پێیان وانەبێ هیچكەس فریوی پێ دەخوات!

دووەم: بڕیاردانی برایەتی لە نێوان كۆچكەرو پشتیواناندا[1]:

كاری دووەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و پایەی دووەمی كە دایڕشت بۆ بنیاتنانی كۆمەڵگاو كیانی ئیسلامیی لە مەدینە و دەوروبەری دا ئەوەبوو كە بڕیاری دا برایەتیی و هاوكاری لە نێوان كۆچكەران (مهاجرین)و پشـتیوانان (أنصـار)دا بەرقــەرار بێ، حیكمــەت و هۆی ئەو بڕیــارەش ئاشكرایە:

كۆچكەران لە پێناوی خوادا كۆچیان كردوەو دەستیان لە ماڵ و حاڵ و خزم و كەس و زێدو نیشتیمانی خۆیان هەڵگرتوەو هیچ شتێكیان بۆ دەرباز نەكراوەو قەیرانێكی دەروونیی و كۆمەلاّیەتی و ئابووری ڕووی تێ كردوون و پێویستە بە خێرایی چارەسەر بكرێ، پێغەمبەری كاربەجێش ﷺ بەوە ئەو قەیرانە چەند ڕەهەندەی چارەسەركرد كە هەر كۆچكەرێك و پشتیوانێكی پێكەوە كردنە برا. برایەتی یەك كە لە هەموو شتێكی یەكدی دا بەشدار

---

(١) (ابن هشام) دەڵێ: (آخى رسول الله بين أصحابه من المهاجرين والأنصار، فقال: تآخَوا في الله أخَوَيْنِ أخوين) (سيرة ابن هشام) ج٢ ص١٠٨،١٠٩. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی بڕیاردا لە نێوان هاوەڵانی دا لە كۆچەران و پشتیوانان و فەرمووی: برایەتی بكەن لە پێناوی خوادا دوو برا دووبرا.

بن و تەنانەت دوای مردنیش میرات لەیەكدی بگرن! ئەگەرنا بێگومان برایەتی دیكەی ئاسایی هەر هەبوو و پێویستی بە بڕیاری پێغەمبەر ﷺ نەدەكرد: ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ..﴾ (الحجرات ـ ١٠) .

شایانی باسیشە كە بەو بڕیارە حەكیمانەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ مسوڵمانانی كۆچكەر لەو قەیرانە دەروونیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتی و ئابووریی یەی كە تێی كەوتبوون ڕزگاربوون. پاشان دوای ئەوەی كۆچكەرانیش وردە وردە سەقامگیر بوون و چاویان كرایەوەو بەو ژینگە و هەل ومەرجە نوێیەی مەدینەوە ڕاهاتن. خوای كاربەجێ ئەو بڕیارەی پێشووی ـ كە بڕیارێكی نائاسایی بوو بۆ هەلومەرجێكی نائاسایی ـ هەڵوەشاندەوەو ڕایگەیاند كە شێوەی میرات لەیەكدی گرتن هاتۆتەوە سەر ئەسڵی خۆی و حاڵەتی ئاسایی خۆی، وەك لە ئایەتی(٦)ی (الأحزاب)دا فەرموویەتی:

﴿.. وَأُوْلُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ إِلَّا أَن تَفْعَلُوا إِلَى أَوْلِيَائِكُم مَّعْرُوفًا كَانَ ذَلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا﴾ .

واتە: ـ وە خاوەنانی پەیوەندی خزمایەتی هەندێكیان شایستەترن بەمیراتگرتن لە هەندێكیان لە بڕواداران و كۆچكەران مەگەر چاكەیەك لەگەڵ دۆستەكانتان دا بكەن، ئائەوە ـ واتە ئەم بڕیارە ـ كاتی خۆی لە كتێب دا نووسراوە.

## سێیەم: نووسینی دەستوور:

سێیەمین كاری گەورە و بنەڕەتی پێغەمبەری خوا ﷺ كە بە سێیەمین پایەو كۆڵەگەی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی یەكەم دادەنرێ، ئەوە بوو

کە (الصّحیفة)ی نووسی، کە بەزاراوی ئەمڕۆ دەستوور (دستور)ی پێ دەگوترێ، یان یاسای بنەڕەتی (القانون الأساسي).

جا (الصحیفة) یان (الوثیقة) وەك (ابن هشام) لە (السّیرة)[1] داو گەلێك سەرچاوەی دیکەش هێناویانە[2] . بریتیە لە یاسایەکی بنەڕەتی (قانون أساسي) بۆ چۆنیەتی بەڕێوە بردنی کارو باری کۆمەڵگاو دەوڵەتی تازە سەرهەڵداو و بنیاتنراو و شێوەی هەڵس وکەوت پێکەوە کردنی پێکهاتەکانی لە مسوڵمانان ـ بەکۆچکەرو پشتیوانەوە ـ و جوولەکەکان و خەڵکی دیکەش، و دیاریکردنی ئەرك و ماف و ئازادییەکانی هاوڵاتیان و .. هتد.

شایانی باسیشە کە(الصّحیفة) سەرجەم لە چل و شەش (٤٦) مادده و بەند پێکهاتووە (ابن هشام) لە ژێر ناونیشانی (کتابه ﷺ بین المهاجرین و الأنصار والیهود)دا هێناویەتی[3] . واتە: (کتێبی ـ پێغەمبەر ـ ﷺ لە نێوان کۆچکەران و پشتیوانان و جوولەکەدا)

کەواتە: ئەو نووسراوە دەستوورێکە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی ئەوسێ پێکهاتە سەرەکی یەی کۆمەڵگای ئیسلامیی مەدینە.

---

(١) بڕوانە: (سیرة ابن هشام) ج٢ ص١٠٦،١٠٧،١٠٨.

(٢) بڕوانە: (مجموعة الوثائق السیاسیة في العهد النبوي) لمحمد حمیدالله، وە بڕوانە: (السیرة النبویة الصحیحة) للدکتور أکرم ضیاء العمري، کە دەربارەی (سند)ی (الصحیفة) گوتوویەتی: (ترقی بمجموعها الی مرتبة الأحادیث الصحیحة)، ج١ ص٢٧٥.

(٣) بڕوانە: ( سیرة ابن هشام ) ج٢ ص١٠٦.

پێشم وایە دەتوانین سەرجەم ئەو چل و شەش ماددەیەی کە (صحیفة) یان لێ پێکهاتوە لە ژێر حەوت ناوونیشان دا کۆیکەینەوە:

**یەك: ڕاگەیاندنی کۆبوونەوەی مسوڵمانان ﷺ یەك جوغزو بازنەی سیاسی دا بە ناوی ئوممەت(أمة):**

وەك لە بەندی دووەم (٢)دا هاتوە: (.. إنهم أمة واحدة من دون الناس)، واتە: ((.. وە ئەوان (کۆچکەران و پشتیوانان و ئەوانەی پێیانەوە لە مەودوا پەیوەست دەبن یەك کۆمەڵن جیا لە خەڵکی دیکە)).

وە لە بەندی پازدە (١٥)دا ئەو ڕاستییە خراوەتە ڕوو کە بڕواداران جیا لە خەڵکی دیکە هەندێکیان دۆست و پشتیوانی یەکدین: (.. وأن المؤمنين بعضهم موالي بعض دون الناس).

**دوو: ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە ﷺ مسوڵمانان جەنگ و ئاشتی یان یەکە و هیچ کەس بۆی نیە سەربەخۆ بەجیا جەنگ و ئاشتی بکات:**

وەك لە بەندی حەڤدە (١٧)دا بەڕاشکاویی باسکراوە: (.. وأن سَلمَ المؤمنين واحدةٌ لايُسالِمُ مؤمنٌ دون مؤمنٍ في قتالٍ في سبيل الله).

واتە: وە ئاشتیی بڕواداران یەکە و هیچ بڕوادارێك بۆی نیە بێ بڕواداران لە کاتی جەنگ لە پێناوی خوادا ئاشتی (لەگەڵ لایەنی بەرانبەردا) بکات.

**سێ: دیاریکردنی سەرچاوەی کۆتایی بڕیادان (تحديد المرجعية العليا للقرار):**

وەك لە بەندی بیست و سێ (٢٣)دا هاتوە، (وإنكم مَهما آختلفتم فيه مِنْ شيءٍ فأنَّ مَرَدَّهُ الى الله والى محمد) واتە: وە ئێوە لە هەر شتێك دا

كێشەو مشت و مڕتان پەیدابوو، ئەوە دەگێڕرێتەوە بۆ لای خوا وە بـۆلای موحەممەد.

هـەروەها لـە بەنـدی چـل و دوو (٤٢)ش دا هـەمان مەبەسـت بـە شێوازێكی دیكە باسكراوە.

**چوار: جەخت كـردن لەسـەر دادگـەریی و ڕێگـرتن لـە هـەموو جۆرەكـانی ستەم:**

وەك ڕستەی: (.. هم یَفْدون عانیهم بالمعروف و القسط بین المؤمنین)[1] لە هەركام لە بەندەكانی (٣،٤،٥،٦،٧،٨،٩،١٠،١١)دا دووبارە بۆتـەوە، بەڵام جگە لە بەندی (٣) لەسەرجەم بەندەكانی دیكەدا لە جیاتی (وهـم یفدون عانیهم) گوتراوە: (وكل طائفة تفدي عانیها).واتە وشەی (قسط) نۆ (٩)جاران دووبارە بۆتەوە و وشەی (عَدْل)یش كە لەگەڵ (قسط) یەك مانایان هەیە كە بریتیە لە (داد) جارێـك، كەواتـە سـەرجەم [redacted] (١٠) جاران وشەی (داد) یان (دادگەریی) لە (الصحیفة) داهاتوە، بێجگە لە ئاماژەكردن بە دادگەریی بە شێوەی تەعبیری دیكە، وەك لە بەندی شازە (١٦)دا ڕستەی: (وانه من تبِعنا من یهود فأنَّ له النّصر والأسـوة، غـیر مظلومین ولا متناصـر علـیهم) هـاتوە كـە هـەمان واتـای دادگـەریی دەگەیەنێ.

**پێنج: ماف و ئازادیەكانی هاووڵاتیان:**

لە چەند بەندێك دا باسی ماف و ئازادییەكانی ئەندامانی كۆمـەڵگا كراوە، بۆ نموونە:

---

(١) واتە: وە ئەوان دیلی خۆیان دەكڕنەوە بەو شێوەیەی كە بە چاك زانراوەو بە دادگەرا[redacted] لە نێو بڕواداران دا.

١- لە بەندی بیست و پێنج (٢٥)دا هاتوە: (وان یهود بني عوف أمة مع المؤمنین) کە مەبەست پێ ی ئەوەیە کە جوولەکەکان لەڕیزی کۆمەڵگای ئیسلامیی دان و یەکێکن لە پێکهێنەرەکانی.

٢- وە هەر لەبەندی ناوبراودا هاتوە: (للیهود دینهم وللمسلمین دینهم موالیهم وأنفسهم) واتە: هەرکام لە جوولەکە و مسوڵمانەکان و ئەوانەی پێیانەوە پەیوەستن دین و عەقیدەی سەربەخۆی خۆیانیان هەیە و بۆیان هەیە ئازادانە مومارەسەی بکەن.

٣- وە لە بەندی چل و پێنج (٤٥)دا هاتوە: (لایکْسِبُ کاسب الاّ علی نفسه) واتە: هەر کەسە لە کردەوەو خراپەی خۆی بەرپرسیارەو کەس ئۆباڵی کەس هەڵناگرێ و نابێ کەس بەتاوانی یەکێکی دیکەوە سزا بدرێ.

هەروەها لە بەندی سی و هەشت (٣٨)دا هەمان مەبەست هاتوە: (إنه لایأثم امرؤ بحلیفه). واتە: وەهیچ کەس بەهۆی — خراپەی — هاوپەیمانەکەیەوە تاوانبار نابێ.

٤- وە هەر لەبەندی سی و هەشت (٣٨)دا هاتوە کە بابای ستەملێکراو دەبێ سەربخرێ و پشتی بگیرێ: (وانّ النصر للمظلوم).

٥- وە لە بەندی دوازدە (١٢)دا هاتوە کە پێویستە بڕواداران لە بابای قەرزدارو نەدارەوە ڕانەمێنن و بەو شێوەیەی کە بە چاك زانراوە هاوکاری بکەن و دەستباری لەگەڵ بگرن: (وان المؤمنین لا یترکون مفرماً بینهم أن یُعْطوه بالمعروف)

٦- وە لە بەندی سێزدە (١٣)دا هاتوە کە بڕوادارانی پارێزکار دەبێ یەکدەست بن بەرانبەر هەر کە سێك کە چاوی لە دەستدرێژیی و ستەم و خراپە بێت تەنانەت ئەگەر ڕۆڵەی یەکێکیشیان بێ!: (و انّ المؤمنین المتقین أیدیهم

على مَنْ بغى منهم أو آبتغى دسيعة ظُلْـمٍ ... وانَّ أيـديهم عليـه جميعـاً ولوكان ولد أحدهم).

٧- وە لە بەندی بیست و یەك (٢١)دا هاتوە كـە هـەر كەسـێك بڕواداڕێـك بكوژێ و بەڵگەی شەرعی ڕوونی لەسەر بێ ئـەوە دەكوژرێتـەوە مەگـەر كەس و كاری كوژراوەكە بەخوێن ڕازی بن: (وانه من آعتبط مؤمناً قتْلاً بيِّنةً فانَّه قَوَدٌ بهِ الاّ أن يرضى وليُّ المقتول بالعقل).

٨- وە لە بەندی بیست و دوو (٢٢)دا هاتوە كە بۆ هیچ بڕواداڕێك كە بڕوای بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە و دانی بەوەدا هێناوە كە لەم (صحيفة)یە دایە، نیە، كە بابایەكی كەتنكەر (مُحْـدِثْ) پـەنا بـدات و پشـتگیریی بكات: (إنّ لايحلُّ للمؤمنِ أقرَّ بِما في هذه الصحيفة وآمـن بـالله واليـوم الأخر أن يَنْصُرَ مُحْدِثاً أو يؤويه).

٩- وە لە بەندی چل و شەش (٤٦)دا هاتوەكە هەركام لە هاووڵاتیـان چ لـە شار بچێتە دەر وە چ نیشتەجێ بێ دەبێ لە هێمنی و ئاسایش دا بێ (واتە گیان وسامان و كەرامەتی پارێزراو بێ) مەگەر كەسێك ستەم بكـات و تاوان بكات: (وإنه مَنْ خَرج آمِنٌ ومَنْ قعد آمَنٌ بالمدينة الاّمَن ظَلَم وأثِمَ).

**شەش: دیاریكردنی سنووری وڵات و قەوارەی سیاسیی:**

١- وەك لە بەندی سـی و نـۆ (٣٩)دا هـاتوە كـە پێویسـتە هـەموو ئـەو سەرزەمین و خەڵكەی دەكەوێتە جوغزوبازنەی شاری (يَثْرب)ەوە لە لایەن ئیمزاكەرانی (صحيفة)ەوە پارێزراو بێت و قەدەغە بێت ستەم و خراپـەی تێدا بكرێ: (وانّ يثرب حرامٌ جَوْفُها لأهل هذه الصَّحيفة).

**حەوت: بەرگریی كردنی هاوبەش لە وڵات و دەوڵەت:**

٢- وەك لەبەندی سی و حەوت (٣٧)دا هاتوە كە هەركام لە جوولەكە و مسوڵمانان پێویستە مەسرەفی خۆیان بكەن وە پێویستە پشتی یەكدی بگرن دژی هەركەسێك كە بجەنگێ لەگەڵ خاوەنانی ئەم پەیماننامە (صحیفة)یەدا وە پێویستە لەگەڵ یەكدی دا ساغ و دڵسۆز بن و چاویان لە چاكە بێ نەك خراپە: (وان على اليهود نفقتهم وعلى المسلمين نفقتهم وان بينهم النصر على مَنْ حارب أهل هذه الصحيفة وان بينهم النصح والنَصيحة والبّر دون الأثم).

هەروەها لە بەندی چل وسێ (٤٣)دا هاتوە كە پێویستە سەرجەم خاوەنانی (صحیفة) پشتی یەكدی بگرن و هاوكاری یەكدی بن لە ڕووی هەركەسێك دا كە هێرش دەكاتە سەر(یثرب): (وانّ بينهم النّصر على مَنْ دَهَم يَثْرِبَ).

دیارە ئەو حەوت مەبەستە بنەڕەتی یەش كە لە ژێر ئەو حەوت سەرباس و ناونیشانانە دا هێنامانن هێڵە گشتی و سەرەكی یەكانی هەر دەستوورێكی گشتگیرو دادگەرانە پێك دێنن. بۆیە دەتوانین بە دڵنیای یەوە بڵێین:

پێغەمبەری خوا ﷺ یەكەمین كەس بووە لە مێژووی مرۆڤایەتی دا كە یەكەمین و چاكترین دەستووری نووسیوە بۆ ڕێكخستن و بەڕێوە بردنی كۆمەڵگاو دەوڵەت بە شێوەیەكی دادگەرانەی وا كە هەموو پێكهاتەكانی كۆمەڵگاو دەوڵەت و یەك یەكی هاوولاّتیان بوون و ماف و ئازادیی یەكانیان پارێزراو بن.

لە كۆتایی ئەم دەرسەش دا كە تەرخانمان كردبوو بۆ تیشك خستنە سەر بابەتی چۆنیەتی سەرهەڵدان و بنیاتنانی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی دەڵێم:

وەك لە سەرەتاوەش گوتم بێگومان شوێن پــێ هــەڵگرتن و چـاولێكردنی ئێمەی مسوڵمان بۆ پێغەمبەری خوا (محمد) (صلى الله تعالى عليه وآله وسلم) كە بەچەندان ئایەتی قورئان لە سەرمان پێویست كراوە، بۆ نموونە:

﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ.. ﴾ (الأحزاب ـ ٢١).

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ .. ﴾ (آل عمران ـ ٣١)

﴿ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾ (النور ـ ٥٤)

بەڵــێ شوێنكەوتنمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و چاولێكردنی و كردنــی بە سەرمەشق و چاوساغ و مامۆستامان تایبەت نیە بە بوارێك و دوو بوار یان چەند بوارێكی دیاریكراوەوە، بەڵكو گشتیی و هەمەلایەنەیە و پێویستە لــە وردو درشتی ژیان و گوزەرانی تاكی و خێزانی و كۆمەڵایەتیی و سیاسیمان دا بیكەینە سەرمەشق، كەیەكێك لەو بوارانەش بواری كارو چالاكی ئیسلامییە.

ئنجا مادام بۆشــمان ڕوون بۆوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن چۆنی لەو بوارو مەیدانەدا كاری كردوە ـ وەك تیشكمان خستە سەر هێڵە گشتی یەكانی ـ پێویستە ئێمەش زۆر بە وردی شوێن پێی هەڵبگرین و لەو بــوارەدا چـاوی لــێ بكەین و بە پێی تواناو بۆ لوان وەك وی بكــەین ئەگــەر بمانــەوێ كــارو چالاكیەكەمان وەك بەناوی ئیسلامەوەیە بە نێوەڕۆكیش ئیسلامیی بێت و لە دنیادا بەرهەمدارو لە دوارۆژیش دا شایستەی وەرگیــران بێ وەك خواپەرستیی و طاعەتێك.

دیارە پوختەی ڕێبازو بەرنامــەی پێغەمبــەریش ﷺ بــۆ كــارو چــالاكی ئیسلامیی و بنیاتنانی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی ئەوەیەكە:

سەرەتا ئینسان خۆی هیدایەتی خوا وەربگرێ و لە پەیام و بەرنامەی خوا تێبگات و لەسەری پێبگات و هاوكاتیش وردە وردە دەست بكات بە بانگ كردنی دەوروبەری و هۆشیاركردنەوەو بەر چاو ڕوونكردنەوەیان و پاشان تێگەیاندن و پەروەردە كردنیان وە پاشان هاوكات لەگەڵ هۆشیاركردنەوەو تێگەیاندن و پێگەیاندنیان، دەست بكات بەهۆنینەوەو ڕێكخستن و گەشە پێدانیان و كردنیان بەكۆمەڵێكی پێشەنگ وحاڵی كردنیان لەو ڕاستییە كە ئەو پەیامەی ئەوان هەڵیان گرتوە و ئەو ڕێبازەی گرتوویانە پەیام وڕێبازی خوای پەروەردگارە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، بۆیە پێویستە لە خولیاو بیری ئەوەدابن و مشووری ئەوە بخۆن و كار بۆ ئەوە بكەن كە سەرەتا كۆمەڵگاو دەورو بەریان لەگەڵ خۆیان هاوڕەنگ بكەن و لەو خێرو بێرو بەرەكەت و نیعمەتە بەرزو مەزنەی خوا بەهرەمەند بكەن.

كەواتە دەتوانین بڵێین:

كارو نەخشەی پێغەمبەری خوا (صلوات الله و سلامه و بركاته علیه و علی آله أجمعین) بۆ بنیاتنانی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی لە دوو خاڵ دا كورت دەبێتەوە:

یەكەم: تێگەیاندن و پێگەیاندنی كۆمەڵێكی هەڵبژاردەی پێشەنگ كە بتوانن دەوروبەریان بخەنە ژێر كاریگەریی خۆیانەوە لەڕووی فیكریی و ئیمانیی و ڕووحیی ڕەوشتیی و.. هتدەوەو بەرەو خواو ڕێبازی پێغەمبەری خوایان بێنن.

دووەم: ئامادەكردن و سازكردنی بنكەی جەماوەریی، جەماوەرێك كە هەموو چین و توێژەكانی كۆمەڵگاو خەڵكی بگرێتەوەو بەچەند توێژێك وازنەهێنێ، وە جەماوەرێك كە هێندە هۆشیار و بێدارو چاوكراوە بێت

نەگونجێ بە پڕوپاگەندەی ناحەزانی تەوژمی ئیسلامیی فریو بخوات و كڵاوی لەسەربنرێ و هەڵبخڵەتێ! وە جەماوەرێك كە ئامادە بێت باوەش بۆ كار و پڕۆژەی ئیسلامیی بكاتەوەو هاوكارو دەستبارگرو مشوور خۆرو دڵسۆزی بێت.

بەڵێ بەڕێزان!

تەنها كاتێك و لە شوێنێك دا دەگونجێ كیان و دەوڵەتی ئیسلامیی پەیدا بێ كە. پێشتر كۆمەڵ و دواتر كۆمەڵگایەكی ئیسلامیی ڕەخسا بێ، كۆمەڵگای ئیسلامیش دوو پێكهێنەری سەرەكی هەن و لەسەر دوو پایەی بنەڕەتی بنیات دەنرێ:

یەكەم: كۆمەڵێكی ئیسلامیی پێشەنگی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو.

دووەم: خەڵك و جەماوەرێكی مسوڵمانی هۆشیارو دڵسۆز و ئامادە.

وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ كۆمەڵە مسوڵمانە تێگەیشتوو و پێگەیشتووەكەی قۆناغی[1] مەككە و جەماوەرە هۆشیارو دڵسۆزەكەی (یثرب)ی لێك داو كۆمەڵگای ئیسلامی لێ پێكهێنان و پاشان بەشێوەیەكی ئاسایی و ئۆتۆماتیكی كیان و دەوڵەتی ئیسلامی لە هەناوی ئەو كۆمەڵگا ئیسلامییە پەیدابوو و لەسەرچاوەی ئەو خەڵكە مسوڵمانەی هەڵقوڵی!

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەر دووك كۆمەڵی كۆچكەران (المهاجرین)و پشتیوانان (الأنصار)ی لە یەك داو كۆمەڵگای ئیسلامیی لێ پێكهێنان و لەو كۆمەڵگا ئیسلامییەش كیان و دەوڵەتی ئیسلامیی پەیدابوو!

---

(١) بۆیە گوتوومە قۆناغی مەككە، تەنانەت شاری مەككە تاكو مسوڵمانەكانی (یثرب)یش كە پێش كۆچكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە مسوڵمان بوو بوون، بگرێتەوە.

خواش بە کەرەم و لوطفی بێ سنووری خۆی یارمەتی مان بدات کە ئێمەی ئیسلامی یان و مسوڵمانانی کوردستان و عیراقیش بتوانین بەپێ ی ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ هەم کۆمەڵە مسوڵمانێکی زەین هۆشیار و دڵ بێدارو پارێزکارو خۆشڕەفتار و فیداکاریی وا پێ بگەیەنین کە شایستەی ئەوە بن ببنە سەرقافڵە و پێشەنگ وە هەم خەڵك و جەماوەرە مسوڵمانەکەشمان وا لێ بکەین کە پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی و بنیاتنانی کیان و دەوڵەتێکی ئیسلامی بە ئەرکی سەرشان و فەرزێکی خوایی بزانن و ڕازی نەبن بێجگە لە شەریعەتی خوا (تبارك وتعالى) هیچ سایە و سێبەر و بەرنامەو ڕێبازێکی دیکەیان هەبێ و وەك چۆن خوا پەرستیی یان تەنها بۆ خوایە:

﴿... وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾ (الكهف ـ ١١٠)

ژیان و گوزەرانیشیان بەس ملکەچی بەرنامەو حوکمی خوا بێت:

﴿... وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾ (الكهف ـ ٢٦) .

تاکو سەرەنجام سەر بەرزو بەختەوەری ئێرەو ڕوو سوورو سەرفرازی ئەولابن.

## وانەی هەشتەم:




**الحمدلله وصلاة والسلام على رسول الله محمد آله وصحبه ومَن آهتدى بهداه.**

**بەڕێزان!**

بە پێوستم زانی لەم وانەیەی هەشتەم دا تیشك بخەمە سەر مەسەلەیەكی گرنگ، ئەویش ئەوەیە كە ژمارەیەك لەو كەسانەی لافی شوێنكەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لێ دەدەن پێیان وایە كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان (إجتماع المسلمين) شتێكی داهێنراو (مُبْتَدع)ەو پاشان ئەو كەچفامییەی خۆیان كردۆتە پاساو و بیانووی لێخوڕێندن و زەم و غەیبەتی لایەنە ئیسلامییەكان و دژایەتی كردنیان، جا ئەو جۆرە كەسانە دوو فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەڵگەی ڕاو بۆ چوونە هەڵە و ناشەرعییەكەیان دەهێننەوە كە لە ئەنجامی بە هەڵە لێتێگەیشتنیانەوە گیرۆدەی ئەو هەڵوێستە ناقۆڵایە بوو ون!

بۆیە بە پێویستم زانی كە بە كورتی ئاماژەیەك بكەم بە ماناو چەمكی ڕاستەقینەی فەرمایشتەكان و هۆی بە هەڵە داچوونی ئەو جۆرە كەسانەش:

**فەرموودەی یەكەم:**

(تَفرَّقتِ اليهود على إحدى وسبعين فِرْقَة، وتَفرَّقت النّصارى على احدى أو ثنتين و سبعين فِرْقة، وتفترق أُمَّتي على ثلاثٍ وسبعين فرقةً) رواه أحمد وأبو داود والترمذي وابن ماجه و أبو يَعْلى وابن حِبّان والحاكم عن أبي هريرة رضي الله عنه وصحَّحه الترمذي و الحاكم والشاطبي.

واتە: جوولەكەكان پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو یەك تاقم. وە نەصرانییەكان پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاو یەك یان حەفتاو دوو تاقم. وە ئۆممەتیشم پەرتەوازە دەبێ بۆ حەفتاو سێ تاقم.

دیارە هەر ئەم فەرموودەیە بەشێوەیەكی دیكەش گێڕراوەتەوە كە ئەمە دەقەكەیەتی: (إِنَّ أهل الكتاب آفترقوا في دينهم على اثنتين وسبعين مِلّةً وان هذه الأمة ستفترِق على ثلاث وسبعين مِلَّة كلُّها في النار الاّ واحدة، وهي الجماعة) رواه أحمد وأبوداود والدارمي والطبراني عن معاوية بن أبي سفيان.

كە دیارە ئەمیش هەمان واتای فەرموودەی پێشووی هەیە ئەوەندە هەیە ئەو زیادەیەی كۆتاییش هەیە كە مانایەكەی ئاوایە: (... هەموویان لە ئاگردان جگە لە یەكیان، ئەویش (كۆمەڵ)ە!

**فەرموودەی دووەم:**

(عن حذيفة بن اليمان رضي الله عنه قال:

كان النّاسُ يسألون رسولَ الله ﷺ عن الخير، وكنت أسألُه عن الشرِّ مَخافة أنْ يُدْرِكَني، فقلت:

يارسول الله إنا كُنّا في جاهليةٍ وشرٍّ فجاءَنا الله بِهذا الخَيْر فَهَلْ بعد هذا الخير شَرٌّ؟!

قال: نَعَم.

فقلت: هل بعد ذلك الشَرّ مِنْ خَيْرٍ؟!

قال: نعم، وفيه دَخَنٌ.

قلت: وما دَخَنُهُ؟!

قال: قومٌ يَسْتَنّون بغير سُنَّتي ويَهْدون بِغَيْر هَدْيي، تَعْرِفُ منهم وتُنْكِرُ.

فقلت: هل بعد ذلك الخَيْر من شَرٍّ؟!

قال: نَعَم، دُعاةٌ على أبواب جهنّم مَنْ أجابهم اليها قذفوه فيها.

فقلت: يارسول الله! صَفْهم لنا.

قال: نعم، قومٌ مِنْ جِلْدَتِنا ويتكلّمون بِألْسِنَتِنا.

قلت: يارسول الله فما ترى إنْ أدْركني ذلك؟

قال: تَلْزَمُ جماعة المسلمين وإمامهم.

فَقلت: فأن لم تكن لهم جماعة ولا إمامٌ؟!

قال: فَاْعتَزِلْ تلك الفِرَق كلَّها ولو أن تَعَضَّ على أَصْلِ شَجَرةٍ حتَّى يُدْرِكَك الموتُ وأنت على ذلك) رواه البخاري برقم: ٦٦٧٣,٣٤١١ و مسلم برقم: ١٨٤٧.

واتە: حوذەیفەی كوڕی یەمان خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ:

خەڵكی دەربارەی چاكە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەكرد، بەڵام من دەربارەی خراپە لێم دەپرسی نەبادا تووشم بێ.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە نەفامێتی و خراپە دا بووین خوا ئەم خێر و چاكەیەی بۆ هێناین، جا ئایا پاش ئەم چاكەیە خراپە هەیە؟!

فەرمووی: بەڵێ.

گوتم: ئەدی پاش ئەو خراپەیە چاكە دەبێ؟!

فەرمووی: بەڵێ، بەڵام دووكەڵ و خڵتەی پێوەیە (و صاف نیە).

گوتم: جا ئایا دووكەڵ و خڵتەكەی چی یە؟!

فەرمووی: ئەوەیە كەكەسانێك دەبن (هەرچەند مسوڵمانن بەڵام) شوێن ڕێباز و شێوازی من ناكەون چاكەشیان تێدا دەبینی و خراپەش!

گوتم: ئەدی دوای ئەو چاكەیە خراپەی دیكە دەبێ ⁉

فەرمووی: بەڵێ، بانگەواز كەرانێك دەبن لەسەر دەرگاكانی دۆزەخ هەر كەسێك بە دەنگیانەوە بچێ بۆ ئەوەی دەیانەوێ، توڕی دەدەنە نێوی.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆمانیان پێناسەو وەسف بكە!

فەرمووی: بەڵێ، كە سانێكن (لە ڕووی ڕەگەزو ڕەچەڵەكەوە) لە خۆمانن و بە زمانی خۆشمان دەدوێن.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر گەیشتمە ئەو كاتە ڕات چی یە و چی بكەم؟!

فەرمووی: كۆمەڵی مسوڵمانان و پێشەوایان بگرەو لەگەڵیان بە.
گوتم: ئەدی ئەگەر (مسوڵمانان) نە كۆمەڵیان هەبوو نە پێشەوا؟!
فەرمووی: (لەو حاڵەتەدا) لە تێكڕای ئەو تاقمانە (كە خەڵكی بەرەو دۆزەخ بانگهێشت دەكەن) دوور بكەوەوە تەنانەت ئەگەر (لەبرسان) ڕەگی درەختیش بخۆی هەتا بەو شێوەیە مردنت دەگاتە سەر).

بەڵێ ئەم دوو فەرمایشتە گەلێك جار لەلایەن كەسانێكەوە كە بەهەر پاساو و بیانوویێك و بۆ هەر مەبەستێك بووە دژی تەوژمی ئیسلامیی و كۆمەڵبوونی مسوڵمانان بە بەڵگە دەهێندرێنەوە لەسەر ناشەرعیی بوونی دروست كردنی ڕێكخراو و كۆمەڵی ئیسلامیی و كاركردن بۆ ئیسلام و هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی حوكمی ئیسلامیی، بە شێوەی هەرەوەزیی و ڕێك و پێك!

بەڵام ئایا دەگونجێ ئەو فەرموودانە بكرێنە بەڵگەی مەبەستی ناوبراو یان بە پێچەوانەوە؟! با سەرنج بدەین:

<u>یەكەم:</u>

جارێ فەرمایشتی یەكەم كە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا باسی پەرتەوازە بوونی خاوەن كتێبە پێشووەكان (جوولەكەو نەصرانییەكان) دەكات و پاشان هەواڵ دەدات بەوەی كە ئوممەتەكەی ویش كاتێك دێ بەهەمان دەردو نەخۆشی یەوە گرفتار دەبێ، ئەوە بێگومان قسە لە لادان (إنحراف)ی ئوممەت دەكات لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ كە لە ئەنجامی ئەو لادانە دا گیرۆدە دەبێ بە دەردی پەرتەوازەیی تاقم تاقمێنەوە، كە هەركام لەو تاقمانە لە شتێك یان زیاتردا لە ڕێبازو ڕاستە شەقامی پێغەمبەر لادەدەن و سەرجەم زانایانی ڕۆچوو (راسخ)ی ئیسلامیش لە سەر ئەوە یەكدەنگن كە مەبەستی لەو تاقم و

پێڕانە ئەوانەن كە لە مێژووی ئیسلام دا بە تاقمەكان (الفِـرَق) یـان (أهـل الأهواء) یان (أهل البدع) ناسراون، بەڵام زانایانی ئیسلام بەشتێكی ڕاست و ڕەوایان نەزانیوە كە بە شێوەیەكی جەزم ناوی هەندێك لەو پێڕو تاقمانە ببرێ كە بە لادان و هەڵەوپەڵە ناسراون، بەڵكو گوتوویانە: واباشە هەروا بە تێكڕا (إجْمال) باسی دەستەو تاقمە لادەرەكان بكرێ و دیاری (تعییـن) نەكرێن.

بۆ نموونە: (الشاطبـي) لەو بارەوە گوتوویەتی:

(ولكنَّ الغالِبَ في هذه الفِرَق أَنْ يُشارَ الى أوصافهم لِيُحْذَر مِنْها ويَبْقـى الأمر في تعيينهم مُرْجـىً كمـا فهمنـا مـن الشـريعة ...) (الموافقـات) ج٤ ص١٨١.

واتە: بەڵام بە زۆری عـادەت وایـە كـە ئـەو تاقمانـە بـەس ئامـاژە بـۆ سیفەتەكانیان بكرێ تاكو دوورە پـەرێزیی یـان لـێ بكـرێ، بـەڵام وەك لـە شەریعەت حاڵی دەبین دەبێ مەسەلەی دیاری كردن و ناوهێنانیان دوا بخرێ و هەڵبگیرێ.

هەروەها (ابن تیمیة) گوتوویەتی:

(وأما تعيين هذه الفرق فقد صَنَّف الناسُ فيهم مُصَـنَّفاتٍ و ذكـروهم في كتب المقالات، لكن الجَزْمَ بأنَّ هذه الفرقة الموصوفة هي إحدى اثنتين والسَّبعين لابّد له مِنْ دليلٍ فأنّ الله حرَّم القَول بلا علم عموماً و حرَّم القول عليـه بِـلا عِلمٍ خصوصاً...) (مجموع الفتاوى) ج٣ ص٣٤٦.

واتە: بەڵام دیاریكردنی ئەم تاقمانە ئەوە كەسانێك كتێبیان لە بارەیانەوە نووسیون و باسیان كردوون لەو كتێبانەدا كە لـەو بـارەوە نووسـراون، بـەڵام جەخت كردن لەسەر ئەوە كە فڵانە تاقمە ناوبراوە یەكێكە لە حەفتاو دووەكان

پێویستی بە بەڵگە هەیە، چونكە خوا قسەی بێ زانیاریی بە گشتی قەدەغە كردوەو وەقسەكردنیشی بەناوی ئەوە وە بەتایبەت قەدەغە كردوە:.
كەواتە:

فەرموودەی یەكەم بەگشتی باسی ئەو پێڕو تاقمانە - با تاكەكانی هەر كامێكیشیان پرژوبڵاو بن - دەكات كە كەم و زۆر لە جادەو ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لادەدەن لە چۆنیەتی مسوڵمانەتیی و دینداریی كردن داو نابێ هیچكەس لەگۆترە بیكاتە كاڵای باڵای هەركەسێك یان هەر كۆمەڵێك كە لەبەر هەر هۆیەك بووە نەیارو ناحەزیەتی!

ئنجا ئەگەر پێناسەكەی پێغەمبەریش ﷺ بۆ كۆمەڵی سەرفراز(الفرقة الناجية) بكەینە پێوەرو تەرازوو ئەوە بەپێ ی بنچینەی (وبضدِّها تتميز الأشياءُ) شتەكان بە پێچەوانەكانیان ئاشكرا دەبن، چاكتر دەتوانین تێبگەین داخۆ كێ لەو پێڕو تاقمە لادەرانەوە نیزیكترەو كێش لە كۆمەڵی سەرفرازەوە نیزیكترە.

چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەوەی - لەڕیوایەتی دووەم دا - ڕای دەگەیەنێ كەیەكێك لەو حەفتاو سێ تاقمە ڕزگارو سەرفرازە ئەهلی دۆزەخ نیە(واتە شایستەی ئەوە نیە كە بەهۆی هەڵەو لادانەوە لە دۆزەخ دا بە ئەندازەی گوناهەكانی سزا بدرێ)، ئەو كۆمەڵە هەڵاوێرراوە بەڕستەی: (وهي الجماعة) پێناسەی دەكات، وشەی (الجماعة)ش لە سوننەت دا بە سێ واتا بەكارهاتوە:

١- نوێژی بە كۆمەڵ:

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (صلاة الجماعة تَفْضُلُ صَلاة الفذِّ بِسَبْعٍ وعشرين درجةً) رواه البخاري برقم: ٦١٩، و مسلم برقم: ٦٥٠، عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما، واتە: نوێژی بەكۆمەڵ بە بیست و حەوت پلە لە نوێژی تاك چاكترە.

٢- كۆمەڵبوون:

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (عليكم بالجماعة إيّاكم والفرقة لأنَّ الشَّيطان مع الواحد وهو من الأثنين أبْعَدُ ومن أراد بَحبوحة الجنة فَلْيَلْزَم الجماعة)رواه الترمذي عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه، برقم: ٢١٦٦، وقال: حديث حسن صحيح،

واتە:كۆمەڵ بن و خۆتان لەپەرتەوازەیی دوور بگرن چونكە شەیطان لەگەڵ یەكێك دا دەبێ بەڵام لە دووان دوورترە، وە هەر كەسێك نێوەڕاستی بەهەشتی دەوێ با لەگەڵ كۆمەڵ دابێ.

٣- كۆمەڵی بڕواداران كە لەسەر ئەمیرێك یان حوكمڕانێك كۆبووبنەوە:

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی كۆبوونەوەی مسوڵمانان لەسەر پێشەوا و حوكمڕانێك فەرموویەتی: (مَنْ أتاكم وأمركم جميع على رجلٍ واحدٍ يُريدُ أنْ يَشُقَّ عَصاكم أو يُفَرِّق جماعتكم فاقتلوه) رواه مسلم عن عَرْفَجة الأشجعي رضي الله عنه، برقم: ١٨٥٢ .

واتە: هەر كاتێك هەمووتان كۆك بوون لەسەر پیاوێك و یەكێك هات و ویستی بۆ فەرمانییتان بكات، یان (كۆمەڵ)ەكەتان پەرتەوازە بكات، بیكوژن.

وە لە بارەی کۆمەڵ بوونی بەشێك لە مسولمانان لەسـەر دەستی برا گەورەو ئەمیرێك و پارێزگاریی لێکردنی (کۆمەڵ)و یەکڕیزی یان فەرموویەتی:

(مَنْ رأى من أميره شيئاً يكرهُهُ فَلْيَصْبِرَ عليه فأنّه مَنْ فارق الجماعة شِبْراً فمات الاّ مات ميْتةً جاهليةً) رواه البخاري عن ابن عباسٍ، برقم : ٦٧٢٤، و مسلم برقم:١٨٤٩.

واتە: هەرکەسێك شتێکی لە ئەمیرەکەی بینی کە پێ ی ناخۆش بوو با ئارامی لەسەر بگرێ، چونکە هەرکەسێك بستێك لە کۆمەڵ دوور بکەوێتەوەو بمرێ ئەوە مردنێکی نەفامانە مردوە.

کەواتە: ئێستا جوان ڕوون بۆوە کە ئایا کێ و چ جۆرە کەسانێك لەوە نیزیکترن بکەونە بەر هەڕەشەی لادان لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ وکێش لەپێشترە لەوە کە وەسف و پێناسەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بۆ کۆمەڵی ڕزگار (الفرقة الناجية) بەکاری هێناوە بیگرێتەوە!

ئایا ئەوانەی کە نەزانانە بانگەشە دەکەن بۆ پرژو بڵاوبوون و بێ سەرەوبەرەو بێ سەرو سێبەر بوونی مسوڵمانان، نزیکترنین لە لادان لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ کە کۆمەڵ بوونی مسوڵمانان بە فەرز دادەنێ، جا چ لەسەر دەستی حوکمڕانێکی مسوڵمان لەحاڵەتی هەبوونی کیان و دەوڵەت دا، وە چ لەسەر دەستی ئەمیرو براگەورەیەك لە حاڵەتی نەبوونی کیان و قەوارەی سیاسیی دا؟!

وە ئایا ئەو لایەن و کۆمەڵە ئیسلامییانەی کە هەوڵی خڕکردنەوە و کۆکردنەوەی مسوڵمانان و تێگەیاندن و پێگەیاندن و هۆنینەوە و ڕێکخستنیان دەدەن تاکو بیانکەنە کۆمەڵ(جماعة) و پاشان کۆمەڵگا

(مجتمع)و دواتریش قەوارە (کیان)ی ئیسلامیی کە سەرجەم شەریعەتی خوا لە ژیانی تاکی و خێزانیی و کۆمەڵاتی خۆیان دا پیادە بکەن، لەڕێبازو ڕاستە شەقامی پێغەمبەری خواوە ﷺ نیزیکتر نین و، لە پێشتر نین کە وەسف و پێناسەی پێغەمبەری خوا: (وهي الجماعة) بۆ کۆمەڵی ڕزگار و سەر فراز بیانگرێتەوە؟! بێگومان با.

وە ئەم فەرمایشتە کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا باسی پێڕو تاقم و کەسانی لادەرو داهێنەر (مُنْحِرف و مبتدعْ) دەکات لە بازنەی ئۆممەتی دا واتە کەسانێك کە هەر مسوڵمانن و لە بازنەی ئیسلام نەچوونەتە دەرێ، بەڵام هەڵەو پەڵەو لادانی گچکە (إنحراف جزئي) یان هەیە نەك لادان و ترازانی یەکجارەکی (كُلّي)! هەر بۆیەش سەرجەم زاناو پێشەوایانی ئیسلام فەرمایشتی یەکەمیان بەو جۆرە کە گوتمان تەفسیر کردوە بۆ نموونە:

(أبوسليمان الخطّابي) لەو بارەوە گوتوویەتی:

(فيه دلالة على أنّ هذه الفرق كلّها غير خارجة من الدين إذجعلهم النبي ﷺ كلّهم من أُمّته) (معالم السنة) للخطابي، ج٧ ص٤.

هەروەها (ابن تيمية)ش هەر لەبارەی فەرموودەی ناوبراوەوە گوتوویەتی:

(والنبي ﷺ لم يُخرِجْهُم من الأسلام بَلْ جعلهم من أُمّته)(منهاج السّنّة النبوية). ج٥ ص٢٤١.

دیسان هەر لەو بارەوە: (أبو إسحاق الشاطبي) گوتوویەتی:

(لَيْس في النصوص الشريعة ما يدلّ دلالة قطعيةً على خروجهم من الأسلام، والأصل بقاؤه حتى يدّلّ دليلٌ على خلافِه، واذا قلنا بتكفيرهم فَلَيسْوا اذاً من تلك الفرق، بل الفِرَقُ من لَمْ تؤدِّهم بِدعتم الى الكفر...) (الموافقات) ج٤ ص١٩٣،١٩٤.

دووەم:

بەڵام بۆ فەرمایشتی دووەم ئەوە شتێكی ڕوونە كاتێك سەرنجی كۆی فەرمایشتەكە دەدەین دەزانین كە مەبەست لە (الفِرَق) لە ڕستەی: (فاَعْتزِلْ تلك الفرق كلّها) ئەو پێڕو تاقمانەن كە یەكجارەكی لە ڕاستە ڕێ ی پێغەمبەر ﷺ دەترازێن و هیچ پەیوەندی یان بە ئیسلام و مسوڵمانانەوە نامێنێ، بە پێچەوانەی فەرمایشتی یەكەم، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە (حُذَیْفَة) كردوە كە وازیان لێ بهێنێ و لەسەر جەمیان دوورە پەرێز بێت ئەگەر لە برسانیش مردوە! (فأعتزِلْ تلك الفرق كُلّها ولو أن تَعضَّ على أصل شجرةٍ حتى یُدْرِكك الموت وأنت على ذلك). ئەوە بێگومان مەبەست پێیان خەڵكی مسوڵمان نیە، بۆیە بەبەڵگە هێنانەوەی لەسەر ئەوە كە پێویستە مسوڵمانان لەكۆمەڵ و لایەنە ئیسلامییەكان دووربن و توخنیان نەكەون ـ وەك هەندێك كەسانی فامكاڵ و فەقیرحاڵ یان دین فرۆش و بەكرێ گیراو و دڕاو دەڵێن!! ـ شتێكی یەكجار هەڵەو ناماقووڵ و بێجێیە.

چونكە!

یەكەم: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو فەرمایشتەی دا باسی قۆناغەكانی كۆمەڵ و كۆمەڵگای مسوڵمانان بە گشتی دەكات و ، وەك دەردەكەوێ مەبەستی لە:

(قومٌ یَسْتَنّون بغیر سُنَّتي ویهدون بغیر هَدْیي تَعْرِف منهم وتُنكِرُ) قۆناغەكانی حوكمڕانیی ئەمەویی و عەبباسیی و عوسمانیی یەكانە، كە هەرچەندە حوكمڕانییەكەیان بە ناوی ئیسلامەوە بوو، وەكەم و زۆر حوكم بە شەریعەت دەكرا، بەڵام هەڵەوپەڵەو دووكەڵ و خڵتەی زۆریشی تێدا بوو

بە تايبەت لە مەسەلەی چۆنیەتی چوونە سەر حوكم كە لە شووڕاییی یەوە گۆڕابوو بۆ میراتیی تاكیی!

وە مەبەستیش لەو خراپە (شرّ)ە كـە لـە دوای ئـەو چـاكە (خَيـرْ) دووكەڵاویی یەی پێشەوە دێ قۆناغی نـەمانی حـوكمڕانیی ئیسـلامە و گۆڕانی سیستەمی حوكمڕانییە لە ئیسـلامەوە بـۆ غـەیری ئیسـلام بـە هەموو ناو و نیشان و جۆرو شێوەكانیەوە، كە لەو كیان و دەوڵەتۆكانەدا بەرجەستە بوو كە پاش ڕووخانی سیستەمی خیلافەت لەساڵی (١٩٢٤) لە نیشتیمانی ئیسلامی دا سەریان هەڵدا.

دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو جۆرە دەستە و تاقمانە بە:

(دُعاةٌ على أبواب جهنّم من أجابهم اليها قذفوه فيها) پێناسە دەكات، كەواتە بەتەئكید ئەو پێناسەیە تەنها ئەو كەس و پێڕو تاقم و قەوارانـە دەگرێتەوە كە بە ئاشكرا غەیری ئیسلامیان بەبەرنامەی ژین هەڵبژاردوە و تەبەننی (تبنّي) كردوەو بێ پێچ و پەناش خەڵكی بـەرەو ئـەو گونـاح و تاوان و خراپانە بانگ دەكەن كە پێ یان دەبنە شایستەی چوونە دۆزەخ!

سـێیەم: هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بەوە پێناسەیان دەكات كە لـەڕووی ڕەچەڵەك و نەتەوەوە و لە ڕووی زمان و قسە كردنەوە لە خۆمـانن و وەك خۆمانن: (قومٌ مِنْ جِلْدتِنا ويتكلّمون بألْسِنَتنا)!

جا لە ڕاستی دا ئەو وەسفەو ئەوەی پێشووش پڕبەپێستی ڕژێم و حیزبە سیكۆلاریست (عَلْماني)ەكانە، كە لـە ڕووی ڕەنـگ و زمـان و نەتـەوەو ڕەگەزەوە لە خۆمانن بەڵام بەدین و عەقیدەكەمان بێگانەن بگرە دوژمن و ناحەزیشن!

چوارەم: هەروەها فەرمانكردنی پێغەمبەر ﷺ بە خۆ دوور گرتن لەو پێڕو تاقمانە و ڕەگەڵ نەكەوتنیان و توخن نەكەوتنیان ــ وەك قەناعەت پێبوون لەگەڵ ڕۆیشتن و بەقسەكردن ــ ئەگەر مەرگ و لە برسان مردنیشی تێدا بووە، (فاعتزلْ تلك الفرق كلّها ولو أن تعضَّ بأصل شجرة..) بەڵگەیەكی دیكەیە كە ئەو تاقم و پێرانە لاڕێ و غەیرە دینن ئەگەر نا پێغەمبەر ﷺ هێندە بەرامبەریان هەستیار (حَسّاس) نە دەبوو، كە مەرگ و لە برسان مردنی پێ باشتر بێ بۆ ئۆممەتی لە لێ نیزیك بوونەوە و ڕەگەڵ كەوتنیان!

پێنجەم: هەروەها ڕستەی: (ولو أنْ تعضَّ بأصل شجرة حتى يدركك الموتُ وأنت على ذلك) ئەوە دەگەیەنێ كە كاتێك دێ ـ وەك ئەم ڕۆژگارەی ئێستامان ـ ئەو تاقم و پێڕو ڕژێمە لاڕێ و دژ بە ئیسلام و بانگەوازكەرانە بەرەو دەروازەكانی دۆزەخ، هەرچی خێرو بیرو ئیمكانی یەتە دەیخەنە ژێر ڕكێفی خۆیانەوە وهەرچی لە خزمەت خۆیان و بەرنامەو پرۆژەكانیان دا نەبێ بەشی نادەن و، تەنها كاتێك ئامادەن هاوكاری (ژین)ی خەڵك بكەن كە دەستیان پێ لە (دین)یان بەربدەن! كەواتە:

بە هیچ جۆرێك ناگونجێ كە فەرمایشتی دووەم بكرێتە بەڵگەی ئەو مەبەستە ژەهراوییەی كە ئاماژەمان پێ دان ـ واتە دروست (جائز) نەبوونی هەبوونی كۆمەڵ و لایەنە ئیسلامییەكان ـ بەڵكو بە پێچەوانەوە ئەم فەرمایشتەش وەك ئەوەی پێشوو بەڵگەیەكی یەكجار بە هێزە لەسەر پێویست بوونی هەبوونی لایەنە ئیسلامی یەكان و كۆبوونەوەی مسوڵمانان لێیان و پشتگیریی كردنیان، چونكە:

پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك (حذيفة) خوا لێ ی ڕازی بێ پرسیاری لێ دەكات كە ئایا كاتێك بانگەوازكەرانی خەڵك بۆ دەروازەكانی دۆزەخ (دعاة علی أبواب جهنّم) پەیدابوون چی بكات؟!

پێی فەرموو:

(تَلْزَمُ جماعة المسلمين وإمامهم)، كەواتە: دەگونجێ (دعاة علی أبواب جهنّم) حوكمڕان بن و هەمەكارەی خەڵك و وڵات بن، بەلاَم مسوڵمانانیش كۆمەڵ (جماعة)و پێشەواو برا گەورە (إمام)ی خۆیانیان هەر هەبێ! وە لەسەر ئینسانی مسوڵمانیش پێویستە كە لەگەڵ كۆمەڵی مسوڵمانان و براگەورەكەیان دابێ و، ئەگەر گریمان كۆمەڵ و براگەورەشیان نەبوو دیسان هەر نابێ ڕەگەڵ ئەو پێڕو تاقمانە بكەوێ كە بە هەموو شێوەیەك خەڵكی بەرەو دەرگاو دەروازەكانی دۆزەخ پەلكێش دەكەن و پاڵەستۆ دەدەن و گوتراویشە: (سەرچۆپی بدە دەست گامێشێ بۆ لای كادێنێ دەیكێشێ!).

لە كۆتاییش دا دەڵێم:

ئایا ئەو كەسانەی خۆیان بە مسوڵمان دەزانن و بگرە هەندێك جار بە مشورخۆر و دڵسۆزیش چاكتر نیە ـ بۆ دنیاو قیامەتیان ـ كە لەجیاتی خۆ خەریك كردن بە خستنە ژێر نیشانەی پرسیاری بوونی لایەنە ئیسلامییەكان كە میللەت و خەڵكە مسوڵمانەكەی خۆیان بۆ دینداریی چاكترو هەمەلایەنەو سەرەنجام دەرگاو دەروازەكانی بەهەشت بانگ دەكەن، بوونی خەڵكی عەلمانیی لە وڵات و لە نێو خەڵكێكی مسوڵمان دا بخەنە ژێر نیشانەی پرسیار؟! ئایا كامیان لەگەڵ عەقڵ و شەرع دا سازگارە:

مسوڵمانان لەسەر بناغەی دینەکەیان کۆببنەوەو کاروباری خۆیان ڕێك بخەن، یان لە سەر بناغەی غەیری ئیسلام؟!!

وە ئایا کێ هەڵوێستەکەی سەیرو نامەنتقی یە :

مسوڵمانێك کەشوێن ئیسلام دەکەوێ، یان مسوڵمانێك!! کەشوێن غەیری ئیسلام؟!

وە ئایا مسلمانەتی ئەو مسوڵمانەی کە شوێن غەیری بەرنامەی خواو ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوێ هیچی لێ دەمێنێتەوە؟!!

ئنجا ئەگەر هەبوونی کەم وکوورپی و هەڵە و پەڵە لەلایەن و کۆمەڵە ئیسلامییەکان دا بکرێتە بیانووی شەرعییەتی بوون خستنە ژێر پرسیارەوە دەڵێین:

ئایا هیچ کات ئینسان لەکەم و کووڕی خاڵی دەبێ؟ مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نەی فەرمووە: (کل بنـي آدم خطّاءٌ و خیر الخطّائین التّوابـون) رواه أبو داود؟!

وە ئایا ئەو کەسانە خۆیان بێ هەڵە دەبینن؟

یان ئایا ئەو ڕژێم و تاقمە سیکۆلاریستانەی حوکم بەسەر مسوڵمانان دا دەکەن و لە بەرانبەریشیان بێ دەنگن! بێ هەڵە و پەڵە دەبینن؟!

وە ئایا هەبوونی کەم و کووڕی لە مسوڵمانان دا پاساوی زەم و غەیبەت کردنیانە یان دەبێ هاندەری هاوکاری و یارمەتی دان و عەیب و ناتەوای لەگەڵ چاك کردن بێ وە ئەگەر دیاردەی چەند لایەنی(التعّدد) لە نێو تەوژم (تیار)ی ئیسلامیی دا بیانو و پاساوی ئەو هەڵوێستە بێ، دەڵێین:

ڕاستە یەكڕیزیی ویەكبوونی مسوڵمانان چ لەسەر ئاستی هەر وڵات و ناوچەیەك و چ لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامیش فەڕزە، وەك خوای كار بەجێ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ (الأنبياء -٩٢).

بەڵام: بنچینە (قاعدة)یەكی شەرعییەو زانایان لەسەری پێكهاتوون كە: (لايسقط المَيْسورُ بالمعسور) ئەوەی كە ئاسانە و دەكرێ ئەنجام بدرێ بەوە لاناچێ كەزەحمەتە و ئەنجام نادرێ. هەروەها بنچینەیەكی شەرعییە كە: (مالايُدرك كلّه لايُترك جُلّه أو بَعْضُهُ) ئەوەی كە هەموویان بۆ ناكرێ نابێ زۆربەیشی یان هەندێكیشی ــ مادام دەكرێ ــ لێ فەرامۆش بكەین.

خوای زاناو تواناش تبارك وتعالى فەرموویەتی:

﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ ﴾ (التغابن -١٦).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا..﴾ (البقرة -٢٨٦).

ئاشكراشە كە: (یان هەموو یان هیچ) هەڵەیە چونكە لەشتێكی شتێك پەیدادەبێ بەڵام لە هیچ هیچ، وە وەك گوتراوە: (ڕێی هەزار میل بە هەنگاوێك دەست پێ دەكات).

ئنجا ئەگەر نەگونجێ ـ لەبەر هەر هۆیەك بێ ـ لە شوێنێكی وەك كوردستان یان عیراق مسوڵمانانی مشوورخۆرو دڵسۆز بۆ ئیسلام و هەوڵدەر بۆ تازەكردنەوەی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ لە یەك حزب و ڕێكخراویش دا كۆببنەوە، بێگومان ئەگەر دووان یان زیاتریش بن هەر چاكترە لەوەی كە مسوڵمانان هەر پرش و بڵاو و بێسەرەو بەرە بن و وەك دەنكەكانی تەسبیحێكی دەزوو پچڕاو هەریەكە لە لایەك بێت، لە حاڵەتێك دا كە چەندان ئایەتی خوا(سبحانه وتعالى) و فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ فەرمان دەكەن بە

یەکگرتن و برایەتی و کاروبار بە ڕاوێژ ڕاپەڕاندن و هاوکاری یەکدی کردن و دۆستایەتی و.... هتد!!

بەڕێزان!

ئێستاش پێم وایە پاش ئەم بڕە توێژینەوە زۆر باش ڕوون بۆوە کە: کۆمەڵ بوونی مسوڵمانان ئەرکێکی شەرعیی و پێویستەو پرژوبڵاو بوون و بێ سەرەو بەرەیی یان شتێکی هەڵەو بیدعەتە.

لێرەش دا کۆتایی بەم دەرسی هەشتەمە دێنین و دەڵێیـــن:

سبحانك اللّهم وبحمدك أشهد أن لا اله الاّ أنت أستغفرك وأتوب اليك.



# وانەی نۆیـــەم:

# گرنگیـی و پێویسـتیی ڕێکخسـتن بۆ کاری ئیسـلامیی



## پێناسـەی ئەم وانەیــە

بەڕێــزان!

ئەم وانەیە لە ئەسڵدا وتارێکی بەندە بووە کە لــە کــۆڕێکی تایبــەت دا ئاڕاستەی کادیر و ئەندامانی ڕێکخستنی سنووری مەڵبەندی سلێمانی کراوە لە هۆڵی (بنــار)، لــە مــانگی (٥)ی ئەمســاڵ (٢٠٠٦) دا و، پاشــان لــە کاسێتەوە هێنراوەتە سەر کاغەزو پاش دەستکارییەکی کەمی هەندێك وشە و ڕستەی بەجۆرەی لێهاتووە.

هیواداریشم ئەم وتارە ببێتە مایەی بەرچاو ڕوونیی یەکی باش بۆ هەموو ئەو مشوور خۆرە ماندوونەناسە دڵسۆزانەی کە لە مەیدانی کــار و چــالاکی ئیسلامیی دا سەرگەرمی کارن بە گشتی و بە تایبەت ئەوانەی کە لە بواری ڕێکخستن دا کار دەکەن.

پێویستە هەموو لایەکیشمان لەو ڕاستی یە دڵنیابین کە:

ئەگەر خەڵك و کۆمەڵگا هەمووی جەماوەر و دۆست و پشتیوانی کــار و پرۆژەی ئیسلامیی بێت، مادام کەسانێك نەبن کە بۆ ئەو خەڵك و جــەماوەرە دەوری بناغــە و ڕەگ و ڕیشــە ببیــنن، کــار و پــرۆژەی ئیســلامیی نــاتوانێ ئامانجەکانی خۆی بێنێتەدی و خەڵك و کۆمەڵگا لەگەڵ ئیسلام دا تەفاعول پێ بکات و شــەریعەتی خــوای کاریــەجێ لــە ژیــانی تــاکیی و خێزانیــی و کۆمەڵایەتی یاندا بەرپا بکات!

ئنجا ئاشکراشە کە پەروەردەکردن و پێگەیاندنی ئەو جۆرە کەسە دانستەو تایبەتی یانەش کاری ڕێکخستنە و تەنیا لە میانەی هۆنینەوە و ڕێکخستن دا ئەنجام دەدرێ، کەواتە:

با گرنگی یەكی تەواو بە ڕێكخستن بدەین، بەڵام لە سەرێكی دیكەشەوە لەبیرمان نەچێ، كە گۆڕینی خەڵك و كۆمەڵگا وێڕای هەڵبژاردە (نخبة)یەكی پوخت و پێشەنگ پێویستی بە ڕای گشتیی و بنكەی جەماوەرییش هەیە و، وەك چۆن بەبێ هەبوونی ڕێكخستنێكی تۆكمەو مشوورخۆرانێكی پێشەنگ و نموونەیی هەرچەندە جەماوەرمان هەبێ كارمان مەیسەر نابێ و سەروبەرناگرێ، بە هەمان شێوە بە هەبوونی خەڵكێكی هەڵبژاردە و پوختیش مادام ڕایەكی گشتیی و جەماوەرێكی هۆشیار و دڵسۆزیان لە پشتەوە نەبێ، دیسان كارمان تەواو نابێ، وەك چۆن درەختێك نە بە ڕەگ و ڕیشەی ڕووت و، نە بە قەد و لق و پۆپ و گەڵای تەنیا نابێتە درەخت و، وێكڕا و پێكەوە لە هەردووكیان پێك دێ.

به سەرنج دانی سیرەو ژیانی پێغەمبەری خواش ﷺ زۆر چاك دڵنیا دەبین كە لە كاری ئیسلامی یانەی پڕ بەرەكەت و پیرۆزی خۆی دا لە یەك كات دا هەردووك پرۆسەی:

پێگەیاندنی پێشەنگێكی پوخت و ساز كردنی ڕای گشتیی و بنكەی جەماوەریی پێكەوە ئەنجام داون.

خوا بە كەرەم و بەزەیی بێ سنووری خۆی یارمەتیمان بدات كە ئێمەش لەم بوارەدا و لە هەموو هەڵسوكەوتێكی دیكەش دا چاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكەین و بیكەینە مامۆستا و چاو ساغ و سەرمەشقمان، خوای زانا و شارەزاش تبارك وتعالى فەرموویەتی:

﴿... وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ (النور-٥٤).

سبحان ربك رب العزة عما يصفون . وسلام على المرسلين .

والحمد لله رب العالمين .

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين وصلوات الله تعالى وسلامه وبركاته على حبيبنا وشفيعنا محمد وآله أجمعين من الصحب والأزواج والذرية والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

برا و خوشكانی بەڕێز و خۆشەویستم! -ئەو مشوورخۆرانەی كە لە بواری ڕێكخستنەكاندا كار دەكەن- ئەو بابەتـەی كـە مـن بـۆم ئامـادە كـردوون بابەتێكە لە ژێر ناوونیشانی:

(گرنگی و پێویستی ڕێكخستن بۆ كاری ئیسلامیی).

خوا پشتیوان بێ لە (٥) تەوەران دا ئەم بابەتەتان پێشكەش دەكەم بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- كاری ئیسلامیی بەشێكە لە مسوڵمانیتی مان.

٢- سێ پایەی بنەڕەتی كاری ئیسلامیی:

(سەركردە ، پێشەنگ ، جەماوەر).

٣- ڕێكخستن چی یەو چۆن دەكرێ؟

٤- كێ خەڵكی پێ ڕێك دەخرێت؟

٥- ئامانجی ڕێكخستن.

### تەوەرەی یەكەم:

## كاری ئیسلامیی بەشێكە لە مسوڵمانێتی مان:

بۆ ئەوەی ئەم ڕاستی یە لە دڵ و مێشكمان دا درەوشاوە بێت پێویستە پێناسەی كاری ئیسلامیی بكەین، كاری ئیسلامیی چی یە؟

لە ڕاستی دا دەتوانین بە كورتی بڵێین: كاری ئیسلامیی واتە كار كردن بۆ ئەوە كە ئایینی ڕاست و دروست و تێر و تەواوی خوا بەرنامەی ژینی خەڵك بێت و شەریعەتی خوا سایە و سێبەری خەڵك بێت، كاركردن بۆ ئەوە كە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بەرنامە و ڕێبازی خەڵك و میللەت بێت، ئەوە بە گشتی.

ئنجا ئەگەر كاری ئیسلامیی ورد بكەینەوە بۆ ئەو موفرەدانەی لێیان پێك دێت، پێش هەموو شتێك كاری ئیسلامیی بریتیە لە خەڵك بانگ كردن بۆ لای خوا، پاشان بریتیە لە تێگەیاندنی خەڵك لە ڕاستی یەكانی دینی خوای پەروەردگار، سەرەتا بانگیان دەكەین دوایی تێیان دەگەیەنین، هەروەها بریتیە لە پەروەردە كردن و پێگەیاندنی خەڵك پاش تێگەیاندنیان لەسەر بناغەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، عیبادەتی ئیسلامیی، خووڕەوشتی ئیسلامیی.

وە پاشان كاری ئیسلامیی بریتیە لە فەرمان بە چاكە كردن، واتە چەسپاندنی هەموو ئەو شتانەی كە شەریعەتی خوا بە چاكی زانیون لە هەموو بوارەكاندا، چ لە بواری عەقیدە و فیكر، چ لە بواری عیبادەت بە تێگەیشتنە عورفی و تەسكەكەی، وە چ لە بواری ڕەوشت و ئاكار و چ بواری سیاسی، كۆمەڵایەتی، ئابووری...هتد دا.

چەسپاندنی هەموو ئەو شتانەی چاكن، واتـە شـەرعی خـوا بـە چـاكی زانیون، وە بژاركردنی كۆمەڵگا لە هەموو ئەو شتانەی كە شەرعی خوا بـە خراپی زانیون.

هەروەها كاری ئیسلامیی بریتیە لە چەسپاندنی دادگەریی:

﴿ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ﴾ (الشورى ـ١٥).

وە لابردنی زوڵم و ستەم، ئەگەر بمانەوێ هەموو ئەوانە كۆ بكەینەوە دەبێ بڵێین: كاری ئیسلامیی بریتیە لە هەوڵدان بۆ بەرپا كردنی دینی خـوا، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ:

﴿ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ﴾ (الشورى ـ١٣)

واتە: دین بەرپا بكەن و تێیدا پەرتەوازە مەبن. جا ئێمە بۆیـە دەڵـێین كاری ئیسلامیی مان بەشێكە لە مسوڵمانێتی مان لـە دینـداریی مـان و بەشێكە لە ئیمان و عەقیـدەمان، چـونكە ئـەو (مفـردة)انـەی كـە كـاری ئیسلامیی پێك دێنن و باسـمان كردن هەر لە بانگەوازەوە بگرە تا ئامـانجی كۆتایی كە بریتیە لە بەرپاكردنی دینی خوا، هەموو ئەوانە خوا (جل جلاله) فەرموونی و فەرمانی پێ كردوون وەك چۆن فەرمانی كردوە بە نوێژ كردن و ڕۆژوو گرتن و بە زەكات و حەج، وە فەرمانی كردوە بەوە كە ئینسان لە زاتی خۆی دا خۆی لە قەدەغە كراوەكان بپارێزێ و واجبە عەینی یەكان –ئەوانەی كە لەسەر ئینسان وەك تاك پێویست دەبن- جێ بەجێ یان بكات، هەر ئـەو خوا زانا و توانایەش (سبحانه وتعالى) فەرمانی كردوە بەوە كە ئێمە خـەڵك بۆ لای خوا بانگ بكەین وەك دەفەرمویٚ:

﴿ ادعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ...﴾ (النحل ـ١٢٥)

واتە: خەڵك بۆ لای ڕێبازی پەروەردگارت بانگ بكە.

بەڵكو خوای پەروەردگار ئەوانەی كە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەكەن بە چاكترین كەسی داناون، وە قسەی ئەوانیشی بە چاكترین قسە داناوە وەك دەفەرموێ:

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ (فصلت ـ٣٣) .

واتە: وەقسەی كێ چاكترە وەكێ چاكترە لەوەی كە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەكات، (واتە بۆلای ڕێبازی خوا، بۆ بەندایەتی كردن بۆ خوا و پابەندی بە بەرنامە و شەریعەتی خواوە) وە كردەوەی چاكیش دەكات و دەڵێ من لە ریزی مسوڵمانانم؟!

كەواتە خەڵك بانگ كردن بۆ لای خوا فەرمانی خوای لەسەرە، هەروەها فەرمان كردن بە چاكە (الأمر بالمعروف) بەو چەمكە فراوانەی كە باسم كرد وە ڕێگرتن لە خراپە (النهي عن المنكر) ئەویش دیسان بەو چەمكە فراوانەی كە پێچەوانەی فەرمان بە چاكەیە. ئەوەش هەر فەرمانی خوای پەروەردگارە، دیارە كە ڕێگرتن لە خراپە مەبەست لە هەموو بوارەكان دایە، لە بواری عەقیدە و فیكر، لە بواری سیاسەت و حوكمڕانی، هەروەها بوارەكانی ئابووری، كۆمەڵایەتی، پەرستن وەك دروشمەكان، خوڕەوشت، دەبێ ڕێگە بگری لە خراپە. دەبێ وڵات و كۆمەڵگای خۆت لە خراپە و ناشەرعی یەكان بژار بكەی.

ئەوەتا دەبینین خوای پەروەردگار فەرمان بە چاكە و ڕێگرتن لە خراپەی كردوە بە پێناسەی مسوڵمانان بە پیاو و ئافرەتەوە بە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ وە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ

بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (التوبة ـ ٧١)

واتە: پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار هەندێكیان دۆست و پشتیوانی هەندێكیانن و (پشتی یەكتر دەگرن و هاوكاری یەكتر دەكەن، بۆچی؟!) فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێگا لە خراپە دەگرن، وە نوێژ بەرپا دەكەن و زەكات دەدەن، وە فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەری خوا دەكەن، ئا ئەوانە خوا بەزەیی پێیاندا دێتەوە، بێگومان خوا زاڵی كاربەجێ یە.

وە لە ئایەتی ژمارە(١٠٤) سورەتی آل عمران دا كە دەفەرموێ:

﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾

واتە: با لە ئێوەدا كۆمەڵێك هەبن – یا ئێوە ئەی ئومەتی محمد ﷺ كۆمەڵێك بن كە ئەو سێ ئەركە ئەنجام دەدەن- بانگەوازی خەڵك دەكەن بۆ ئیسلام، فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێگا لە خراپە دەگرن، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

جا ئەگەر لەم ئایەتەدا دەگونجێ و (إحتمال)ی هەیە (مِن) بۆ بەشێك (تبعیض)بێ واتە لە نێو ئێوەدا ئەی ئومەتی محمد ﷺ با كۆمەڵێك هەبن ئەو سێ ئەركە جێ بە جێ بكەن، ئەوە بێگومان ئایەتەكەی سوورەتی (التوبة ـ٧١) هەموو ئیمانداران بە پیاو و ئافرەتەوە بە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ وە بەوە پێناسە دەكات كە ئیمانداران و ئومەتی محمد ﷺ كەسانێكن دۆست و پشتیوانی یەكترن و پشتگیری یەكتر دەكەن لەسەر فەرمان كردن بە چاكەو ڕێگە گەتن لە خراپە و...هتد.

ئەو ڕاستی یەش بۆیە پێویستە بیزانین چونکە ئێستا کـاری ئیسـلامیی (العمل الأسلامي) کەسانێك دەیانەوێ بیخەنە ژێر پرسیارەوە کە ئایا ئیسلام کاری ڕێکخراوەیی دەوێ؟! ئایا ئیسلام پێویستی بەوە هەیە کۆمەڵ و حیزبی هەبێ؟! ئایا ئیسلام پێویستی بەوە دەکات خەڵکی بۆ بهۆنرێتەوە؟! هەروەها چەندین پرسیاری سەیر و سەمەرەی لەو جۆرە، ئنجا کێش دەیەوێ ئاوا کاری ئیسلامیی بخاتە ژێر پرسیارەوە؟! بێگومان ئەوانە دوو جۆرە کەسن، یەکـەم: بێ بڕوایەکی فێڵزان، دووەم: مسوڵمانێکی نەزان!!

بۆ عەلمانی یەکان زۆر شتێکی چاکە کار و باریان ڕێك و پێـك (مـنظم) بێت، بە ڕێکخراوەیی کار بکەن و دەیان شێوەی ڕێکخستن و هۆنینەوە پێکەوە لێك گرێدانی خەڵك و جەماوەر لە کار و باریان دا بێت، بەڵام ئەگەر خەڵکی مسوڵمان و دینـدار ویسـتی لەسـەر بناغـەو بنچـینەی دیـن و قورئـان و سوننەتەکەی کاری خۆی ڕێك بخات، ئەوە نیشانەی پرسیاری دەکەوێتە سەر!! بە بیانووی ئەوەی کە دین پێویستی بە سەر و بەر و ڕێکخستن و ڕێك و پێکی نیە!!

ئەوە لە ڕاستی دا کەسانێکی ناحەز دەیانەوێ کڵاو لەسەری مسـوڵمانان بنێن بۆیە پرسیاری لەو جۆرە دەوروژێنن! ئەگـەرنا بۆچـی غـەیری ئیسـلام پێویستی بە سەر و بەر و ڕێکخستن و ڕێکخراو (تنظیم و ترتیـب) هـەبێت بەڵام ئیسلام پێویستی پێ نەبێت؟! مەگەر جێگرەوە (بدیل) بۆ ڕێکخسـتن و ڕێك و پێکی تەنیا پاشاگەردانی و بێ سەرە و بەرەیی نیە؟!

ئنجا مسوڵمانی نەزانیش زۆرجار دەکەوێتە ژێر کاریگـەریی و چەواشـە کاری و پڕوپاگەندەی ناحەزانی ئیسلامەوە، کەسانێکی نـەزان و سـاویلکە و فەقیر حاڵ کە خۆشیان بە دڵسۆزی دین دەزانن، بەڵکو زۆرجار بانگەشەی ئەوە دەکەن کە هەر ئەوانن شوێن کەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ ، هەر ئەوانن

بە دوای پێشینەی چاك (السلف الصالح) دەكەون و هەر ئەوانن باش هەوڵ دەدەن بۆ بووژاندنەوەی قورئان و سوننەت!!

بەڵام ئایا ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ پاشاگەردانیی و بێ سەرەو بەرەیی بووە؟! ئایا دەگەونجێ بە بێ ڕێك و پێكی و ڕێكخستن (نظام و تنظيم) قورئان و سوننەت ببوژێنرێتەوە و شەریعەتی خوا بەرپا بكرێت؟!

وە ئایا ئەو كارە بە خەڵكێكی پێكەوە جۆش دراو و پێكەوە هۆنراوە و بە خەڵكێكی تۆكمە و ڕێك و پێك نەبێ ئەنجام دەدرێ؟!

ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ كاری خۆی لەسەر بناغەی كۆمەڵێكی توند و تۆڵ بنیات نەناوە؟! وە ئایا كۆمەڵو كۆمەڵگای ئیسلامیی یەكەمی لەسەر بناغەی خەڵك پێكەوە هۆنینەوە و بە یەكەوە پەیوەست كردن بنیات نەناوە؟!

ئەگەر تەماشای هەموو ئەو پێكهێنەرانە بكەین كە كاری ڕێكخراوەیی پێك دێنن، وە پاشان بەراوردی بكەین لەگەڵ كاری پێغەمبەر دا ﷺ هەموو مەرجەكانی كاری ڕێكخراوەیی لە كاری پێغەمبەر دا ﷺ دەبینین: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ (٣) ساڵان بە شێوەی نهێنیی بانگەوازی كردوە وەك لە سەرجەم سەرچاوەكانی ژیانی پێغەمبەر دا هاتوە بە تایبەت (سيرة إبن هشام).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە هەردوو حاڵەتی بانگەوازی نهێنی و ئاشكرادا شوێنێكی تایبەتی هەبووە بنكە و بارەگایەكی هەبووە بۆ تێدا سازدانی كۆڕ و كۆبوونەوە كە بریتی بووە لە خانووی (الأرقم بن أبي الأرقم) لە نزیك كێوی (صفا) وە، كە ئەوە بوو تا دوای ئاشكرا كردنی بانگەوازی ئیسلامیشماڵی ناوبراو هەر شوێنی كۆبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان بووە وەك لە مسوڵمان بوونی (عمر بن الخطّاب) دا خوای لێ ڕازی بێ دەر دەكەوێ، كە دوای ئەوەی خوا ئیمانی دەخاتە دڵ، دەڵێ دەمەوێ مسوڵمان بم ئایا محمد ﷺ

لە کوێیە؟ پێشانم بدەن ئنجا شوێنەکەی پێ دەڵێن کە لە ماڵی (الأرقم بن أبي الأرقم)ە، کەواتە دیارە پێغەمبەر بە شێوەی پەنهان و نهێنی کۆبوونەوەی لەگەڵ هاوەڵانی کردوە هەرچەندە ئەو کاتە دوای ئاشکرا کردنی بانگەواز و کاری ئیسلامیش بووە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لە هاوەڵانی بەرێزی وەرگرتوە، پەیمانیان پێداوە، وە گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەریی یان بۆی هەبووە، پێغەمبەر ﷺ بەردەوام پەروەردەی کردوون و تێی گەیاندوون، ئاڕاستە و ڕێنمایی کردوون، مشووری لێ خواردوون و سەرپەرشتیی کردوون ....هتد.

واتە ئەگە تەماشای پێکهێنەرەکانی کاری ڕێکخراوەیی بکەین و دوایی تەماشای کاری پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین، دەبینین کاری پێغەمبەر ﷺ کارێکی ڕێك و پێك (منظم و مرتب) بووە و فەوزاو پاشاگەردانیی و بێ سەرەو بەرەیی نەبووە!

جا لێرەداو لە ئەنجامی ئەم برە توێژینەوەیەدا بۆمان دەردەکەوێ کە کاری ئیسلامیی بەشێکە لە مسوڵمانێتی مان، واتە شتێکی زیادە نیە لە مسوڵمانێتی، بەڵکو بەبێ خەم خواردن و مشوور خواردن لە ئیسلام لە کاتێك دا کە حوکمی پێ ناکرێ لە نێو مسوڵمانان دا و لە کاتێکدا کە شەرعی خوا بەسەریانەوە سایەو سێبەر نیە، بێگومان بەبێ مشوور خواردن و خەم خواردن لەو ڕاستی یە ئینسان نابێتە مسوڵمان، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (( مَن أصبَح لا يهتمّ للمسلمين فَلَيس مِنهم)) رواه الطبراني

واتە: هەر کەسێك ڕۆژ بکاتەوە و گرنگی نەدات بە کاری مسوڵمانان لەوان نیە.

ئنجا ئەو هەموو ئایەتانەی خوای كاربەجێ كە فەرمان دەكەن بە یەكڕیزی و برایەتی بە هاوكاری پێكەوە كردن لەسەر هەرچی چاكەكاری و پارێزكاری یە بۆ نموونە:

﴿..وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى ..﴾ (المائدة ـ٢)

واتە: هاوكاری یەكتر بكەن و دەستبار بۆ یەكتری بگرن لەسەر هەر شتێك كە چاكەكاریی و پارێزكاری یە.

وشەی (بِرّ) واتە هەر شتێك كە سوودی هەبێ بۆ خەڵك، (تقوی)ش هەر شتێكە كە ببێتە مایەی پارێزران لە تووڕەیی و تۆڵەی خوا، خوای زانا و توانا فەرمانی پێكردووین كە هەر شتێك چاكەكاریی بێ و سوودی بۆ خەڵك هەبێ وە هەر شتێك پارێزكاریی بێ لە تۆڵە و سزای خوا، ئێمە هاوكاری یەكتری تێدا بكەین و دەستبار بۆ یەكتر بگرین و پشتی یەكتری لەسەر بگرین.

جا ئایا هیچ چاكەیەك لەوە چاكتر هەیە كارێك بكەین شەریعەتی خوا حاكم بێت؟ یان هیچ چاكەیەك لەوە چاكتر هەیە كە خەڵك لە دین تێبگات و پابەند بێ بە شەریعەت و بەرنامەی خواوە؟! وە هیچ چاكەیەك لەوە چاكترە كە ئەو ناشەرعی یانەی دەبنە هۆی گەندەڵ بوون و پووچەڵ بوونی مسوڵمانان لە دنیا دا و دەبنە هۆی شەرمەزاریی و بەد بەختی یان لە دنیا و دوارۆژدا ئەو خەڵكە لەوە دەرباز بكرێت بهێنرێتە ژێر سایەی شەریعەتی خواوە؟!

بێگومان هیچ چاكەیەك و هیچ تەقوایەك لەوە بەرزتر نیە، بۆیە پێویستە لەسەرمان كە هاوكاری یەكتری لەسەر بكەین، ئنجا ئایا چۆن هاوكاری پێكەوە ▪▪كەین، ئەگەر ئێمە پێكەوە پەیوەست و تەبا و لەبار و ڕێك و پێك و تۆكمە و پێكەوە جۆشدراو نەبین؟! یان سەرەو بەرەیەك لە ئیش و كارمان دا نەبێ و گەورە و بچووكی نەبێ؟!

## تەوەرەی دووەم:

## سێ پایەی سەرەكی كاری ئیسلامیی:

### (سەركردە، پێشەنگ، بنكەی جەماوەریی)

برایانی بەڕێز و خۆشەویستم! كاری ئیسلامیی سێ كۆڵەكە و پایەی سەرەكی و بنەڕەتیی هەن، كە بەبێ ئەو سێ پایە سەرەكی یە كاری ئیسلامیی نە سەردەگرێ نە بەردەگرێ!

١- هەبوونی سەركردە و سەركردایەتی (قیادة).

٢- هەبوونی كۆمەڵێكی پێشەنگ، كەسانێك كە پێشەنگ بن، ڕێ شكێن و ڕێ پشاندەر بن.

٣- هەبوونی بنكەو پێگەیەكی جەماوەریی.

### پایەی یەكەم:

ئەگەر تەماشای كاری پێغەمبەر ﷺ بكەین، جارێكی دیكەش، دەبینین پێغەمبەر ﷺ كە سەركردەو چاو ساغ و براگەورە بووە، كاتێك دەست بەكار بووە، پێشێ خوای كاربەجێ فەرمانی بە خۆی كردوە و فەرموویەتی:

﴿بسم الله الرحمن الرحيم اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥)﴾ (العلق).

ئەم پێنج ئایەتە یەكەمین كۆمەڵە ئایەتێك بوون كە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتوونە خوارێ.

کەواتە: بۆ ئەنجامدانی کاری ئیسلامیی بەر لە هەموو شتێك دەبێ کەسێك هەبێ هیدایەتی خوای وەرگرتبێ و حاڵی بووبێت کە ئەرکی لەم ژیانەدا چی یەو بۆچی هاتۆتە ئەم ژیانەوە، لە کوێ وە هاتوە بۆ کوێ دەچێ؟! دەبێ چی بکات و چۆن بژی؟ چونکە ئێمە دەبینین خوای پەروەردگار و کاربەجێ ئەو هیدایەتە دەخاتە دڵ و دەروونی پاك و موبارەکی محمد ﷺ، دوای ئەوە کە هیدایەتی خوای پەروەردگار وەردەگرێ، ئەوجار خوای بەخشندە فەرمانی پێ دەکات و (٧) ئایەتی سەرەتای سوورەتی (المدثر)ی بۆ دەنێرێتە خوار، کە بەڕای کۆ ڕا یاخود زۆرینەی توێژەرەوانی قورئان و مێژوونووسان ئەم (٧) ئایەتە دووەمین ئایەتانێکن کە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتوونە خوارێ کە دەفەرموێ:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١) قُمْ فَأَنذِرْ (٢) وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤) وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ (٥) وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ (٦) وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ (٧) ﴾ .

دیارە پێنج ئایەتی یەکەمی لە سەرەتای سوورەتی (العلق) کافی بوون بۆ ئەوەی دڵ و دەروونی موبارەك و بێگەرد و فیطرەتی پاکی محمد ﷺ ئەو ڕاستی یانەی کە ئیمان و عەقیدە دەچێتەوە سەریان یان بناغەی ئیمان و عەقیدەن هەموویان هەزم بکات و وەریان بگرێ، دوای ئەوە یەکسەر خوا فەرمانی پێکردوە و ئەو حەوت ئایەتانەی سەرەتای سوورەتی (المدثر)ی بۆ ناردوونە خوار و فەرمانی پێدەکات کە: ئەی ئەو کەسەی کە خۆت لە نوێنەوە پێچاوە هەستە، خەڵك وریا بکەوە!

هەڵبەتە بە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان دابەزینی ئەو دوو کۆمەڵە ئایەتە تەنیا (١٠) ڕۆژیان نێوان بووە، لە (٢١)ی ڕەمەزان پێنج ئایەتی

سەرەتای سووڕەتی (العلق) بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزیون، لە یەکی مانگی (شوال)یش سەرەتای سووڕەتی (المدثر)ی بۆ دابەزیوە[1].

کەواتە دەبێ کەسێك هەبێ خۆی هیدایەتی وەرگرتبێ، بۆخۆی بە ڕێ یە بزانێ و ڕێیەش پیشانی خەڵك بدات، هیدایەتی وەرگرتبێ و بتوانێ (هادي)و هیدایەت دەر و ڕێ پیشاندەری خەڵك بێ.

پایەی دووەم:

کۆمەڵێکی هەڵبژاردە کە بتوانن پێشەنگ و پێشڕەو بن، بتوانن سەرقافڵە بن و ڕێ شکێن بن، وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی) کە ئێمە ئەو ئومێدەمان لە (کۆمەڵی ئیسلامیی) و هەر کۆمەڵێکی دیکەی ئیسلامیی و هەر جم و جۆڵێکی دیکەی ئیسلامیی لە کوردستان و دەرەوەی کوردستانیش ئەوەیە کە پێشەنگ بن، ئەگەر نا ئیسلام ومسوڵمانەتی لە هیچ کۆمەڵێکی ئیسلامیی دا قەتیس نەماوە و لەو دا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵام پێویستە ئەو کۆمەڵ و لایەنە ئیسلامیی یە پێشەنگ و سەرقافڵەو ڕێ شکێن و ڕێ پیشاندەر بێت.

پێغەمبەر ﷺ چی کرد؟! دوای ئەوە کە خۆی لەو هیدایەتە خوایی یە بەهرەمەند بوو، یەکسەر دەستی کرد بە پەروەردە کردن و پێگەیاندنی کۆمەڵێك خەڵکی هەڵبژاردە کە ببنە پێشەنگ، بۆ وێنە: ئەبوبەکر ، عەلی ، زەید، خەدیجە، دوای ئەوان عوسمان، طلحة، زبیر، سعد ، (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف، پاشان ئەوانی دی عومەری کوڕی خەطاب و... وە هەروەها، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، هەتا کۆتایی ئەو لیستە کە بریتی بوون لە (٤٠-٥٠)

---

(١) لە زنجیرە دەرسەکانی ( پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ ) دا ئەم مەسەلەیەم جوان ڕوونکردۆتەوە.

کەسێك، ئەوەبوو وردە وردە لە قۆناغی مەککی دا بوونە نزیکـــەی (٢٠٠) کەسێك یاخود شتێك زیاتر.

جا بێگومان ئەوە ـ واتە تێگەیاندن و پێگەیاندنی کۆمەڵێکی پێشەنگ ـ پایەی دووەمی کاری ئیسلامیی یە، پێغەمبەر ﷺ وای کـردوە و ئێمـەش دەبێ وابکەین، خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (الأحزاب ـ ٢١)

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆ ئێوە پێشڕەوی و سەرمەشقی یەکی چاك و باش هەیە بۆ هەرکەسێك بە ئومێدی ڕەحمەت و بەزەیی خوا بێ، وە بە ئومێدی پاداشـــت و بەهەشتی خوا بێ و زۆر یادی خوا بکات.

واتە بۆ هەر مسوڵمانێك! چونکە خـوا دەربـارەی دەغـەڵ (منافق)ەکـان دەفەرموێ: ﴿ وَلاَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلاَّ قَلِيلاً ﴾ (النساء ـ ١٤٢). یـاخود لـەبارەی کافرانەوە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا ﴾ (یونس ـ ٧).

واتە: بە ئومێدی دیداری خوا و پاداشتی خوا نـین، بـەڵام مسـوڵمان بـە ئومێدی پاداشتی خوایە و زۆریش یادی خوا دەکات، وەك فەرموویەتی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾ (الأحزاب ـ ٤١).

کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرمەشقە بۆ مسوڵمانان، ئایا تـەنیا بـۆ خوو ڕەوشتی چاك و جوانیان؟ نەخێر، بۆ هەموو شتێکیان کە دینداری پێـك دێنێت، بۆ دینداریی ومسوڵمانەتی یان بە هەموو بەشەکانیەوە، دەبێ ئیمان و عەقیدەمان وەك هی پێغەمبەر ﷺ بێ، وە دەبێ جەنگ و جیهاد و شـەڕ و ئاشتی و حوکم و سیاسـەتمان هـەمووی وەك هـی پێغەمبـەر ﷺ بـێ، وە هەروەها ... هتد.

**پایەی سێیەم:**

**پایەی سێیەمی کاری ئیسلامیی بریتیە لـە هـەبوونی بنکـە و پێگـەی جەماوەریی.**

ئەگەر مسوڵمانانی مەککە ، ئەو کۆمەڵە مسوڵمانە هەڵبژاردەیـەی کـە پێغەمبەر ﷺ لە مـاوەی سـێزدە (١٣) سـاڵی ڕەبـەق دا پێـی گەیانـدن، پەروەردەی کردن، بوونە پێشەنگ و سەرقافڵە ، ئەوە مسوڵمانانی (یثرب)یش کە دوایی ناوی لێنرا (مەدینە) لە ڕاستی دا ئەوانیش بنکـەی جـەماوەریی پێغەمبەریان پێکهێنا ، دیارە هەندێکیشیان لە پێشەنگەکان بوون، چـونکە هەندێکیان لە ساڵی دەیەم و یازدەیەمەوە مسوڵمان بووبوون و پەیمانیان بـە پێغەمبەر ﷺ دابوو.

بەڵێ مسوڵمانانی (یثرب) بوونە بنکەی جەماوەریی پێغەمبەر وەك خوای بێ هاوەڵ وایان وەسف دەکات و دەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ (الحشر-٩).

مەنزڵگەیان بۆ ئیسلام دروست کردبوو، ئیمانیان تێدا چەسپاندبوو پێش کۆچکەران، بنکەی جەماوەریی یان دروست کرد و (دار الأسلام)یان بنیـات نابوو،ئنجا پێغەمبەری سەرکردە ﷺ هەڵسـا ئـەو پێشـەنگە مسـوڵمانەی لەگەڵ ئەو بنکە جەماوەریی یەدا لێك دا و بوون بە کۆمەڵگای ئیسلامیی، وە دەوڵەت و کیانی ئیسلامییش هەمیشە لە هەناوی کۆمەڵگای ئیسلامیی دا پەیدا دەبێ، دەبێ کۆمەڵگای ئیسلامیی هەبێ، ئنجا دەوڵـەت و کیـانی ئیسلامیی پەیدا دەبێ.

دیارە کۆمەڵگای ئیسلامییش لە سێ شت پێك دێت: لە سـەرکردەیەکی مسوڵمان یان لە قیادەیەکی ئیسلامیی سەر ڕاست، وە خەڵکێکی پێشەنگ و سەرقافڵە و ڕێ پێشاندەر ، وە بنکەیەکی جەماوەریی، دەبێ ئەو سێ یە هەبن و

هەرسێك بەیەكەوە ئاوێتە بن، ئنجا چاوەڕێی ئەوەبین كە شەریعەتی خوا پیادە بێ، چاوەڕێی ئەوە بین كە دینی خوای بەرز و مەزن وەك خوا ویستوویەتی لە نێو مسوڵمانان دا باڵادەست بێ، چونكە دینی خوا بۆ ئەوە نەهاتوە كە مەحكووم بێ، خوا (جل شأنه) دینی خۆی ناردوە بۆ ئەوەی حاكم بێ وەك فەرموویەتی:

﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا ﴾ (الفتح ـ٢٨) .

واتە: خوا ئەو زاتەیە پێغەمبەری خۆی ﷺ ڕەوانە كردوە بە هیدایەت و بە دینی ڕاستەوە (بە بەرنامەی ڕاستەوە) بۆ ئەوەی بەسەر هەموو بەرنامەكانی دیكەدا زاڵی بكات...

دەبێ ئیسلام فەرمانڕەوا و حوكمڕان و باڵادەست بێ، بەڵام با دین و بەرنامەكانی دیكەش هەبن، ئیسلام ڕێگا ناگرێ خەڵكی دیكەش دینی هەبێ، بەمەرجێك دینەكەی حاكم نەبێ بەسەر ئیسلامدا، چونكە ئیسلام ڕێگە بە غەیری خۆی دەدات هەبێ، بەڵام غەیری ئیسلام ڕێگا نادات ئیسلام بوونی هەبێ، ئیسلام ڕێگای داوە كە لە نیشتیمانی مسوڵمانان دا جوولەكە و نەصرانی بژین، زەردەشتی و ئاگرپەرست و مەجووسی هەبن و بژین، هەموو كەمایەتی یە دینی یەكان هەبوون، بەڵام لە هەر شوێنێك غەیری ئیسلام دەسەڵاتی بووبێ مسوڵمانانیان قەڵاچۆو سەركوت كردوە و ئیسلامیان ڕیشەكێش كردوە، (ئەندەلوس)ی ڕابردوو و (ئیسپانیا)ی ئێستاش چاكترین بەڵگەو نموونەیە لەو بارەوە كە ئیسلام هەشت سەدە، هەشت سەد (٨٠٠) ساڵ تێیدا حوكمڕان بوو نەصرانی یەكان هەر لەسەر ئایینی خۆیان بوون، بەڵام كاتێك نەصرانیەكان بوونە حوكمڕان مسوڵمانانیان سەرپشك كرد لە نێوان: كوژران و بوونە نەصرانی دا!!

## تەوەرەی سێیەم:

# ڕێكخستن چییەو چۆن دەكرێ؟!

برایانی خۆشەویست!

لە ڕاستی دا هەم فەڕاهەم هاتنی خەڵكێكی پێشەنگ و سەرقافڵە و هەم دروست بوونی بنكەیەكی جەماوەریی، بە ڕێكخستن دەكرێ!

بۆیە با بزانین ڕێكخستن چی یەو چۆن دەكرێ؟!

ئەگەر بە شێوەیەكی سادە و بە كورتی و پوختی پێناسەی ڕێكخستن بكەین دەڵێین: ڕێكخستن بریتی یە لە پێكەوە هۆنینەوە و پێكەوە پەیوەست كردنی ئەو تاكانەی كە هیدایەتی خوایان وەرگرتوە و ئاڵقەبەند كردنیان و زنجیر لێ پێكهێنانیان.

بۆ وێنە: دەنكە تەسبیحێك بهێنە ئەگەر بە هۆی دەزووەوە نەبێ كە بەنێو هەموویان دا ڕۆیشتوە و لە هەموویان تەسبیحێكی پێكهێناوە، تەسبیح دروست نابێ! یاخود زنجیرێك بێنە ئەگەر ئاڵقەكانی بە یەكەوە پەیوەست نەبن پێی ناگوترێ زنجیر، تەسبیحەكە داوە دەزووەكەی لێ دەربێ هەر دەنكەی دەكەوێتە لایەك و پەرش و بڵاو دەبێ...

بۆیە من دەڵێم: ئەو كەسانەی كە دەڵێن ئیسلامیی یەكان نابێ كاری ڕێكخراوەیی یان هەبێ، بێگومان دەیانەوێ مسوڵمانان پرژو بڵاو بن، دەیانەوێ ئەو زنجیرە هەر ئاڵقەیەكی لە شوێنێك بكەوێ! ئەو تەسبیحە هەر دەنكەی لە كون و قوژبنێك فڕێ بدرێ و بزر ببێت!! لە حاڵێكدا كە

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: ((فأنَّ يد الله على الجماعة[1])) یان ((يد الله مع الجماعة[2]))وە لە فەرموودەیەكی دیكە دا دەفەرمویٚ: ((عليكم بالجماعة وإياكم والفرقة فأن الشيطان مع الواحد وهو من الأثنين أبعد[3])) دوایی دەفەرمویٚ: ((إنما يأكل الذئب من الغنم القاصية[4]))، ئەم فەرموودانەش هەموویان ڕاست (صحیح)ن.

كەواتە ئەگەر مسوڵمانان دابڕاو بن لە یەكتر، گورگ دەیانخوات! تەماشا بكەن عەلمانی یەكان لەسەر حیسابی كیٚ خۆیان دروست كردوە؟ مەگەر هەر لەسەر حیسابی ڕۆڵەی مسوڵمانان نەبووە؟! چونكە مسوڵمانان پرژ و بڵاو بوون و بیٚ سەر و بەر بوون و بە یەكەوە ئاڵقەبەند نەكراون هەر حیزب و لایەنە هەڵساوە ڕۆڵەی مسوڵمانی بۆخۆی بردوە و دوایی بە شیٚوەیەكی دیكە دایڕشتۆتەوە و ئیمان و ئیسلامیشی لەبیر بردۆتەوە! تا بەو شیٚوەیەی لیٚ كردوە كە بە كەڵكی خۆی بیٚ و كردوویەتی بە خشتیٚك لە بینای خۆیدا!!

بەڵام ئایا مسوڵمانی تیٚگەیشتوو و ئاڵقەبەندكراوی پەروەردەكراو، كەس دەتوانیٚ تەماعی تیٚبكات؟ وە بەكەڵكی كەسی دیكە دیٚ جگە لە ئیسلام؟ نەخیٚر!!

---

(١) اخرجه النسائي عن عرفجة برقم: ٤٠٢٠، واتە: دەستی خوا لەسەر كۆمەڵە (واتە: خوا مسوڵمانانی كۆمەڵ بوو دەپاریٚزیٚ).

(٢) رواه الطبراني وقال الهيثمي رجاله ثقات، واتە: دەستی خوا لەگەڵ كۆمەڵ دایە (واتە: پشتگیریی یان دەكات).

(٣) اخرجه الترمذي عن إبن عمر عن ابيه رضي الله عنهما برقم: ٢١٦٦، و قال حديث حسن صحيح، واتە: كۆمەڵ بن و خۆتان لە پەرتەوازەیی بپاریٚزن چونكە شەیتان لەگەڵ تاك دایە و لە دووان دوورترە.

(٤) رواه احمد، واتە: گورگ تەنیا زەفەر بە مەڕی لە ڕان دابڕاو دەبات و دەیخوات.

جا كەواتە مەبەست لە ڕێكخستن ئەوەیە كە ئێمە تاك تاكی مسوڵمانان و ورد و درشتیان، پیاو و ئافرەتیان لەهەر ئاستێك دابن، لەهەر توێژێك دابن، هەوڵ بدەین بە یەكەوە ئاڵقە بەندیان بكەین و بە یەكەوە پەیوەستیان بكەین، خوای بە بەزەیی ئاوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:

﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (٦١) وَإِن يُرِيدُواْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللّهُ هُوَ الَّذِيَ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ (٦٢) وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً مَّا أَلَّفَتْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٦٣)﴾ (الأنفال)

دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دوژمن و ناحەزانت ملیان بۆ ئاشتی دا تۆش لای ئاشتی بگرە، پشتیش بە خوا ببەستە بێگومان خوا بیسەرە و زانایە وە ئەگەر ویستیان هەڵت خەڵەتێنن و فێڵت لێ بكەن (بەوەی كە باڵەشۆڕە دەكەن بۆ ئاشتی و مەبەستیشیان پێی فێڵ كردن بێ) ئەوە تۆ خوات بەسە ـ جا لێرەدا خوای پەروەردگار دوو شتمان ڕوون دەكاتەوە كە بۆچی خوا بۆ پێغەمبەری خۆی بەسە- پێغەمبەری خوا ﷺ دوو سەنەدی هەبووە:

<u>یەكەم:</u> دەفەرموێ: ﴿هو الذي أيدك بنصره﴾ خوا (جل شأنه) یارمەتی تایبەتی خۆی بۆ ئەهلی ئیمان دەنێرێ، (أيّدك) واتە تۆی بەهێز كردوە (قوّاك) بە یارمەتی و هاوكاری خۆی!

ئەو هۆكارانە كە خوا دەیانڕەخسێنێ بە هۆی ئیمان و تەقوای خۆمانەوەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَاللّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (آل عمران ـ٦٨) یان ﴿والله ولي المتّقين﴾ (الجاثية ـ١٩) خوا لەگەڵ ئەهلی تەقوا دایە، لەگەڵ ئەهلی ئیمان دایە، بە ئەندازەی ئیمان و تەقوامان خوا لەگەڵمان دا دەبێ

بە شێوەیەك كە چاوەڕوان ناكرێ چەند هۆكارێك دەڕەخسێنێ كە مەرج نیە ئێمە عەقڵمان پێ یان بشكێ.

دووەم: سەنەدی دووەم - بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە بۆ هەر كەسێك كە لە كاری ئیسلامیی دا شوێن ڕێبازی ئەو بكەوێ- ئەوەیە ﴿هو الذي أيّدك بنصره وبالمؤمنين﴾ وە خوا تۆی بەهێز كردوە و پاڵپشتیی تۆی كردوە (بالمؤمنين) بە هۆی ئیمانداران‌ەوە، چ ئیماندارێك؟ كە سانێك كە دوایی پێناسەی كردوون لە ئایەتی دواتر فەرموویەتی: ﴿وألف بين قلوبهم﴾ ئەو ئیماندارانەی كە دڵی بەیەكەوە جۆش داون، واتە ئیماندارانێكی پێكەوە جۆشدراو و پێكەوە ئاڵقەبەندكراو و پێكەوە زنجیربەند و پێكەوە ڕیزبەستوو! نەك ئیماندارایكی پرژ و بڵاوی بێ سەر و بەری كەس نازانێ چۆن! ئەوانە هێز و توانایان نیە تاكو ببنە سەنەد و پاڵپشت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ا.

مسوڵمانانێك دەتوانن ببنە سەنەد و پاڵپشت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە بۆ هەر كەسێك كە بە ڕێبازی پێغەمبەر دا دەڕوات بۆ ئەوەی دینی خوا حاكم بێ، شەریعەتی خوا سایە و سێبەر بێ، كە ئەو مسوڵمانانە پێكەوە جۆشدراو بن، ڕیز بەستوو بن و زنجیر ئاسا بن.

ئایا ئەو دڵ بەیەكەوە جۆشدراوانە، ئەو دڵ بە یەكەوە بەستراوانەی ئیمانداران بە هۆی پارەوە بووە؟! یان بە هۆی ئیمانەوە؟! ماوەیەكە لە گەشت و گەڕانم دا بە مەبەستی بەسەركردنەوە و بە دوا داچوونی ئۆرگانەكانی خۆمان، دەبینم هەموویان زاڵەیانە لە چنگ نەبوونی بێ دەرامەتی و بە دەستەوە نەبوونی ئامێر و وەسیلەی تازە و پێویست بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش و كارەكانیان،

كە بێگومان وایە و من ئەوە دەسەلمێنم، بەڵام نابێ وا بیر بكەینەوە و پێمان وابێ ئەگەر پارەمان نەبوو ناتوانین دینداریی و كاری ئیسلامیی بكەین!!

چونكە هیچ كەس لە پێغەمبەری خوا ﷺ و لە هاوەڵە بەڕێزەكانی هەژارتر و نەدارتر نەبووە،هیچ كەسێكیش وەك ئەوان كاری بۆ ئیسلام نەكردووە! چەند هەژار بین و چەندین هێندەی دیكە نەدار بین وەك هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ نابین، بۆ وێنە ئەوان لە برسان گەڵای درەختیان خواردووە! لە غەزای (ذات الرقاع) دا، بۆیەش ئەو ناوەی لێ نراوە چونكە هەموو بنە پێ یان پێستی لێ بۆتەوە و پڵ پڵ بووە، یاخود پەڕۆیان لە پێ یەكانیان ئاڵاندوە!

كەواتە خوای باڵادەست بە هۆی چی یەوە دڵی ئەو ئیماندارانەی پێكەوە جۆش داوە و بە هۆی چی یەوە پێكەوە پەیوەست و ئاڵقەبەندی كردوون؟! بە هۆی ئیمانەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً مَّا أَلَّفَتْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ﴾ (الانفال ـ٦٣)

واتە: ئەگەر ئەوەی لەسەر زەوی دایە لە سەروەت و سامان هەمووت پێ بەخشیبان و بە دیاری و خەڵات داباتنێ بۆ هاندان و دڵخۆشكردنیان ئاوا دڵیانت پێكەوە گرێ نەدەدا، وەك بە هۆی ئیمانەوە دڵیان پێكەوە گرێ دراوە!!

برا خۆشەویستەكانم! برایەتی و ئولفەت و یەكتر خۆشویستن و یەكریزی ئێمە دەبێ لە ئیمانەوە هەڵقوڵابێت، نەك لە پارە و سامان و پلە و پایە و دەسەڵات، نابێ ئەگەر پارە نەبوو بیر لە دووركەوتنەوە لە كاری ئیسلامیی بكرێتەوە، یان ئەگەر پارە هەبوو كۆبین و ئەگەر پارە نەما بڵاوەی لێ بكرێ! مانای وایە لە پارە كۆبووینەتەوە، دەبێ ئێمە لە ئیمان و ئیسلام كۆبینەوە، دەبێ خۆشەویستی خوا و ترسان و شەرم كردن لە خوا و مشوور و خەمخواردن لە دینی خوا ئێمە كۆبكاتەوە!

دیارە لێرەدا من ناڵێم خەڵك هەر بە هەوا دەژیەت! بەڵام دەڵێم چەندەت لە دەست دێت ئەوەندە بكە، دەڵێم نەداریی و هەژاریی یاخود كار پێ نەسپێردران نابێ بكرێنە پاساوی نەكردنی كاری ئیسلامیی، یاخود برای وا هەبێ بڵێ: جا من هیچ پایە و مەنسەبێكم نیە! جا با هیچ مەنسەبێكی حیزبی و ڕێكخراوەییشت نەبێ، چۆن نیتە ئەدی مسوڵمان نی؟! ئەدی شوێنكەوتووی پێغەمبەر ﷺ نی؟! با، باشە مەنسەب هەیە لە مسوڵمانەتی گەورەتر؟! پێغەمبەرانی پایە بەرزی وەك: (نوح، إبراهيم، موسى، عيسى، محمد) عليهم الصلاة والسلام هەر كامێكیان خۆی بە (مسوڵمان) وەسف كردوە[1]، وە خوا فەرموویەتی: ﴿ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَذَا ﴾ (الحج -٧٨).

بەڵێ: هەر كەسێك خواپەرست بێ مسوڵمانە، جا پلە و پایە لە مسوڵمانەتی بەرزتر هەیە؟! ناوونیشان لە ئیمان و مسوڵمانەتی گەورەتر و بەرزتر هەیە؟!

كەواتە: ڕێكخستن بریتیە لە هۆنینەوەی مسوڵمانان و پێكەوە جۆشدانیان لەسەر بناغەی ئیمان و ئیسلام، ئنجا ئایا كاری ڕێكخستن چۆن ئەنجام دەدرێ؟ بە دوو شتان بە شێوەی گشتی:

<u>یەكەم:</u> دەبێ ئێمە جۆری تێگەیشتنمان بۆ دینی خوا یەك بێ لە شتە بنەڕەتی و سەرەكی یەكاندا، وەك یەك لە دینی خوا تێبگەین و تێگەیشتنی هاوبەشمان هەبێ لەو شتە بنەڕەتی یانەدا نەك لە وردەكاری یەكان (التفاصيل) دا.

---

(١) بۆ وێنە: (نوح) عليه السلام فەرموویەتی: ﴿...وأمرت أن أكون من المسلمين﴾ (يونس -٧٢) وە (إبراهيم و إسماعيل) عليهما السلام فەرموویانە: ﴿ ربنا واجعلنا مسلمين لك...﴾ (البقرة -١٢٨).

دووەم: یەك نیاز و مەبەست ئێمە بجوڵێنێ لە دڵەوە، وە یەك ئامانجی دونیاییش لەبەر چاو بگرین و بەرەو ڕووی هەنگاو بنێین، یەك نیاز و مەبەست لە دڵەوە ئێمە بجووڵێنێ كە بریتی یە لە بەرپا كردنی شەریعەتی خوا و عیززەت پەیدا كردنی دینی خوا، وە ئەوە كە مسوڵمانان بە پێی دینی خوای پەروەردگار ژینی خۆیان ڕێكخەن.

جا ڕەنگە ئێمە لێرەدا دوو ئیشكالمان بێنە پێش:

یەك: وەك بیستوومە لە خەڵكی خۆمان، دەگوترێ: باشە لە كاتێك دا ئێمە مزگەوتەكانمان بە دەستەوە نەماون، شوێنمان نیە دەرسی تێدا دابنێین و پەروەردە و فێركردنی تێدا ئەنجام بدەین و كۆڕ و كۆبوونەوەی تێدا ساز بكەین! چۆن چۆنی كار و چالاكی ئیسلامیی مان ئەنجام بدەین؟!

دەڵێین: بەڵێ ئەو ڕێگەیەیان لێ گرتووین برادەرانی عەلمانی، كە زوڵمێكی زۆر گەورەیە لە ئەهلی ئیسلامی دەكەن، بار و مەیخانە یان كردۆتەوە، بەڵام مزگەوتەكان بە ئەهلی ئیسلام ڕەوا نابینن، دەشزانن كە بار و مەیخانەكان شوێنی ئێمە و مانان نین و بە شایستەی خۆمانیان نازانین، ئێمە تەنیا شایستەی مزگەوتین و ڕێی مزگەوتیشیان لێ گرتووین كە كاری ئیسلامیی تێدا بكەین، كە لە ڕاستی دا ئەوە جۆرێكە لە وێرانكردنی ماڵەكانی خوا، خوای باڵادەست دەفەرموێ:

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَى فِي خَرَابِهَا﴾ (البقرة-١١٤)

واتە: كێ لەو كەسە زاڵمترە كە ڕێگا دەگرێ لە ماڵەكانی خوا كە یادی خوایان تێدا بكرێ، قورئانی تێدا بخوێندرێ و فەرموودەكانی پێغەمبەری تێدا بخوێندرێتەوە و مسوڵمانانی تێدا پەروەردە بكرێ، ئەوە

هەمووی یادی خوایە، کۆڕی زانستی و عیلمی یان تێدا ساز بکرێ و مسوڵمانانیان تێدا شارەزا بکرێن لە دینەکەیان... هتد.

یادی خوای پەروەردگار تەنیا هەر نوێژ نیە! ئنجا کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَسَعَى فِي خَرَابِهَا﴾

واتە: وە هەوڵ دەدات بۆ ئەوەی ماڵەکانی خوا – مزگەوتەکان- وێران بکات، وێرانکردنی ماڵەکانی خوا هەر ئەوە نیە کە بیانڕووخێنێ، وەك ڕژێمی بەعسی عەلمانی کردی بەڵکو ئەو وێرانکردنی ماددی و ڕواڵەتی یە، وێرانکردنی مەعنەویش هەیە! ئەوەیە کە مزگەوت لە نێوەڕۆك (محتوى)ی خۆی خاڵی بکرێتەوە، نەهێڵرێ مزگەوت ئەرك و وەزیفەی خۆی تێدا جێ بەجێ بکرێ، کە بریتیە لەوەی کە مسوڵمانانی تێدا پەروەردە بکرێ[1].

بەڵێ کابرای عەلمانی هیچ پەیوەنی یەکی بە ماڵی خواوە نیە، بێتە ماڵی خوا باسی عەلمانیەت بکات یان باسی سیاسەتی خۆی بکات! بەڵام ئینسانێکی ئیسلامیی و کابرایەکی مسوڵمان شوێنە سروشتی یەکەی خۆی ماڵی خوایە کە لەوێ دا وەك چۆن نوێژ دەکات ئەرکێکی شەرعی یە، ئەگەر قورئانیش لە مزگەوتدا فێر بێ و فێری خەڵکیشی بکات لەگەڵ فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەش هەر ئەرکی شەرعیی بابای مسوڵمانە.

جا ئەگەر ئەو پرسیارە بکرێ: ئێمە چارمان چی یە؟ وەڵام ئەوەیە کە خوای بەرز و مەزن نەیفەرمووە ئەگەر مزگەوت بە دەستەوە بوو کاری

---

(١) بۆ ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ئاوەدان کردنەوە و وێرانکردنی مزگەوت، سەرنجی نامیلکەی: (مزگەوتەکانی کوردستان لە نێوان ئاوەدان کردنەوە و وێران کردن دا) بدە.

ئیسلامیی بکەن و ئەگەر نەشتان بوو وازی لێ بێنن و لێی بگەڕێن! نەخێر وای نەفەرمووە، ئنجا لە بەسەرهاتی (موسی و هارون)یش دا (علیهما الصلاة والسلام) بۆ ئێمە پەند و عیبڕەتێکی باش هەیە کە لەو بارەیەوە خوای باڵادەست دەفەرموێ:

﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَاجْعَلُواْ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ (یونس -٨٧)

واتە: وەحی مان نارد بۆ (موسی) و (هارون)ی برای علیهما الصلاة والسلام کە لە میسر چەند ماڵێکتان هەبێ بۆ گەلەکەتان -گەلی بەنی ئیسرائیل- ، و ماڵەکانتان بکەن بە ڕووگە (قبلة) (شوێنی ڕوو لە خوا کردن) وە نوێژیش بەرپا بکەن -واتەبیکەن بە شوێنی خوا پەرستیی و کۆڕ و کۆبوونەوە و جێگای ڕێکخستنی کار و باری خۆتان- وە موژدەش بە بڕواداران بدە -کە لە لای خوا زۆر ئاسانە دەروویان لێ بکاتەوە و پێویستیتان بەوە نەمێنێ کە لە ماڵەکان دا بە نهێنی و پەنهانی دینداریی و مسوڵمانەتی بکەن، خوای پەروەردگار دەسەڵاتێکتان دەداتێ کە بە ئاشکرا و بە شێوەیەك کە بۆ میللەتێکی مسوڵمان شایستەیە دینداریی و مسوڵمانەتی بکەن بەبێ ترس لە غەیری خوا-.

کەواتە لە ڕاستی دا کاتێك کە ڕێی مزگەوتمان لێ دەگیرێ دەبێ ڕێی دیکە پەیدا بکەین لە ماڵی خۆماندا و لە هەر شوێنێك بۆمان دەگونجێ! دەبێ کاری ئیسلامیی بەردەوام بێ بە هەموو شێوەکانی: ڕێکخستن، ڕاگەیاندن و بانگەواز و فەرمان کردن بە چاکە و ڕێ گرتن لە خراپە . ئیسلام بە هەموو بەشەکانی یەوە دەبی بەردەوام بێ، ئەو ڕێ یەت لێ گیرا بە ڕێ یەکی دیکە دا، ئەو شێوازەت بۆ نەگونجا بە شێوازێکی

دیكە، دەبێ هەر جارە بە پێی هەل و مەرجەكە پەنا بەرینە بەر ڕێ و شێوازێكی گونجاو.

دوو: یان ڕەنگە بگوترێ: باشە ئێمە كاتی خۆی لە هەرەمی ڕێكخستن دا شانە و پۆل و ڕێكخراومان هەبوو، لە شانە و پۆل و ڕێكخراو و پاشان ناوچە و مەڵبەند پێكهاتبووین، بەڵام ڕەنگە ئێستا بەو شێوەیەمان بۆ نەكرێت!

جا كاكە مادام بەو شێوەیەی ڕابردوو نەكرێت فەرموو بە هەر شێوەیەك بیكە كە بۆت دەكرێ، گرنگ ئەوەیە ئامانجەكە لە بەر چاو بگیرێ، چونكە چۆنیەتی و شێواز و هۆكار (الكيفية والأسلوب والوسيلة) لە كاتێكەوە بۆ كاتێك و لە حاڵەتێكەوە بۆ حاڵەتێكی دیكە دەگۆڕێن، بەڵام گرنگ ئەوەیە كە ئامانجەكە نەگۆڕێ كە ئامانج ئەوەیە مسوڵمانان پێكەوە گرێ بدرێن و پێكەوە پەیوەست بكرێن! بە چ شێوازێك بۆت دەكری وا بیكە، لەسەر شێوازی پیشەیی و توێژ بۆت دەكرێ بیكە وەك توێژەكانی: مامۆستایان، قوتابیان ئەندازیاران، پزیشك و تەندروست كاران، فەرمانبەران، كاسبكاران.... هتد، وە لەسەر شێوازی لێك نزیكی جوگرافی لەسەر ئاستی گەڕەك، بازاڕ، فەرمانگە.... هتد، چۆن بۆت دەكرێ وا بیكە، گرنگ پێكەوە هۆنینەوە و پێكەوە جۆشدانی مسوڵمانانە، ئنجا هەرەم و پێكهاتەكەی گەورە بێ یان بچووك هەمووی لە شەرع دا جێی دەبێتەوە، وە لەو واقیعەی ئێستا ئێمەی تێدا دەژین كام لە شێوازەكانی ڕێكخستنی زیاتر تێدا بە كەڵك دێ، دەبێ ئەویان هەڵبژێرین.

تەوەرەی چـوارەم:

## كـــێ خـەڵكـی پێ ڕێـك دەخـــرێ؟!

ئێمە باسی ڕێكخستن و پێداویستی یەكانیمان كرد، باسی ئەوەمان كـرد كە ڕێكخستن بناغە و بنەڕەتە و هەناو و هەوێنی كاری ئیسلامیی یە، بەڵام ئایا كێ پێی دەكرێ؟! ئایا هەرچی ڕاستبۆوە دەتوانێ مسوڵمانان ڕێك بخات و بیان هۆنێتەوە؟!

خۆشەویستان! من نۆزدە (١٩) سیفەتم بۆ هێناون بۆتان سەرژمێر دەكەم كە دەبێ كادیری ڕێكخستن ئەو كەسەی هەڵدەستێ بە هۆنینەوەی مسوڵمانان و بە یەكەوە جۆشدان و پێكەوە پەیوەست كردنیـان – لـە فیكـر و تێـڕوانین (تصور)یان داو لە شتە گشتی یەكان دا و لە نیـاز و مەبەسـتیان لـە دڵ و دەروون دا، چونكە خوا باسی (تألیف القلوب)ی كردوە بەڵام باسـی (تـألیف العقول)ی نەكردوە!

عەقڵەكان جیاجیا دەبن و ڕاجیایی دەبێ لە عەقڵەكان دا و لەشـتی وردە بابەتو وردەكاری یەكان (التفاصیل)دا، بەڵام دڵەكان دەبێ پێكەوە جۆشدرا و بن و لە شتە گشتی و هێڵە گشتی یەكاندا، وە لە بنەما سەرەكی یـەكان دا دەبێ یەك بین- خۆیان پێ بڕازێنێتەوە و لە خۆی دا بیانهێنێتەدێ.

جا ئایا كێ بۆی دەكرێ كە لە شتە سەرەكی و بنەڕەتی یەكاندا عـەقڵ و بۆچوونی خەڵك یەك بخات، ئەو مسـوڵمانەی كـە دەیـەوێ ڕێكیـان بخـات و یەكیانخات و لە ئامـانج و مەبەسـت دا دڵ و دەروونیـان پێكـەوە پەیوەسـت بكات، ئایا ئەو كارە بەكێ دەكرێ؟ بێگومـان بە كەسێك كە خاوەنی كۆمەڵێك

خەسڵەت و سیفەت بێ، کە من نۆزدە(١٩)یانم لێ هەڵبژاردوون پێشکەشتانی دەکەم:

(١)- ئیمان: دەبێ بابای ئیشکەر بۆ ئیسلام خاوەنی ئیمانێکی پتەو و دامەزراو بێ چونکە ئەمر و نەهی یەکانی قورئان هەموویان بە ئیمان و ئەهلی ئیمانەوە بەستراون: ﴿ ياأيها الذين آمنوا﴾ ، ئیمان بەو پێناسەیە کە زانایانی پێشین لە قورئان و سوننەت هەڵیانهێنجاوە و گوتوویانە: (الأيمان قول وعمل، قول القلب واللسان وعمل القلب والجوارح) ئیمان چوار پێکهێنەری هەیە:

یەك: قسەی دڵ، واتە: زانین و بە ڕاست زانینی نێو دڵ.

دوو: قسەی زمان، واتە: دان پێدا هێنان.

سێ: کردەوەی دڵ، کە برتیە لە خۆشویستن و قبووڵ کردن و تەسلیم بوون و ویستن.

چوار: کردەوەی ئەندامەکان، کە بریتیە لە جێ بەجێکردن.

برایانی خۆشەویستم! ئینسان چوار هێز (قوة)ی هەیە و ئیمان پەیوەستە بە هەرکام لەو چوار هێزەوە:

١- هێزی عەقڵی هەیە، بۆ پەی پێبردنی شتەکان.

٢- هێزی دڵ (قلب)ی هەیە، بۆ ویستن و قبوڵ کردن و ڕەفز کردنی شتەکان.

٣- هێزی زمانی هەیە، بۆ دەربڕین.

٤- هێزێکیشی هەیە، بۆ جێ بەجێ کردن بە ئەندامەکان.

جا ئیمان کاتێك پێی دەوترێ ئیمان کە ڕاستی (حقيقة)ەکانی ئیسلام پەی پێ بەرێ و دەرکیان کات وەك خۆیان، ئەوە ڕەهەندی مەعریفی

ئیمانە، پاشان پاش ئەوەی كە ناسیویەتی و وەریگرتوە بە دڵ قبووڵی بێ و خۆشی بوێ و لای پەسند بێ و بۆی تەسلیم بی، ئەوەش لایەنە ئیرادیی و دەروونی یەكەی ئیمان، وە پاشان دانی پێدا بنێ بە زمان، وە دوایی بە ئەندامەكان جێ بەجێ بكرێ، ئیمان بەم شێوەیەیە بە هەر شەش پایەكانی یەوە، ئیمانی پتەو و دامەزراو.

(٢)- زانیاریی: زانیاری شەرعی و غەیرە شەرعی، واتە چەند زانیاری یەك كە لە (وحي) یەوە سەرچاوە دەگرن، ئەوە زانیاری شەرعی یەو زانیاری یەك كە لە عەقڵ و ئەزموونی ئینسانەوە سەرچاوە بگرێ پێی دەگوترێ زانیاریی سروشتی یان زانیاریی ئینسانیی، وەك: فیزیا و كیمیا و زەوی ناسی و پزیشكی و گەردوون ناسیی و كۆمەڵناسیی ، دەروون ناسیی...هتد، مسوڵمان دەبێ زانیار بێ، پاش ئیمان پێویستە زانا بێ چونكە بە بێ زانیاریی و بەرچاو ڕوونیی هیچ ناكرێ.

(٣)- شارەزایی: كادیر و بانگخوازی ئیسلام كە بتوانێ خەڵك ڕێكبخات دەبێ شارەزایی باشی هەبێ، زانایی جیایە لە شارەزایی! چونكە ئینسانی وا هەیە لە (وحي) و دەقەكانی قورئان و سوننەت دا سەرڕاستی هەیە و ئاگاداریی و زانیاری هەیە، بەڵام شارەزای واقیعەكەی نیە! نازانێ بە پێی عەقڵی ئەوان قسە بكات، (علیم) واتە زانا، (خبیر) واتە شارەزا، خوای پەروەردگار هەم خۆی بە (علیم) وەسف كردوە كە خوا زانایە، وە هەم خۆی بە (خبیر) وەسف كردوە كە خوا شارەزایە، زانیاریی (علم) پەیوەندی بە شتەكانەوە هەیە و ، شارەزایی پەیوەندی بە ئینسانەكانەوە هەیە، بە حاڵەتە جیاجیاكانیانەوە هەیە.

(٤)- عیبادەت: کەسێك دەتوانێ کە خەڵك بهۆنێتەوە کە (عابد) بێ بۆ خوا، خاوەنی عیبادەتێکی ڕاست و ساغ و بێ خلتە بێ و دوور لـە بیدعـەت و هاوبەش بۆ خوا دانان و دوور لە ڕیا و لە لادان و خلیسکان بێ.

(٥)- تەزکیە: هەروەها دەبێ خاوەنی تەزکیە بێ، ئینسانی مسوڵمان ئەگەر بیەوێ خەڵك ڕێکبخات و بیانهۆنێتەوە دەبێ خاوەنی نەفسێکی تەزکیـە کراو (مُزّکی)بێ.

(٦)- تەقوا: وە دەبێ کادیری ئیسلامیی کەسێکی پارێزکـار (متّقـي)بـێ، خاوەنی تەقوا بێ، تەقواش بەرهەمی تەزکیـەی نەفسـە و لـە ئـەنجامی تەزکیەوە پەیدا دەبێ، چونکە تەزکیە بریتی یە لە خۆ پاککردنەوە و خۆ بژارکردن لە سیفەتی خراپ و خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەت و ڕەوشتە پەسند و چاکەکان، کە لە ئەنجامی ئەوەدا پارێز و تقوا پەیدا دەبێ.

(٧)- متمانە و باوەڕ بە خۆبوون: کادیری ڕێکخستن دەبێ باوەڕ و متمانەی بە خۆ بێ،من وشەی باوەڕ لە جیاتی متمانـە (ثقـة) بـەکار دێـنم چـونکە (إیمان) بە بروا تەرجەمـە دەکـرێ، بـەڵام بـاوەڕ واتـە سـیقە و متمانـە بەخۆبوون لە ئیش و کار دا.

(٨)- پشت بە خوا بەستن: وە دەبێ بابای ئیشکەر بۆ ئیسلام پشت بـە خـوا ببەستێ و پشتی بە خوا قایم بێ، کەسێك کاری ئیسلامیی بۆ دەکرێ کە متمانەی بە خۆ بێ و پشتیشی بە خوای پەروەردگار قـایم بـێ، بـاوەڕ و متمانەی بە خۆ بێ واتە خۆی پێ شایستەی ئەوە بێ کە کار بـۆ ئیسـلام بکات، وای خۆ پەروەدە کردبێ کە قەناعەتی بە خۆی هەبێ و لـە خـۆی ڕاببینێ کە شتێکی لە دەست دێ، چونکە ئەگە وانەبێ هیچی لەدەسـت

نایەت! ئنجا دەبێ پشتی بە خوا قایم بێ و هەر خوا بـە پشـت و پـەنای خۆی بزانێ.

(٩)- دڵسۆزیی: كادیری ڕێكخستن دەبێ دڵسۆز (ناصـح) بـێ بـۆ خـەڵك، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خۆیان بەو سیفەتە پێناسە كردوە: ﴿ أَنَاْ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ (الأعراف ـ١٠٨)، وشـەی (نصـح) جیایـە لـە (موعظة) چـونكە (موعظـة) واتـە ئامۆژگـاری، بـەڵام (نصـح) واتـە دڵسۆزیی، دەبێ تۆ دڵسۆز بی بۆ خەڵك كاتێك كە بانگیان دەكەی بۆ لای خوا، مەبەستت ئەوە بێ كە بەختەوەریان بكەی لە دونیا و دواڕۆژ دا.

(١٠)- ڕەزامەندیی خوا مەبەست بوون: هەروەها كادیری ئیسلامیی دەبـێ تەنها مەبەست(غاية)ت ئەوە بێ كە خوا لە خۆت ڕازی بكەی، مەبەستت خوا بێ نەك خۆت، مەبەستت دین بێ نەك دونیا، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ﴾ (الفتح ـ٢٩).

(١١)- بەزەیی و پەرۆش: هەروەها كادیری ڕێكخستن دەبێ بە بـەزەیی و بـە پەرۆش بێ، دەبێ بەزەیی و پەرۆشمان بەرانبەر بەخەڵكی بمانجووڵێنێ كـە كاریان لەسەر بكەین و بانگیان بكەین بۆ لای خوا، بەزەیی و پـەرۆشمان نەك بوغز و غەرەز و ڕق لێ بوونەوەیامان هانمان بـدات، وە نـەك سـزا و تۆڵە لێ كردنەوەیان!!

(١٢)- پشوو درێژیی: سیفەتێكی دیكەی كادیری ڕێكخستن ئەوەیە كەسێك دەتوانێ خەڵك بهۆنێتەوە و پێكەوە گرێ بدات و ڕێكی بخـات كـە پشـوو درێژ بێ، كول نەبێ، زۆر بە حەوسەلە بێ، هەر كە چوار خەم هاتنە دڵی سەری دونیایەی لێ نەیەتەوە یەك! لەگەڵ دوو ئاسـتەنگی هاتنـە پـێش

دەست لە كراس دەرنەهێنێ و بڵێ تازە تەواو!، ئینسان بەبێ پشوو درێژیی بەبێ ئومێد و هیوا هەبوون كاری بۆ ناكرێ و سەركەوتوو نابێ.

(١٣)- گەشبینی و ئومێدەوار بوون: هەروەها دەبێ هەمیشە گەشبین و ئومێدەوار بێ، دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناخۆشترین و سەختترین كاتی دا هاوەڵانی بەڕێزی چوونەتە خزمەتی و گوتوویانە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەزعمان زۆر خراپەو لە ئێشو ئازارێكی زۆردایـن بە دەست كافرەكانی قوڕەیشەوە، دوعامان بۆ بكە، یەكێك لەو هاوەڵانە (حباب بن الأرت) وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە دەڵێ چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ كە لەو كاتەدا لە سێبەری كەعبە پاڵی دابۆوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعامان بۆ ناكەی داوای یارمەتیمان بۆ ناكەی لە خوا؟ كافرەكان بە جۆرەها شێوە نارەحەتمان دەكەن و سزا و ئازارمان دەدەن؟! دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو ڕەنگی موبارەكی سوور هەڵگەڕا و فەرمووی: ئەوە ئێوە چیتانە؟ ئیماندارانی پێش ئێوە بە مشار لەتیان كردوون و بە شانەی ئاسن گۆشت و ئێسقان و دەماریان لێك جیا كردوونەوە هێشتا لە دین هەڵنەگەڕاونەوە! ئنجا فەرمووی: سوێند بە خوا، خوا ئەم ئیسلامە تەواو دەكات هەتا كاتێك دێ ئافرەتێك بە كەژاوەوە لە فلان شارەوە دەچێ بۆ فلان شارە بێجگە لە خوا لە كەس ناترسێ!!

لەو كاتەدا كە كەس بە تەمای هیچ شتێك نەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا ئومێدەوار بووە، دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ بە نووری وەحی بینیویەتی، بەڵام ئێمەش ئەگەر وەك پێغەمبەری خوا ﷺ نەتوانین وابڵێین بە جەزمی، خۆ دەتوانین بڵێین: خوا لە پشتمانە چ نیە هەورازێكەو نشێوی بە دواوەیە!!

ئینسانی مسوڵمان دەبێ هەمیشە گەشبین و ئومێدەوار بێ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکی دا دەفەرموێ: ((إذا قال الرجل هلك الناس فهو أهلكهُم[1])) واتە: هەر کاتێك پیاوێك بڵێ هەموو خەڵك فەوتا، ئەوە ئەو کەسە خۆی لە هەموویان فەوتاوترە.

برامان هەیە دەڵێ مامۆستا گیان کۆمەڵی ئیسلامیی هەمووی بەسەر مادده گەڕاوە، هەمووی داوای پلە و پایە دەکات، وانیە کاکە! بەڵێ ئەو شەپۆلە مادده گەرایی یە کاریگەریی خۆی لەسەر ئێمەش هەیە، بەلام (الحمد لله) خێریش هەر هەیە، ئنجا ئینسانیش کاری هەر تێ دەکرێ، هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، ئەشکەنجە دراون، کاریان تێکراوە، هەیان بووە دەوڵەمەند بووە و دەوڵەمەندی یەکەی کاری تێکردوە، بە پێچەوانەوە هەژاریی و نەداریی کاری تێکردوون، بەلام کۆڵیان نەداوە، دەبێ ئێمە کۆڵ نەدەین و کول نەبین! ئەگەرنا ئینسان ئەو شێوە ژیان و حاڵ و ژینگە و بارودۆخ و قۆناغانە کە بەسەری دادێن کەم و زۆر کاری تێدەکەن هەم بە باری ئیجابی داو هەم بە باری سەلبی دا.

(١٤)- هێدیی و نەرم و نیانی: سیفەتێکی دیکەی کەسێك کە بیەوێ خەڵك لەسەر دەستی پەروەردە بێ و بهۆنرێتەوە ئەوەیە کە دەبێ نەرم و نیان (حلیم) بێ، قسە ڕەق و دڵ ڕەق نەبێ، خوای شارەزا (عزّ وجلّ) بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴾ (آل عمران ـ١٥٩)،

(١) رواه مسلم عن ابي هرير[redacted] رضي الله عنه برقم: ٢٦٢٣.

واتە: بە هۆی بەزەیی خواوە بۆیان نەرم بووی، ئەگەر قسە ڕەق و دڵ ڕەق بای هاوەڵانی بەڕێزت لێت دەپرژان و بڵاوەیان دەكرد.

(١٥)- خۆبەكەمگرتن و خاكیی بوون: سیفەتێكی دیكە ئەوەیە دەبێ خۆ بە كەمگر (متواضع)بێ و خۆ بەزلگر نەبێ، لەگەڵ چووە سەر كورسی و بەرپرسیاریەتیەكی دەست كەوت وەك كۆیلە تەماشای خوار خۆی نەكات.

پێشتر هەندێك لە برایان سكاڵای خۆیان گەیاندە لای من لەسەر هەندێك لە برا بەرپرسەكان، ئەوە بوو لە كۆنگرەی یەكەمی (كۆمەڵی ئیسلامیی) دا گوتم: هی واتان هەیە پێی خۆشە بۆ سەرەوەی خۆی دیموكراتی بێ، بەڵام لەگەڵ خوار خۆی دیكتاتۆر بێ! بۆ سەرەوەی خۆی هیچ شتێك نەكرێ بە بێ ئاگاداری ئەو، ئەگەر پێویستیش نەكات پرسی پێ بكرێ، بەڵام بۆ خوار خۆی بە پێچەوانەوە، با وا نەبین!!

من نە بڕوام بە دیموكراسی[1] هەیە و نە بە دیكتاتۆریی، بڕوام بەوە هەیەكە بە پێی شەریعەتی خوا بەڕێوە بچین، شەریعەتی خوا ئیجابییەتی هەموو فیكرەكانی تێدایە و دوورە لە سەلبیات و كەم و كوڕی یەكانیان، مەبەستم ئەوەیە ئێمە كە پێمانخۆشە سەرەوەی خۆمانمان لەگەڵمان بە بەزەیی بێ و پرس و ڕاوێژمان پێ بكات و ڕێزمان لێ بگرێ، با خۆشمان وابین، تۆ ئەوەی بۆخۆت پێت خۆشە، بۆ خەڵكیش پێت خۆش بێ، كەواتە: با خۆبەكەمگر بین پێمان وانەبێ ئەگەر ڕەخنەیەكمان لێ گیرا و عەیبێكمان پێشان درا ئەوە دونیا كاوڵ بووە و كەسایەتیمان ڕووشاوە!

(١) واتە وەك فیكرە و بەرنامەی ژیان، بەڵكو وەك ئەو موفرەدانەی كە زیاتر میكانیزمی حوكمڕانیی پێك دێنن و لەگەڵ ئیسلامیش دا ناكۆك نین.

**(١٦)- كارامـەیی و لێزانیـی:** خەسڵەت و سیفەتێكی دیكەی كادیری ڕێكخستن ئەوەیە كە پێویستە كارامە و لێزان بێ، هەوڵبدات بلیمەت و لێهاتوو بێ لە كارەكانی دا، زۆر بە وەستایی و بە دانایی لە كارەكانی خۆی دا هەڵسووڕێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((إن الله يحب إذا عمل أحدكم عملاً أن يتقنه[١])) ، واتە: خوا پێی خۆشە كاتێك یەكێكتان كارێك دەكات بە وردەكاریی و كارامەیی بیكات.

**(١٧)- گوێ بۆ خەڵك گرتن:** هەروەها پێویستە كادیری ئیسلامیی گوێ بگرێ بۆ خەڵك، كەسێكی ڕیش سپی یاخود برایەك، گچكە، گەورە، خوێندەوار، نەخوێندەوار، هەركەسێك قسەیەكت بۆ دەكات دەبێ گوێی بۆ بگری، ئینسان دەبێ زۆر تەحەمولی گوێگرتنی هەبێ، بڕواتان بێ جاری وایە یەكێك دێ من لە خزمەتی دادەنیشم یەك سەعات قسەم بۆ دەكات لە كاتێكدا لەوانەیە بیست تا سی ساڵ بەر لەوە ئەو شتانەم چەندجار بە دەرس گوتبێتەوە، بەڵام گوێشی بۆ دەگرم ئەویش پێی خۆشە گوێی بۆ بگیرێ.

هەرچەندە زۆر جاران ئامۆژگاریی برایانی خۆمان دەكەم و دەڵێم: كاكە وشەی كەم بەكار بێنە و مانایان زۆر بێ! چونكە وەخت كەمە و ئەركمان زۆرە، كەچی برای وا هەیە دێ حیكایەتت بۆ دەگێڕێتەوە! بەڵام بە هەرحاڵ لێپرسراو دەبێ توانای گوێ گرتنی زۆر بێ، گوێی بۆ بگرە با ڕاز و نیازی نێو دڵی خۆی بدركێنێ، زانایانی دەروون ناس دەڵێن جاری وایە كەسێك خەم و پەژارەو كێشەیەكی هەیە تەنیا بەوەی گوێی بۆ دەگیرێ ئەو خەم و

---

(١) اخرجه الطبراني.

ناڕەحەتی یەی لادەچێ، ئەوە هەناسەدان (تنفیس) ێکە و بابای پەژارەدار بە هەڵڕشتنی خەم و خەفەتەکانی تا ڕادەیەك دڵی ئاسوودە دەبێ.

برا هەیە تەحەمولی دوو قسە ناکات، کاکە گوێ بگرە، گوێ بۆ خەڵك هەڵخە، دڵی پێ موڕتاح دەبێ، ڕێزلێگرتنێکە و ڕەنگە زۆرجاریش کە تۆ گوێی بۆ دەگری زۆر ئەزموون(تجارب)ی لێ وەربگری و سوودمەند بی!

تەحەمولی گوێ گرتن زۆر گرنگە بۆ کەسانێك کە بیانەوێ کاری ڕێکخستن بکەن و خەڵك بهۆننەوە و پێکەوەیان گرێ بدەن، پێویستە گوێ بۆ هەست و نەستی خەڵك بگیرێ، گوێ بۆ سکاڵا و گلەیی و ڕەخنەیان بگیرێ، هەڵبەتە دەبێ خەڵکیش بزانێ چۆن گلەیی دەکات و سکاڵا دەخاتە ڕوو، وە چۆن ڕەخنە دەگرێ، پێویستە خەڵکیش ڕەچاوی چۆنیەتی ڕەخنەگرتن و وەختی ئەو کەس و بەرپرسە بکات کە دەچێ قسەی لەگەڵدا دەکات، بەڵام بێگومان دەبێ کادیر و بەرپرسی ڕێکخستن توانای گوێ گرتنی زۆر بێ و قبووڵی ڕەخنە و گلەیی و سکاڵا بکات.

(١٨)- قبووڵ کردنی ڕەخنە: وەك لە خاڵی پێشتریشدا ئاماژەم پێ کرد دەبێ بابای ئیشکەر بۆ ئیسلام قبووڵی ڕەخنەی خەڵك بکات، کێمان هەیە بێ عەیب بێ؟ بێ هەڵەو کەم و کورتی بێ؟ بێگومان هیچ کەس، هەرکەسێك خۆی بەبێ هەڵە زانی ئەوە گەورەترین هەڵەیە!

یانی لەوە زیاتر کە هاوەڵانی بەڕێز (أصحاب) خوا لێ یان ڕازی بێ هەرچەندە زانیویشیانە خوای کاربەجێ پێغەمبەرەکەی ﷺ پاراستوە لە هەڵە و گوناح کردن، بەڵام کەشتێکی کردوە تێبینی یان لەسەری هەبووە، گوتوویانە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە (وحي)یە یان ڕاو بۆچوونی خۆتە؟! واتە ئەگەر (وحي) بێ ئەوە قسەمان نیە خوا لە هەموو

كەس زاناترە، بەڵام ئەگەر ڕاو بۆچوونی خۆت بێ ئەوە قسەمان هەیە – واتە: دەگونجێ لەو ڕا و بۆچوونەت دا نەت پێكابێ، نەك گوناحبار بووبی- ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وا بووە فەرموویەتی: بەڵێ ڕا و بۆچوونی خۆمە، جاری واش بووە كە ڕاو بۆچوونێكی چاكتر لە هی خۆی پێشنیار كرابێ لە لایەن هاوەڵانی یەوە وەری گرتوە، وەك لە (سیرة إبن هشام) لە بەسەرهاتی جەنگی بەدر دا هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێك مەنزڵگای دیاری كردبوو، (الحباب بن المنذر) هەڵسایە سەرپێ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێرە باش نیە فلان شوێنە گونجاوتر و چاكترە! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (( الرأي ما رأيت ))، واتە: ڕەئی ڕەئی تۆیە، ئەوەبوو بە قسەی كرد و گواستیانەوە بۆ ئەو شوێنەی پێشنیاری كردبوو.

(١٩)- بەردەوام لەگەڵ خۆخەریك بوون لە بواری تێگەیشتن و پێگەیشتنی زیاتر و چاكتر دا: سیفەتی كۆتایی ئەوەیە كە بەڕاستی كەسێك دەتوانێ كاری ڕێكخستن بكات و خەڵك بهۆنێتەوە و كاریگەریی بۆ سەر خەڵك هەبێ، كە بەردەوام لەگەڵ خۆی خەریك بێ، پێ بە پێ زیاتر خۆی پەروەردە بكات و خۆی تێبگەیەنێ و خۆی پێبگەیەنێ.

نابێ ئێمە عادەتی هەندێك لە مامۆستا (مەلا)یانمان هەبێ، هەندێكیان پێیان وایە لەگەڵ ئیجازەی عیلمی و مەلایەتی وەرگرت، ئیدی تازە پێویستی بەوە نەماوە زیاتر بخوێنێتەوە و زانیاریی زیاتر وەربگرێ و فێر ببێ!

من لە كتێبی (زانایانی ئیسلام) دا باسم كردوە، جارێك بە مامۆستایەكی بەڕێزم گوت: مامۆستا فلان كتێبە كەوتۆتە بازاڕ،

كتێبێكی باش و بەسوودە بیخوێنیەوە چاكە، گوتی: فلان كەس بە ڕاستی ئەو قسەیەم زۆر پێ ناخۆشە. گوتم: بۆ؟! گوتی: من ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرتوە و چەند ساڵە دەرس دەڵێمەوە و (تدريس) دەكەم، تۆ پێت وایە پێویستم بەوە هەیە كتێبی دیكە بكڕم و بخوێنمەوە؟!

برایان با ئێمە گیرۆدەی ئەو نەخۆشی یە نەبین، ئەوە بیركردنەوەیەكی هەڵەیە پێت وابێ لەبەر ئەوەی كۆلیژ(كلية)ت تەواو كردوە، یان ئیجازەی (مەلایەتی)ت وەرگرتوە، یان تازە بوویە بەرپرسی ناوچە. مەڵبەند، ئەندامی سەركردایەتی، مەكتەبی سیاسی، بوویە پێشەوا و ئەمیری (كۆمەڵی ئیسلامیی). ئیدی لە هەموو شتێك دا تەواوت كردوە! نەخێر، ئەوجارە دەبێ دەست پێ بكەی و زیاتر خەریك بی، هەتا شوێنت بەرزتر و بارت قورستر بێ، پێویستیت بە زانیاریی و شارەزایی زیاتر و بە پارێز و تەقوای زیاتر و عیبادەتی زۆرتر و چاكتر و خوو ڕەوشتی جوانتر دەبێ، پێویستیت بە پەروەردە و تێگەیشتن و پێگەیشتنی زیاتر دەبێ.

تەوەرەی پێنجەم:

## ئامانجی ڕێكخستن چییە ؟!

دەتوانین ئامانجی ڕێكخستن بە كورتی لە دوو خاڵاندا كۆ بكەینەوە:

یەكەم: خەڵك فێری مسوڵمانەتیی و خواپەرستیی كردن چونكە ئامانجی ئێمە پێش ئەوەی سیاسی بێ ئیمانی و رووحی یە، لە میانە (خلال)ی ڕێكخستن دا كادیرێكی ڕێكخستن ئەركی ئەوەیە خەڵك فێری دینداریی و مسوڵمانەتی بكات، پێشێ ئیمان و عەقیدەی تێدەگەیەنێ، ئنجا عیبادەت و ئەخلاق و ئاكار و ڕەفتار و ڕەوشتی بەرز و پەسندیان فێر دەكات، حەڵاڵ و حەرامیان بۆ روون دەكاتەوە، لێیان حاڵی دەكات كە لەگەڵ ماڵ و منداڵ و خێزان چۆن بن، و هەروەها لە كار و كەسابەت دا، لە تێكڕای لایەنەكانی ژیان و گوزەران دا، بەڵێ خەڵك فێرە دینداریی و مسوڵمانەتی كردن ئامانجی بنەڕەتی و بنچینەیی ڕێكخستنی ئێمەیە لەسەر ئاستی تاكەكان.

دووەم: لەسەر ئاستی كۆمەڵ و خەڵك و كۆمەڵگاش ئامانجی ڕێكخستنمان بریتیە لە بناغە دانان و زەمینە هەموار كردن بۆ ئەوەی كۆمەڵگای ئیسلامیی دروست بێ، پاشان لە هەناوی كۆمەڵگای ئیسلامیی دەوڵەت و كیانی ئیسلامیی دروست ببێ، ئەوەیە ئامانجی تاكیی و كۆمەڵی و تایبەتی و گشتیی ڕێكخستن.

كەواتە جاری وایە ئەگەر ئامانجە گشتی و كۆمەڵی یەكەش كە بریتیە لە زەمینە هەموار كردن بۆ بنیات نانی كۆمەڵگای ئیسلامیی كە خەڵكێكی پێشەنگ تێبگەیەنین و بنكەی جەماوەریی دروست بكەین، دوایی بە لێكدان و بە یەكەوە ئاوێتە بوونی ئەو پێشەنگ و بنكە جەماوەری یە كۆمەڵگای ئیسلامیی دروست ببێ و پاشان دەوڵەت و كیانی ئیسلامیی بنیات بنرێ، ئەگەر ئەوەشمان دوور بێ هەمیشە ئامانجەكەی دیكە لەبەر دەستمان دایە و (إن شاء الله) هەر دێتە دی و مسۆگەر دەبێ كە بریتیە لە خەڵك فێری دینداریی و مسوڵمانەتی كردن.

وە لە ڕاستیش دا ئامانجی یەكەم هی دووەمی لێ بەرهەم دێ، چونكە كە زۆرینەی خەڵك فێری دینداریی و مسوڵمانەتی بوو، ئەوەی ئاستێكی بەرزی هەبێ دەبێتە پێشەنگ و سەرقافڵە و ئەوەی دیكەش دەبێتە بنكەی جەماوەریی، لە ئەنجامی ئەوەش دا كۆمەڵگای ئیسلامیی پەیدا دەبێ، پاشان لە هەناوی كۆمەڵگای ئیسلامیی دەوڵەت و كیانی ئیسلامیی دێتە دەرێ.

كەواتە برایانی خۆشەویستم! با بەو شێوەیە كە باسی ڕێكخستنم كرد ئاوا لێی تێبگەین، وە با ڕێكخستنەكانمان بەرەو ئەو ئامانجە ئاڕاستە بكەین كە باسمان كردن.

لە كۆتاییشدا دەڵێم زۆر زۆر سوپاسی برایانی خۆشەویستمان و خوشكانی بەڕێزمان دەكەم كە خۆڕاگر و پشوودرێژ بوو ون لە هەموو قۆناغە سەخت و دژوارەكان دا، كە بێگومان ئێستاش هەر لە سەردەمێكی سەخت و دژوار داین بە تایبەت لە ڕووی بێ بەش كران و مەزلوومیەت لە ڕووی ماددی یەوە.

برا بەڕێزەكانم! پێتان وانەبێ ئێمەش ئاگاداری حاڵ و وەزعی برایان و خوشكانی خۆمان نین، كە لە چ حاڵێكی نەداریی و تەنگ دەستی دان! ئەوەی

ماڵی لە خانووی كرێ دایە ئەوەی بە كرێكاری خۆی دەژیێنێ، ئەوەی قەرزدارە، ئەوەی ئیش و كارێكی دەست ناكەوێ، ئەوەی ماڵ و خێزانی هەڵی دەپێچێ بۆ پێداویستی یە سەرەتایی یەكانی ژیان، بەڵام ناتوانێ بۆیان بكڕێ! ئاگاداری هەموو ئەو حاڵەتانەم.

بەڵام دڵنیا بن ئیسلام بە كەسانێك دێتەوە گۆڕەپانی ژیان، بە كەسانێك دین و بەرنامەی خوا بەرپا دەكرێتەوە: ﴿ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ﴾ (الشورى-١٣)، كە تەحەمولی ئەو سەختی یانە بكەن، بە ڕاستی ئەگەر بە تەما بین چینی خۆشگوزەران و دەوڵەمەند ئیسلامان بۆ سەربخەن، ئیسلام بە تەمای ئەوان هەر لە شوێنی خۆی دەبێ، ئەم دینە هەر لە سەرەتای مێژووەوە خەڵكی كەم دەست و ڕەش و ڕووت و خەڵكی نەدار و چەوساوە بوونەتە ئاڵا بەرزكەرەوەی، ئنجا دوایی ڕێگا بۆ خەڵكی دیكەش تەخت بووە.

ئەگەر ئێمە تەماشای سوورەتەكانی قورئان و بەسەرهاتی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بكەین، دەبینین: شوێنكەوتووانی پێغەمبەران هەمیشە بریتی بوون لە (مستضعفين) واتە: چەوسێندراوان، ئەوانەی چەوسێندراونەوە لە ڕووی سیاسی، ئابووری، كۆمەڵایەتی، یان ئەوانە بوون كە زلە زلەكان پێیان دەگوتن: (أراذلنا) كە كۆی (أرذل)ە واتە: هەرچی و پەرچی و خەڵكی سادە.

برایانی خۆشەویستم! بە خەڵكی سادە و خاكی ئەم دینە هەڵدەستێتەوە، بەو خەڵكە كە ژیان و گوزەرانی سادەیە، خەو و خۆراك و بەرگ و پۆشاكی سادەیە، با پێمان وانەبێ ئەگەر دەوڵەمەند نەبین كاری ئیسلامیی مان پێ ناكرێ! نەخێر، بە خەڵكی وەك ئێمە نەبێ كاری ئیسلامیی ناكرێ ئێمەیەك كە ئامادەین بە سادەیی بژین، لە شوێنی سادە دا نیشتەجێ بین، بەرگی سادە

بپۆشین، خواردنی سادە بخۆین، بە ئێمە و مانان دەكرێ بەیداغی دینی خوا بەرزبكرێتەوە، ئێمە دەتوانین ڕێگە شكێن بین، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە زۆری لەو شێوەیە بوون، ناشلێین خەڵكی هەژار و نەدار نەبێ بە كەڵكی دینی خوا نایە! (أبوبكر صديق ، عثمان بن عفان، عبدالرحمن بن عوف) ئەوانە و غەیری ئەوانەش دەوڵەمەند بوون و بە ماڵ و سامانی خۆیان زۆریان خزمەت بە ئیسلام كردوە، بەڵام زۆربەی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ ڕەش و ڕووتو نەدار و چەوساوەكان بوون.

خوای پەروەردگار لەو كەسانەمان بگێڕێ كە ئاڵا و بەیداخی دینی خۆیان پێ بەرز دەكاتەوە و دەمانكاتە هۆكار بۆ بەیەكەوە پەیوەست كردن و بەیەكەوە هۆنینەوەی مسوڵمانان كە بتوانن ببنە پێشەنگ و هەڵبژاردە و ڕێگەشكێن، خوا لەو كەسانەمان بگێرێ كە شەریعەتی خۆی بەهۆی ئەوانەوە و لەسەر دەستی ئەوان جارێكی دیكە دەكاتەوە سایە و سێبەری ژیانی ئەو خەڵكە و دەیكاتەوە بە درەختێكی پڕ بەرەكەت درەختێكی سێبەر چڕ كە ئەو خەڵكە لە ژێر سایەی دا پشوو بدەن و بحەسێنەوە و سەرفرازی دونیا و دوارۆژ بن.

وصلى الله على محمد وعلى اله وصحبه أجمعين

والحمد لله رب العالمين

# نێــوەڕۆك

٢٢ ربیع الثاني ١٤٢٧

٢٠٠٦/٥/٢٥ هەولێر